ئاخوەند محەمەد ساڵح زەنگەنە بەلوچ

# کوردگاڵ نامەك

"کوردپێژ نامە"

گەنجینە و شاکارێکی بەنرخی مێژووی
دێرینی کورد و بەلوچ

بەرگی یەکەم

وەرگێڕانی:
هێرا محەمەد زەندی



ئاخوەند محەمەد ساڵح زەنگەنە بەلوچ

# کوردگال نامەی

"کوردبێژ نامە"

گەنجینە و شاکارێکی بە نرخی مێژووی دێرینەی کورد و بەلوچ

**بەرگی یەکەم**

وەرگێڕانی:

هیوا محەمەد زەندی



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر - هەرێمی کوردستانی عێراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

ئاخوەند محەمەد ساڵح زەنگەنە بەلوچ
کوردگال نامەک "کوردبێژ نامە" - بەرگی یەکەم
وەرگێڕانی: هیوا محەمەد زەندی
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٢٢١
چاپی یەکەم ٢٠١٢
تیرێژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٩٩ - ٢٠١٢
نەخشاندنی ناوەوە و ڕازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: تریسکە ئەحمەد

# پێڕست

پێشەکیی وەرگێڕ: کوردگال نامەک: گەنجینەیەکی مێژووی کورد و بەلوچ ........ 13
وتاری مامۆستا جەمال نەبەز: کوردگال نامەک ........ 19
پێشەکیی کورتکراوەی ئاغا نەسیر خان ئەحمەد زەیی بەلوچ بۆ کوردگال نامەک ........ 21
پێشەکیی نادر قەمبەرانی بۆ کوردگال نامەک: دۆزینەوەیەکی مێژوویی نوێ ........ 27

بەشی یەکەم
[سەرەتا] ........ 30
باسی قوتابخانەی ئیسلامی ........ 33
باسی کوردە زەنگەنەکان ........ 36
باسی کوردە براخۆییەکان ........ 38
دەوڵەتی ماد ........ 41
شەڕی نێوان ماد و توران ........ 41
سەرۆکە هاوچەرخەکانی کوردی براخۆیی و پاشاکانی ماد ........ 42
ڕووخانی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی کوردە مادەکان ........ 44
بنەماڵەی هەخامەنشییەکان ........ 44
هەڵسوکەوتی هەخامەنشییەکان لەگەڵ کوردە مادەکان ........ 45
سەرۆکە هاوچەرخەکانی تیرەکانی کوردی براخۆیی و پاشاکانی هەخامەنشی ........ 46
ڕووخانی فەرمانڕەوایی هەخامەنشییەکان ........ 48
هاتنی ئەسکەندەری مەقدۆنی ........ 49
پارچەبوونی سەڵتەنەتی ئەسکەندەر ........ 49

بەشی دووەم
میرنشینی کوردە براخۆییەکان لە توران - خولی یەکەم ........ 51
١- میر میران میر «کیکان» ........ 52
٢- میر میران میر «زوراک» ........ 53
٣- میر میران میر «وشتاب» ........ 55

٤- میر میران میر زگرین ..... 56
٥- میر میران میر «زیبار» ..... 58
٦- میر میران میر «براخم» ..... 59
٧- میر میران میر «گۆران» ..... 62
باسی تیره «پارسی»یەکان ..... 64
باسی تیرەی هەخامەنشی ..... 65

بەشی سێیەم

میرنشینی کوردە براخۆییەکان لە توران - خولی دووەم ..... 66
٨- میر میران میر «زرشان» ..... 66
٩- میر میران میر «زوراک»ی دووەم ..... 68
١٠- میر میران میر «ئەرجان» ..... 70
١١- میر میران میر «شاموز» ..... 72
١٢- میر میران میر «براخمی دووەم» ..... 74
١٣- میر میران میر «سابول» ..... 76
١٤- میر میران میر «نورگان» ..... 77
١٥- میر میران میر «کیانوش» ..... 79
١٦- میر میران میر «کیکانی دووەم» ..... 80

بەشی چوارەم

[کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی یۆنانییەکان و هیندییەکاندا] ..... 81
هێرشی یۆنانییەکان بۆ سەر خاکی ماد و فارس ..... 81
دەستپێکردنی شەڕ ..... 81
هاتنی ئەسکەندەر بۆ هیند ..... 82
گەڕانەوەی ئەسکەندەری مەقدۆنی ..... 82
شەڕی کوردەکانی توران و مەکران لەگەڵ سوپای ئەسکەندەر ..... 83
نەخشەدانانی شەڕ ..... 83
شەڕی کوردە بەلوچەکان لە تەنگەی میلا ..... 84
هاتنی ئەسکەندەر بۆ ناو خاکی توران و داگیرکردنی ئەرمابیل ..... 84
شەڕ لە تەنگەی «حوللین» ..... 85
شەڕی «گلگالا» لە ناوچەی «راس کیچان» ..... 85

کاربەدەستانی ئەسکەندەری مەقدۆنی لە توران و مەکران ........ 86
دەستبەکاربوونی «کساندوس» وەکو فەرمانڕەوای توران و مەکران ........ 86
بارودۆخی نەگونجاوی کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران ........ 86
هێرشی سیلوکوس بۆ سەر وڵاتی هیند ........ 87
کوردە بەلوچەکان لەژێر دەسەڵاتی وڵاتی هیند ........ 87
هاتنی تیرە هیندییەکان بۆ ناوچەی توران و مەکران ........ 88
هۆی یارمەتیی کوردەکانی زابلستان ........ 88
شەڕی سەختی «سوهرئابادان» ........ 89
لکاندنی ناوچەی کیکانان بە میرنشینیی زابلستان ........ 89

بەشی پێنجەم

شارستانیی کوردە بەلوچەکان ........ 91
ئاینی کوردە بەلوچەکان ........ 91
چۆنیەتیی دروستکردنی بینای ئارین (پەرستگا) ........ 92
داوونەریتی کوردە بەلوچەکان ........ 92
کشتوکاڵی کوردە بەلوچەکان ........ 94
زمانی کوردە بەلوچەکان ........ 95
ڕێژیمی لەشکریی کوردە بەلوچەکان ........ 96
نوێنەرایەتیی سوپای کوردە بەلوچەکان ........ 97
ڕێژیمی مەدەنیی کوردە بەلوچەکان ........ 98
لادێ و گوند و شارە کوردەکان ........ 98

بەشی شەشەم

[ڕیشەی کوردە بەلوچەکان] ........ 100
ڕیشەی کوردە براخۆییە بەلوچەکان ........ 100
پاشایەتیی بنەماڵەی پیشدادییەکان ........ 105
ڕیشەی کوردە بەلوچەکانی ئەدرەگانی، ماملی و کرمانی ........ 108
پێوەندیی نێوان کوردەکانی توران و مەکران ........ 114

بەشی حەوتەم

[کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی پاشاکانی سیلوکیی یۆنانیدا] ........ 115
پیشدادییەکان ........ 115

تیرەکانی سندان ........ 116
سەرکەوتنی جدگالەکان بەسەر توران و مەکران ........ 117
فەرمانڕەواییی پاشاکانی سیلوکیی یۆنانی لە ماد و پارس ........ 118
میری ولایەتی زابلستان میر برسان زەنگەنە ........ 119
شۆڕشەکانی حاکمەکانی بەنەژاد یۆنانی لە ماد و پارس ........ 120
ڕێژیمی نوێی تیرەکانی کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران ........ 121

بەشی هەشتەم

[کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا] ........ 123
ئەشکانییەکان ........ 123
پێوەندیی نێوان کوردە بەلوچەکان و پاشاکانی ئەشکانی ........ 124
هێرشی ئەنتیوکوسی سێیەم بۆ سەر سەڵتەنەتی ئەشکانی ........ 125
کوردە بەلوچەکان و یارمەتیدانی پاشای ئەشکانی ........ 125
کۆچی دواییی ئەردەوانی یەکەم ........ 126
پاشابوونی پرپاتیوسی ئەشکانی ........ 126
پاشابوونی فەرهادی یەکەمی ئەشکانی ........ 126
پاشابوونی مهردادی یەکەمی ئەشکانی ........ 126
هاتنی کوردە بەلوچەکان بۆ ناو خاکی توران و مەکران ........ 127
شەڕ لە سوهرئابادان ........ 127
شەڕ لە کوهیار ........ 128
ڕیشەی تیرەکانی کوردە بەلوچەکان لە دوورەوڵاتی ........ 128
فەرمانڕەواییی کوردە بەلوچەکان لە توران و مەکران - خولی سێیەم ........ 129
میر میران میر بەهرام براخۆیی ........ 129
میر میران میر شەهداد براخۆیی ........ 133
میر میران میر فیروز براخۆیی ........ 134
میر میران میر مهرداد براخۆیی ........ 135
میر میران میر بەهمەن براخۆیی ........ 140
میر میران میر بسسام براخۆیی ........ 141
میر میران میر خەفی براخۆیی ........ 143
میر میران میر شاوش براخۆیی ........ 147
میر میران میر مرادان براخۆیی ........ 151

میر میران میر شاهبورز براخۆیی ........ 152
میر میران میر سەرگیژ براخۆیی ........ 154
میر میران میر شاهمیر براخۆیی ........ 155
میر میران میر بیغ براخۆیی ........ 159
میر میران میر شاهزور براخۆیی ........ 160

بەشی نۆیەم

[کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی ساسانییەکاندا] ........ 162
ساسانییەکان ........ 162
پاشابوونی ئەردەشێر ........ 162
میر میران میر بوراک براخۆیی ........ 163
هێرشی ئەردەشێر بۆ سەر خاکی هیند ........ 164
پاشابوونی شاهپوری یەکەم ........ 164
مانی و دینەکەی ........ 164
میر میران میر مهران براخۆیی ........ 165
پاشابوونی هورموزی یەکەم ........ 165
هاتنی ئامۆژیارانی مانی بۆ سکستان و توران و مەکران ........ 165
میر میران میر شادان براخۆیی ........ 167
پاشابوونی بەهرامی یەکەم ........ 167
کوژرانی مانی ........ 167
پاشابوونی بەهرامی دووەم ........ 168
گوێڕایەڵکردنی هۆزە ساکایەکان و کوردە بەلوچەکان ........ 168
هاتنی زاوک بۆ دادگەری توران و مەکران ........ 169
پاشابوونی بەهرامی سێیەم ........ 169
پاشابوونی نارسەس ........ 169
شەڕ لەگەڵ ڕۆمەکان ........ 170
پاشابوونی هورموزی دووەم ........ 170
هاتنی ئەرشم بۆ دادگەری توران و مەکران ........ 170
ڕیشەی بنەچەی ساکایەکانی سکستان ........ 171
پاشابوونی شاهپوری دووەم ........ 171
هاتنی مەنوچهر بۆ دادگەری توران و مەکران ........ 172

پاشابوونی ئەردەشێری دووەم ..................... 172
هاتی ئەربەد بۆ دادگەری توران و مەکران ..................... 173
پاشابوونی شاهپوری [سێیەم] ..................... 173
پاشابوونی بەهرامی چوارەم ..................... 173
پاشابوونی یەزد گوردی یەکەم ..................... 173
هاتنی میر کیسون بۆ دادگەری توران و مەکران ..................... 174
پاشابوونی بەهرامی پێنجەم ..................... 174
شەڕ لەگەڵ سەڵتەنەتی ڕۆم ..................... 174
هاتنی میر خیزون بۆ دادگەری توران و مەکران ..................... 175
هاتنە خوارێی هۆزەکانی هیتال ..................... 175
شەڕی هیتال لەگەڵ بەهرامی پێنجەم ..................... 175
پاشابوونی یەزد گوردی دووەم ..................... 176
هاتنی میر کراهون بۆ دادگەری توران و مەکران ..................... 176
پاشابوونی فیروز ..................... 176
هاتنی کرکویی بۆ دادگەری توران و مەکران ..................... 177
پاشابوونی بلاش ..................... 177
هاتنی میر کیارش بۆ دادگەری توران و مەکران ..................... 178
پاشابوونی کبادی یەکەم ..................... 178
سەرکوتکردنی هۆزەکانی خەزەر ..................... 178
هاتنی ئیمام مەزدەک ..................... 178
گفتوگۆی مەزدەک لەگەڵ پێشەوایە زەردەشتییەکان ..................... 179
پاشابوونی تەهماسپ ..................... 179
پاشابوونی کباد - جاری دووەم ..................... 179
هاتنی میر گستم بۆ دادگەری توران و مەکران ..................... 180
پاشابوونی ئەنوشێروان ..................... 180
ڕەشەکوژیی مەزدەکییەکان و مەزدەک ..................... 181
هاتنی میر یەزەن بۆ دادگەری توران و مەکران ..................... 181
لەدایکبوونی پڕ لە شادمانی حەزرەتی محەمەد مستەفا ..................... 181
پاشابوونی هورموزی چوارەم ..................... 182
هاتنی میر ئەرشب بۆ دادگەری توران و مەکران ..................... 183
داگیرکردنەوەی ولایەتەکانی توران و مەکران لە والیی سندان ..................... 183

پاشابوونی خەسرۆ پەروێز ........ 183
شەڕی خەسرۆ پەروێز لەگەڵ ڕۆمەکان ........ 183
نامەی حەزرەتی محەمەد مستەفا بۆ خەسرۆ پەروێز ........ 184
پاشابوونی کبادی دووەم ........ 184
موسڵمانبوونی خەڵکی یەمەن ........ 184
سەرزەویی سندان ........ 185
راسل دیوانچ ........ 185
داڵدەدانی لاساییکەرانی مەزدەک ........ 186
راسل سهارس ........ 186
داگیرکردنی ولایەتەکانی توران و مەکران ........ 186
دامەزراندنی میر لە توران و مەکران ........ 186
سیوا سەمەرا میری توران و مەکران ........ 187
بەشدارکردنی کوردە بەلوچەکان لە هێزی سەربازی ........ 187
راسل سهاسی ........ 189
سیوا جونین میری توران و مەکران ........ 189
راسل سهارسی دووەم ........ 189
پاشابوونی پوران دوخت ........ 190
کۆچی حەزرەتی محەمەد مستەفا پەیامبەری ئیسلام و ماڵئاواییان ........ 190
پاشابوونی ئارزمی دوخت ........ 191
راسل سهاسیی دووەم ........ 191
سیوا ئەسیار میری توران و مەکران ........ 191

بەشی دەیەم

[کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی ئیسلامدا] ........ 192
خیلافەتی میری موسڵمانان ئەبوبەکر (خ) ........ 192
خیلافەتی میری موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب (خ) ........ 192
پاشابوونی یەزد گوردی سێیەم ........ 194
راسل چەچ کوڕی سیلایج ........ 195
شەڕ لەگەڵ رانون مهرتون ........ 195
سیوا ماین میر توران و مەکران ........ 195
هێرشی لەشکری ئیسلام بۆ سەر سەجستان و مەکران ........ 196

گوێڕایەڵبوونی کوردە بەلوچەکان بۆ میری موسڵمانان حەزرەتی عومەری کوڕی ...... 196
خیلافەتی میری موسڵمانان عوسمان کوڕی عەفان ........ 197
شۆڕشی خەڵکی کابلستان و زابلستان ........ 198
هاتنی عەبدوڕەحمان کوڕی سەمەرە بۆ مەکران ........ 198
هاتنی عوبێدوڵڵا کوڕی موعەمەر بۆ مەکران ........ 199
خیلافەتی میری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبی تالیب ........ 199
سیوا زوراک میری توران ........ 199
هاتنی ساغر کوڕی زەعەر بۆ مەکران ........ 200
بەنی ئومەیە ........ 200
دانیشتنی مەعاویە لەسەر تەختی خەلیفایەتی ........ 201
هاتنی عەبدوڵڵا سوار ئەلعەبدی بۆ مەکران ........ 201
هێرش بۆ سەر توران ........ 202
هاتنی سەنان کوڕی سەلەم بۆ مەکران ........ 203
هاتنی ڕاشد کوڕی عەمر بۆ مەکران ........ 203
هاتنی جارێکی تری سەنان کوڕی سەلەمە بۆ مەکران ........ 204
راسل چەندەر برای چەچ ........ 204
هاتنی مەنزەر کوڕی جارود کوڕی بشر بۆ مەکران ........ 205
هاتنی حەکەم کوڕی مەنزەر بۆ مەکران ........ 205
هاتنە سەر تەختی خەلیفایەتیی عەبدولمولک کوڕی مەروان ........ 206
هاتنی سەعید کوڕی ئەسلەم کلابی بۆ مەکران ........ 206
بەرەنگاربوونەوەی [سەعید] لەگەڵ عەلافییەکان ........ 206
هاتنی مەجاعە کوڕی سعەر کوڕی یەزید کوڕی حەزیفە بۆ مەکران ........ 207
خەلیفەبوونی وەلید کوڕی عەبدولمەلیک کوڕی مەروان ........ 207
هاتنی محەمەد کوڕی هارون بۆ مەکران ........ 207
وێنەکان میرانی میرنشینی کوردە بەلوچەکان لە بەلوچستان ........ 209
وێنەی کولتووری ........ 238

# پێشەکیی وەرگێڕ

## "کوردگال نامەک"
## گەنجینەیەکی مێژووی کورد و بەلوچ

بۆ بەرەوپێش چوون و دروستکردنی داهاتووی نەتەوەیەک، مێژوو پێوەندییەکی سەلمێندراوی هەیە کە بە بیرهێنانەوەی ڕووداو و هەڵبەز و دابەز و سەرکەوتن و ڕووخانی ڕابردوو، هەست و جۆشی نەتەوەکە دەبزوێنێ و بۆ هەوڵدانی ژین توانایە داپۆشراوەکان بە بریقە و تایبەتمەندییەکان خەست دەکاتەوە.[1]

مێژووی بەرجەستەی کورد لە کوردستانی هەنووکە و کوردستانی دێرینە (میدیا) دەگەڕێتەوە بۆ چەندین هەزار ساڵ بەر لە ئێستا. لە زۆربەی سەردەمەکانی ماوەی پێنج هەزار ساڵی ڕابردوو، لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی دێرینە بە گشتی و کوردستانی هەنووکە بە تایبەتی، شارستانیی نەتەوەی کورد لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کولتووری و فەرهەنگی و ئاینییەوە، سەرەکیترین یان یەکێ لە سەرەکیترین بنیاتنەری مێژووی ئەم قەڵەمڕەوایەتییە بووە. نموونە بەرجەستەکانی ئەم شارستانییە دێرینەیە وەکو گۆتییەکان، لۆلۆییەکان، عیلامییەکان، هورییەکان، مادەکان، ئەشکانییەکان، ساسانییەکان، شەدادییەکان، ئەیوبییەکان، زەندەکان، براخۆییەکان و میرنشینییەکانی سەدەکانی دوایی ئاشێرەی ئەم ڕاستییە بەڵگەنەویستەن.

شارستانییەکی دێرینە و کاریگەری لەم چەشنە بێگومان دەبێ ئاسەوار و میراتی سیاسی، جوگرافیایی، کولتووری، کۆمەڵایەتی، زانستی، وێژەیی و

١. میر گول خان نەسیر، مێژووی بەلوچستان، بەرگی یەکەم و دووەم، چاپی قەلات پەبلیشەرز، کوێتە، ١٩٩٣، پێشەکیی غەوس بەخش بزنجۆ، لاپەڕە ١.

فەرهەنگی بەجێ هێشتبێ کە نەوەکانی دوایی بتوانن لێیان سوودمەند بن و شانازیی پێوە بکەن.

مێژوو لێرەدا، بە تایبەتی مێژووی نووسراوە، یەکێ لە ئامرازە سەرەکییەکانی تۆماری ئاسەوارەکانی شارستانییە. ئاسەوارەکانی شارستانیی کوردیش بێگومان دەبێ لەم ڕوانگەیەوە شوێن پەنجەی دیاربێ.

لە بواری تۆماری نووسراوی مێژوویی و شارستانیی نەتەوەی کورد، دەتوانین کۆمەڵێک ئاسەواری بەرجەستە ناو بەرین. "ئاوێستا" و "دین کورد" دوو پەڕتووکی گرانبەهای ئاینی بە کوردی نووسراون. "تەنگ گلو" ناسراو بە "شنگول" لە ساڵی ۷۰۰ پێش زاین پەڕتووکێکی لەمەڕ دین و ئەستێرەناسی بە کوردی نووسی. "ئاریاتە" پزیشکێکی بەناوبانگی کورد لە ساڵی ٦٦٨ی پێش زاین پەڕتووکێکی لەمەڕ زانستی پزیشکی بە ڕێنووسی کوردی نووسی. ئەو پەڕتووکانەی تەنیا بەر لە زاینی مەسیح و ئیسلامدا نووسراون دەتوانین ناوی ئاوێستا، دین کورد، بەندهسەن، داتستان دینیک، ئارتای ویرافنامە، کارنامەی ئەردەشێری بابکان، پاتکار (یادگاری زریران)، داتستان ریدک، خەسرۆ گواتان و خوتای نامە ناو بەرین[2]. جێی سەرسوڕمانە جگە لە تاکوتوکێک، ئەمانە و ئاسەوارە نووسراوەکانی تر بە گشتی لەناوچوونە یان لە بەردەستدا نین.

هەر بۆیە، لەم بەستێنەدا، دۆزینەوەی پەڕتووکی "کوردگال نامەک" کە لە ساڵی ١٦٥٩ زاینی لەلایەن کوردێکی زمنگەنەی بەلوچ نووسراوە گەنجینە و شاکارێکی مێژوویی بە نرخە و کەلێنێکی گەورە لە مێژووی کورد و بەلوچدا پڕ دەکاتەوە.

## گرینگیی کوردگال نامەک

کوردگال نامەک جگە لە تیشک خستنە سەر پەیدابوونی نەتەوەی کورد لە کوردستان و دروستبوونی دەوڵەتی میدیا، بە درێژی باسی بەلوچەکان دەکات کە بە ڕەسەن کوردن و بنەچەیان دەچێتەوە سەر کوردە مادەکان و پاشان چۆن چۆنی لە کوردە مادەکان دابڕان.

کوردگال نامەک باس دەکات کە کاتێک کەیقوباد پاشای مەزنی کوردە مادەکان

٢. فەرهەنگی بابان، شوکروڵڵای بابان، ١٣٦١ کۆچی، لاپەڕە ٧-٨.

بناخەی دەوڵەتی کوردیی مادی لە ساڵی ٨٥٣ پێش زاین دامەزراند و پاشان لەگەڵ ئەفراسیابی پاشای توران کەوتە شەڕ، کوردە بەلوچەکان لە پشتگیریی کەیقوباد دژی ئەفراسیاب جەنگان. پاش شکستدانی ئەفراسیاب و داگیرکردنی ناوچەکانی سەڵتەنەتی توران، کەیقوباد کوردە بەلوچەکانی لە ناوچە داگیرکراوەکان واتە بەلوچستانی ئەم سەردەمە کە دەکەوتە ڕۆهەڵاتی سەڵتەنەتی ماد نیشتەجێ کرد.

کوردە بەلوچەکان کە سەرەتا بە کوردی ماد و لەگەڵ ڕەوتی سەردەم بە بەلوچ و براهوی (براخۆیی) ناسران نەگەڕانەوە زێدی باپیرانیان لە کوردستانی دێرین (میدیا) و لە ناوچەکانی بەلوچستانی ئەم سەردەمەدا نیشتەجێ بوون.

کوردگال نامەک بە درێژی تیشک دەخاتە سەر ڕیشەی کوردە بەلوچەکان و لە نشینگە نوێیەکەیان باسی مێژووی سیاسی، کۆمەڵایەتی، زمان، ئاین، داوونەریت، ڕێکخستنی سەربازی، شێوازی هۆزایەتی و پیشەیان دەکات. باسی پێوەندی و هەڵوێستی کوردە بەلوچەکان لەگەڵ فەرمانڕەواکانی سەردەمە جیاجیاکانی مادەکان، هەخامەنشییەکان، یۆنانییەکان، ئەشکانییەکان، ساسانییەکان، هیندییەکان و ئیسلامییەکان دەکات.

ئەگەرچی هاونەژادی کورد و بەلوچ لە سەرچاوەکانی کۆنی گەڕۆکە ئیسلامییەکان لە سەدەی دەیەم و یازدەمی زاینی ئاماژەی پێ کراوە و لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا کۆمەڵێ توێژەری بیانی و خۆماڵیی بەلوچ لە پەڕاو و توێژینەوەکانیاندا ئاشێرەیان بە هاونەژادی کورد و بەلوچ کردووە، کوردگال نامەک یەکەم سەرچاوەی باوەڕ پێکراوی مێژوویییە کە بە تێروتەسەلی لەسەر ئەم بابەتە مێژوویییە دواوە و چۆنیەتیی دابڕانی کوردە بەلوچەکان لە کوردە مادەکان ڕوون دەکاتەوە.

لە بواری کوردناسیدا ئەم هەواڵ و باسە مێژوویییانە نادیار بوون و لە نووسراوە مێژوویییە کوردییەکان ئاماژەیان پێ نەکرابوو. بۆیە ئێمە چۆن سوپاسمەندی شەرەفخانی بەتلیسین لە نووسینەوەی شەرەفنامە و پاراستنی مێژووی نەتەوەی کورد؛ بە هەمان چەشن دەبێ سوپاسمەندی ئاخوەند محەمەد ساڵح بین لە نووسینەوەی کوردگال نامەک و پاراستنی مێژووی کورد و بەلوچ.

### دۆزینەوەی کوردگال نامەک

پەڕتووکی کوردگال نامەک پاش ئەوەی دێتە بەرهەم، لەناو بەلوچەکاندا پشت بە پشت پارێزراوە. مێژوونووسی بەلوچ ماموستا میر نەسیرخان ئەحمەد زەییی بەلوچ لە ساڵی ۱۹٤۳ کاتێک لەسەر پلەی میریی جێگری باجگر لە حکوومەتی قەڵاتی بەلوچستان لە شارۆکەی سۆراب کاری دەکرد لەلای قازی عەبدولحەمید ناسراو بە قازی غەوس بەخش بۆ یەکەم جار چاوی بە دەستنووسی کوردگال نامەک دەکەوێت. بە هۆی گرینگیی دەستنووسەکە میر نەسیرخان داوا لە قازی دەکات کە دەستنووسەکەی پێ بدات بەڵام بێ سوود بووە و لەو زەمانەش ئامێری فۆتۆکۆپی نەبووە، بۆیە ناچار دەستنووسێکی تری لەسەر نووسیوەتەوە.

میر نەسیرخان پاشان لێکۆڵینەوە لەسەر کوردگال نامەک ئەنجام دەدات و بەرەنجامی لێکۆڵینەوەکەی لە دوو توێی پەڕتووکێکی بە نرخی مێژوویی هەشت بەرگی بە ناوی "مێژووی بەلوچ و بەلوچستان" چڕ دەکاتەوە. یەکەم بەرگی ئەم پەڕتووکە لە ساڵی ۱۹۸۸ لە کوێتە پایەتەختی بەلوچستانی پاکستان بڵاو دەکاتەوە. منیش ئەوە بوو بەرگی یەکەمی ئەم پەڕتووکەم وەرگێڕایە کوردی و لەگەڵ کورتە لێکۆڵینەوەیەکی خۆمدا لەسەر هاونەژادی کورد و بەلوچ لە ساڵی ۲۰۰٥ لە ڕێگەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس لە هەولێر بڵاو کردەوە.

میر نەسیرخان پاشان تێکستە فارسییەکەی کوردگال نامەکی بۆ یەکەم جار لە ساڵی ۱۹۹۱ بە یارمەتیی "بەلوچی ئەکادمی" لە کوێتە بڵاو کردەوە. پاش بڵاوبوونەوەی کوردگال نامەک، پرۆفیسۆر عەبدوڵڵا جان جەمالەدینی و پرۆفیسۆر نادر کەمبەرانی کوردگال نامەکیان وەرگێڕایە سەر ئوردو و لە ساڵی ۱۹۹٤ لەلایەن بەلوچی ئەکادمی بڵاو کرایەوە.

### نووسەری کوردگال نامەک ئاخوەند محەمەد ساڵح زەنگەنە

ئاخوەند محەمەد ساڵح زەنگەنە پەڕتووکی کوردگال نامەکی لە ساڵی ۱۰۷۰ کۆچی بەرامبەر بە ۱٦٥۹-۱٦٦۰ی زاینیدا نووسی. هەروەکو ئاخوەند لە سەرەتای پەڕتووکەکەی لە باسی قوتابخانەی ئیسلامیدا ئاماژەی پێ دەکات، پەڕتووکی کوردگال نامەکی بە یارمەتیی چەندین سەرچاوەی مێژوویی نووسیوە کە لە

کتێبخانەی قوتابخانە ئیسلامییەکەی بنەماڵەکەیان لە "زەرەنج"ی پایەتەختی "زابلستان" (سیستان) پارێزرابوون و لە تاڵان و بڕۆی تەیموور لەنگ ڕزگار کرابوون. تەیموور لەنگ لە ساڵی ١٣٨٣ زاینی هێرشی هێنابووە سەر زەرەنج و داگیری کردبوو.

ئاخوەند لە ساڵی ١٦٥٩ز لە دەرباری میرنشینی براخۆییەکان لە "قەلات"ی پایەتەختی بەلوچستان لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەلتازی دووەم وەکو کاربەدەستی میری دەستبەکار دەبێ. پاشان بە پلەی وەزیری گەورە بەرز دەکرێتەوە و لەسەر ئەم پلەیە بۆ پێنج فەرمانڕەوای بەلوچ کار دەکات.

ئاخوەند مرۆڤێکی بە هەڵوێست و کردار و دڵسۆز بووە و فەرمانڕەواکانی بەلوچ ڕێزی گەورەیان لێ ناوە. دەگێڕنەوە لە سەردەمی فەرمانڕەوای قەلات "سەمەندەر بڕۆهی" دوو برا لە دەسەڵاتداریەتی کەڵهوڕەکانی سند لەلای سەمەندەر بڕۆهی دەستبەسەر دەبن و سەمەندەر بڕۆهی فەرمانی کوشتنیان دەدا. لەو کاتەدا ئاخوەند وەزیری سەمەندەر بڕۆهی دەستار (مێزەر، جەمەدانی)ی سەری خۆی دەهێنێتە خوارێ و دەیکاتە سەر دوو برا دەستبەسەرکراوەکە بۆ ئەوەی سەمەندەر بڕۆهی لە گیانیان ببوورێ. لە هەمان کات ئاخوەند بە سەمەندەر بڕۆهی دەڵێ کوشتنی گرتوو بۆ پاشا جوان نییە و ئەگەر تۆ ئەم سزایەیان بدەی ئەوا لەکەیەکی ناحەز دەچێتە سەر ڕووی حکوومەتی بەلوچەکان. سەمەندەر بڕۆهیش کە ڕێزێکی زۆری بۆ ئاخوەند هەبوو بە قسەی دەکا و فەرمانی کوشتنەکەیان دەکێشێتەوە.[٣]

ئاخوەند مرۆڤێکی نەترس و بە ئەمەکیش بووە و لەلای فەرمانڕەوا بەلوچەکان جێی باوەڕێکی زۆر بووە. دەگێڕنەوە لە شەڕی عەبدوڵڵا خانی میری قەلاتی بەلوچستان لە بەرامبەر کەلهوڕەکان لە شەڕی خانپوردا خۆی بە دەستەمۆیی دەبینێتەوە بە هۆی کەمبوونی لەشکرەکەی لە ئاست بە لەشکری دوژمن و دوودڵ دەبێ لە سەرکەوتن. بۆیە ئەو کات کە ئاخوەند محەمەد ساڵحی لەگەڵ دەبێ فەرمانی پێ دەدات کە دەبێ کوڕە بچووکەکانی ئەو لەگەڵ خۆی ببات و بڕوات بۆ ئەوەی کوڕەکان بپارێزرێن و ببن بە حاکم و فەرمانڕەوایی بەلوچەکان بەردەوام

---

٣. تاریخ سندە، بەرگی شەشەم، سەردەمی کەلهوڕە، بەشی دووەم، غلام رسول "مهر"، بۆردی ئەدەبی سندهی، کەراچی، چاپی یەکەم، ١٩٥٨، لاپەڕە ٣٦٠- ٣٦٣.

بێت و وڵاتەکەیان لە دەست دەرنەچێت. بەڵام ئاخوەند وەڵامی دەداتەوە و پێی دەڵێ من لە هاوکاریکردنی گەورەی خۆم (عەبدوڵلا خان)دا گیان فیداکردنم لا جوانە و نارۆم. بەڵام لەو کاتەدا، عەبدوڵلا خان و سەردارەکانی تر پێی دەڵێن ئەگەر بێتو محەبەت خانی کوڕی عەبدوڵلا خان نەبات و نەیکات بە حاکم ئەوا دەسەڵات لە دەست ئەحمەد زەییە بەلوچەکاندا نامێنێ. ئاخوەند ناچار دەبێ کوڕەکەی ببات و لەسەر تەختی قەڵات دای بنێ. عەبدوڵلا خان خۆی لە شەڕەکەدا شەهید دەبێ.[4]

لە کۆتایی، هیواخوازم وەرگێڕانی کوردگال نامەک ببێتە هۆی لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی زیاتر لەسەر پێوەندیی هاونەژادیی کورد و بەلوچ و وشیاریی نەتەوەیی و مێژوویی زیاتر لە نێوان کورد و بەلوچ.

لێرەدا پێویستە سوپاسی شاعیرە و مامۆستای ئەفغانیی بەڕێز نەسیبە ئەکرەم بکەم کە یارمەتیدەرم بوو لە ڕوونکردنەوەی چەندین وشەی ناو دەقە فارسییەکەی کوردگال نامەک، هەروەها سوپاس و پێزانینی بەڕێز کاک بەدران ئەحمەد حەبیبیش بکەم. کە بەگەرمی بەدەنگ داواکەم بۆ بڵاوکردنەوەی کوردگال نامەک هات. ئێستا سەرقاڵی خوێندنی ماستەر لە یاسام لە زانکۆی کوینزلاند.

هیوا محەمەد زەندی

بریزبن، ئوسترالیا - ٢٠١١/٧/١

hiwa_zandi@hotmail.com

---

٤. تاریخ سندە، بەرگی شەشەم، سەردەمی کەلهوڕە، بەشی دووەم، غلام رسول "مهر"، بۆردی ئەدەبی سندهی، کەراچی، چاپی یەکەم، ١٩٥٨، لاپەڕە ٣٩٥- ٣٩٦.

## کورتکراوەی وتاری مامۆستا جەمال نەبەز لەمەڕ کوردگال نامەک

### کوردگال نامەک
### دۆزینەوەی دەستنووسی سەرچاوەیەکی زۆر گرینگ
### بۆ مێژووی کورد و بەلوچستان

چوارسەد ساڵ لەمەوبەر شەرەفخانی بەتلیسی لە نووسینەوەی "شەرەفنامە" بووەوە و، بەوە بەرهەمێکی گرینگی لەمەڕ مێژووی نەتەوەی کورد پێشکێش بە جیهان کرد. جا ئەگەر "شەرەفنامە" بە سەرچاوەیەکی زۆر گرەنتی دیرۆکی ناسرابێ، ئەوا بێگومان گرینگی "کوردگال نامەک" لە "شەرەفنامە" کەمتر نییە. دەستنووسی "کوردگال نامەک" (کوردگال نامە) لەم ساڵانەی دواییدا لە بەلوچستانی پاکستان دۆزراوەتەوە. نووسینەکەی ئاخوەند محەمەد ساڵح زەنگەنەی کوردی بەلوچ بووە. لە ساڵی ١٠٧٠ی کۆچی واتە "١٦٥٩ – ١٦٦٠ز" نووسراوە.

بەپێی ئەم مێژوونووسە، بنەچە و ڕەچەڵەکی بەلوچەکان کوردە. نووسەر باسی خزمایەتیی خۆی لەگەڵ هۆزی براخۆیی کورد دەکا و هۆزی زەنگەنەش بە بەشێک دادەنێ لە هۆزی بودی. هەردوو هۆزەکەش بە نەوەی دوو کوڕی بود دادەنێ "[براخم] و زەنگان" و دەبێژێ بود حەوتەمین کوڕی میری مادی کورد بووە.

ئاخوەند محەمەد ساڵح زەنگەنە بە دوور و درێژی باسی هۆزە کوردەکانی بەلوچستان دەکا بوو دەبێژێ، کە بەلوچەکان کورد بوون و، لە کوردستانەوە چوونەتە بەلوچستانی کۆن کە ئەو دەمە ناوی "تۆران و مەکران" بووە و، لەوێ نیشتەجێ بوون. ئەمەش لە ساڵی [٨٥٣] ی پێش زایندا بووە. هەروەها دەبێژێ: کاتێ سەرۆکی کوردی ماد کەیقوباد ئیمپراتۆریەتیی خۆی لە وڵاتی میدیا و پارسدا دامەزراندووە و بەسەر ئەفراسیاوی پاشای دەوڵەتی "تۆران"دا زاڵ بووە.

ئەوجا کەیقوباد پەلاماری بەڵخی داوە و، کوردی براخۆیی و ئەدرەگانی هەرێمی توران و مەکرانیان گرتووە. دوایی ناوی ئەو هەرێمانە بووە بە بەلوچستان و خەڵکەکەش بە بەلوچ ناو نراون.

ئاغا نەسیرخان ئەحمەد زەیی بەلوچ، کۆنە وەزیری حکوومەتی بەلوچستانی پاکستان لەم دواییەدا پێشەکییەکی نووسیوە بۆ ئەم بەرهەمە بە نرخە و، باسی ئەوەشی کردووە کە "کوردگال نامەک" ڕۆشناییەکی بەهێزی ئاراستەی مێژووی بەلوچستان کردووە و بووەتە هۆی ڕەواندنەوەی ئەو تەمومژ و لە مێژووی براخۆیی و بەلوچستانەوە بلاو کردوونەتەوە Denys Bray گومانانەی کە ڕۆهەلاتناسی بەریتانیایی نەسیرخان مامۆستای زمان و فەرهەنگی بەلوچستانە لە زانستگەی بەلوچستانی پاکستان. شایانی باسە کە هەر ئەم نووسەرە، نەسیرخان ئەحمەد زەیی بەلوچ، پەرتووکێکی بە نرخی بە ناوی "مێژووی بەلوچ و بەلوچستان"ەوە بە زمانی ئۆردوو نووسیوەتەوە و لەبەر ڕۆشنایی "کوردگال نامەک" و "مێژووی کورد و کوردستان"ی مامۆستا مەردۆخی کوردستانی لە بەلوچ و وڵاتی بەلوچستان دواوە. ئەم پەرتووکە لەلایەن قوتابییەکی کوردی قوتابخانەی نێوەندی ڕاوەڵپەندیی پاکستانەوە کە ناوی هیوا محەمەد زەندە کراوە بە کوردییەکی زۆر جوان و ڕەوان. بەڕێز هیوا زەندی وەرگێڕانەکەی خۆی ناردووە بۆم بۆ چاو پێداخشێندنەوە، کە بەڕاستی پێویستی بە دەستکاری نییە. منیش ئەوە بوو لە کاتی کۆنفرانسی شەرەفنامەدا کە لە ١-٢/٥/١٩٩٨ لە بەرلین بەسترا، باسی ئەم وەرگێڕانە کوردییە و "کوردگال نامەک"م کرد... هەروەها سوپاسی هیوا محەمەد زەند دەکەم بۆ ئەو خزمەتە گەورەیەی کردوویەتی، هیوام وایە هەوڵ و تێکۆشانی ڕۆشنبیرانەی کورد سەرکەوتوو بێ لە پێناوی خزمەتی مێژوو و کولتووری نەتەوەی کورددا.

جەمال نەبەز
مانگنامەی سەکۆ
ژمارە ٢٠، حوزەیرانی ١٩٩٨

## پێشەکیی کورتکراوەی

## ئاغا نەسیرخان ئەحمەد زەیی بەلوچ بۆ کوردگال نامەک

کوردگال نامەک پەڕتووکێکی مێژووییە کە ئاخوەند محەمەد ساڵح کوردی زەنگەنەی بەلوچ بە زمانی فارسی لە ساڵی ١٠٧٠ کۆچی بەرامبەر ١٦٥٩ زاینی نووسیویەتی. ناوبراو لە بەشی یەکەمی پەڕتووکەکەیدا باسی بنەچەی خۆی دەکا کە لە تیرەی کوردە زەنگەنەکانە و زەنگەنەش تیرەیەکە لە هۆزی "بودی". هەروەها، خزمایەتیی خۆی لەگەڵ کوردە براخۆییەکان نیشان داوە کە ئەم دوو تیرەیە نەوەی دوو کوڕی "بود"، "براخم" و "زەنگان"ن. بود خۆی حەوتەم کوڕی میر ماد کوردە.

ئەم پەڕتووکە باسی مێژووی بەلوچەکان دەکات کە لە ڕووی نەژادەوە کوردن، بەڵام لە دوایی دا بە هۆی نیشانی سەربازییان کە "پۆپیتەی کەڵەباب" بوو و لە زمانی فارسیی کۆن و کوردی "بەلوچ"ی پێ دەڵێن بە "بەلوچ" ناسران.

بەپێی کوردگال نامەک، کوردە بەلوچەکان لە ساڵی ٨٥٣ی پێش زاین هاتنە ناو خاکی بەلوچستانی کۆن، "توران" و "مەکران". ئەوەش لە کاتێکدا کە کەیقوباد میری مادە کوردەکان لە ماد و فارس بناخەی سەڵتەنەتی خۆی دامەزراند و ئەفراسیاو پاشای سەڵتەنەتی تورانی شکاند.

سەڵتەنەتی توران لەم پێنج ناوچەیە پێک هاتبوو: سوغدستان (سەرزەوییەکانی ناوەڕاستی ئاسیا: ئوزبەکستان، تاجیکستان، کەرغیزستان و تورکمانستان)، کابلستان، زابلستان (ئەفغانستانی ئێستا) و توران و مەکران (بەلوچستانی ئێستا).

کاتێک کەیقوباد پاشا لە باکورەوە هێرشی هێنایە سەر "بەلخ"، پایەتەختی سەڵتەنەتی توران، سەربازانی کوردە بەلوچە "براخۆیی" و "ئەدرەگانی"یەکان لەژێر فەرمانی ئەو هێرشیان بردە سەر توران (بەرزاییەکانی قەلات) و مەکران و ئەم ناوچانەیان داگیر کرد. پاش داگیرکردنی ناوچەکانی سەڵتەنەتی توران، کەیقوباد

پاشـای کوردی مـاد ناوچه جـۆرەوجـۆرە داگیـرکـراوەکـانی لە نێـوان دەسـتـە هۆزایەتییـەکـاندا دابەش کرد. بەم چەشنە، کوردە براخۆییـیـەکان ناوچەی توران (بەرزاییـیـەکـانی قـەلات)یان بەرکـەوت و کـوردە ئەدرەگـانیـیـەکـانیش نـاوچەی مەکرانیان بەرکەوت. ئەم دەستە هۆزایەتییانە لە ناوچە بەخشراوەکانیان بۆ هەموو کات نیشتەجێ بوون و لەو کاتەدا کوردە زەنگەنەکـانیش زابلسـتـان (ئەفغانسـتـانی ئێستا)یان داگیر کرد و کردیان بە نشینگەی هەتاهەتاییان.

باپیـرانـی نووسـەری کـوردگـال نامـەک فـەرمـانڕەوای زابلسـتـان بـوونە و پاش دەرکەوتنی ئیسلام باپیرەیەکی شکۆداری لە سەردەمی دەسەلاتداریی خەلیفەکانی بەنی عەباس لە "زەرەنج" پایەتەختی زابلسـتان قـوتابخـانەیەکی ئاینیی دامـەزراند. ئەم قـوتابخـانەیە دوای ڕووخـانی سـەردەمی فـەرمـانڕەواییی خـەلیـفـەکـانی بەنی عـەبـاس و لەگـەڵ گـەشـەسـەندنی هـێـزی مـەنگـۆلەکـان بە تایبـەت لە شـەڕ و داگیـرکـارییەکانی مـیـر تەیموور گورکان لە سـاڵی ١٣٨٣ی زاینی خـاپوور کـرا. لە ئەنجـامی ئەم کـارەسـاتانـە، گـەرچی بنـەمـاڵەی نووسـەر لە دەسـەلات کـەوتن بـەلام ئەندامـانی بنەماڵەکە دەستیان لە پیشە زانستییەکەیان هەڵنەگرت. بۆیە نـووسەر لەگەڵ چەند قـوتابی هاوڕێی بە مـەبەستی بـەدەسـتـهێنانی خـوێندنـی بـالا دەچێتە شیراز و پاش تەواوکردنی خوێندنەکەی هاتەوە "زابل"، نشینگەی باپیرانی.

لەو سـەردەمـەدا، تیـرەی "مـیـروانی"ی بەلوچ لە ناوچەی توران (بەرزاییـیـەکـانی قەلات) لە سـاڵی ١٤١٠ی زاینی بە سەرۆکایەتیی میر "مـیرو" میروانی میری مەزنی کوردە بەلوچەکان فـەرمانڕەواییـی چوارەمی بەلوچەکـانیـان پێک هێنابوو. لە کـاتی نووسـینی پەڕتووکـەکەی ئاخـوەند مـحـەمـەد سـاڵحدا، ئەم حکوومـەتـەی بەلوچ بە ڕێبـەرایەتیـی مـیـر ئەحـمـەدی مـەزن (١٦٦٦ – ١٦٩٥) زاینی کە پازدەم جـێنشـینی میر میرو میروانی بوو گەیشتبووە ئەوپەڕی سـەرکەوتن.

ئاخـوەند مـحـەمـەد سـاڵح کـوردی بەلوچ بوو و هەر بـەم بۆنەیەوەش هاتە قـەلات پایەتەختی بەلوچسـتـان و لە سـاڵی ١٦٥٩ی زاینی لە دەرباری قـەلات دامـەزرا و بوو بە کارمەندی مـیـر "ئەلتازی دووەم" باوکی ئەحمـەدی مەزن. ئاخوەند مـحـەمەد سـاڵح جگە لەوەی زانایەکی پایەبەرز بوو، خاوەن کـەسـایەتییـەکی وردەکـاریی گـەورە و بە تەگبـیـر و سـیـاسـەتوان بوو. دوای چـەند سـاڵ کـارکـردن، ئەحـمـەدی گـەورە لەسـەر

پلەی وەزیری باڵای دامەزراند. لەم ئەزموونەدا، ڕاژەکاریی پێنج فەرمانڕەوای کوردە براخۆییە بەلوچەکانی کرد کە ناوەکانیان بەم چەشنەیە: ئەحمەدی گەورە، مهراب سەرمچار، سەمەندەر سەخی، ئەحمەد پارسا و عەبدوڵڵا وەقاب کوهی. ئاخوەند محەمەد ساڵح پاشان بە بێ کوڕ کۆچی دوایی کرد لەبەر ئەوە ئامۆزاکەی، ئاخوەند محەمەد حەیات کوڕی ئاخوەند شەهداد بوو بەجێنشینی.

ئاخوەند محەمەد ساڵح بەسەرهاتی مێژوویی گرینگ و جێگەی ڕێزی کوردە بەلوچەکانی بەلوچستانی کۆنی خستووەتە بەرباس کە دەربارەی تا ئێستا کەس ئاگەدار نەبوو و لە تاریکایی مێژوودا ون بوو.

هەر بۆیە، لە دنیای مێژوودا، دۆزینەوەی دەستنووسی کوردگال نامەک لە ڕاستیدا بایەخێکی تایبەتی هەیە.

ئەگەر دەستنووسی کتێبەکە نەدۆزرابایەتەوە ئەوا زۆرێک لە ڕاستەقینە مێژووییەکانی بەلوچستانمان لێ شاراوە دەبوو. زۆر ڕووداوی مێژوویی کە ئاخوەند محەمەد ساڵح لە پەرتووکەکەیدا باسی کردووە زۆر سەرنج ڕاکێشن و پاش خۆی توێژەرانی مێژوویی دنیای نوێ پشتڕاستیان کردووەتەوە. نموونەی ئەم پشتڕاستکردنەوانە لە خوارەوە بەم چەشنەیە:

یەکەم:

ئاخوەند بە درێژە باسی ڕووداوی شەڕەکانی بەلوچەکان لەگەڵ سەربازەکانی ئەسکەندەری مەزن دەکات کە کاتێک بەرەو نیشتمانەکەی دەگەڕایەوە و لە خوارووی بەلوچستانەوە تێپەڕ دەبوو. کاتێک ئینگلیزەکان بەلوچستانیان داگیر کرد و ئەفسەرە سیاسییەکانیان لەمەڕ پارێزگاکانی بەلوچستان فەرهەنگۆکی جوگرافییان نووسی. لەم نێوانە، نووسەری فەرهەنگۆکی جوگرافی "لەسبێلە" ئێم. ئار. هیوز بولەر ئای. سی. ئێس. لە بەشی مێژوودا بابەتی ئاخوەند محەمەد ساڵح لەبارەی شەڕی بەلوچەکانەوە لەگەڵ سەربازەکانی ئەسکەندەری مەزن پشتڕاست دەکاتەوە.

درێژەی باسی فەرهەنگۆکە جوگرافییەکە بەم چەشنەیە: " لێرە "نەرچس" سەربازگەی دامەزراند و هەر لەم بەشەی وڵاتەکەدا "لیوناتوس" توانی "ئوریتی"یەکان و هاوکارەکانیان لە شەڕێکی گەورەدا شکست بدات کە تێیدا

شەش هەزار کەسی هۆزایەتییەکان کوژران. دوای ئەم سەرکەوتنە، ئەسکەندەری مەزن لێرە نەریتی تاجی زێر لەسەرنانی لیوناتوسی بەڕێوە برد". فەرهەنگۆکی جوگرافی لەسبێلە، لاپەڕە ٢١٩.

هەردوو گێڕەوەکە تەنیا لەسەر یەک خاڵ یەک ناگرنەوە کە ئەویش ژمارەی هۆزایەتییە کوژراوەکانی مەیدانی شەڕە. بەپێی ئاخوەند محەمەد ساڵح لەم شەڕەدا دە هەزار شەڕوانی کوردی بەلوچ کوژران، بەڵام مێژوونووسەکانی ئەسکەندەر ژمارەی کوژراوەکانی هۆزە ئۆریتییەکان بە شەش هەزار دەگێڕنەوە.

دووەم:

لە دەستنووسە مێژووییەکەی ئاخوەند محەمەد ساڵح باسی ڕیشەی میرەکانی هەشت تیرەی کوردە براخۆییە بەلوچەکان: کیکانی، گۆرانی، سارونی، غوزداری، مشکانی، ئەرمیلی، بۆلانی و گریشکانی کراوە. لە ناوچەی توران (بەرزاییەکانی قەڵات)دا ئێستاش چیا و لووتکە و دۆڵ و ڕووبار و گوند و شاری وا هەن کە هەر بەو ناوانەوە دەناسرێن کە لە ڕیشەی میرەکاندا باس کراوە. هەر بەم چەشنە، لە ناوچەی مەکرانیش چیا و لووتکە و دۆڵ و ڕووبار و گوند و شاری وا هەن کە تا ئێستاش بەو ناوانەوە دەناسرێن کە لە ڕیشەی میرە کوردە بەلوچەکانی هۆزەکانی ئەدرەگانی و ماملی و کرمانیدا باس کراون. پێش دۆزینەوەی کوردگال نامەک ئەو ناوانە بۆ ئێمە مەتەڵ بوون، هەر بۆیە ئێمە سوپاسمەندی ئاخوەند محەمەد ساڵحین کە ئەم مەتەڵەی بۆ شی کردینەوە.

سێیەم:

کوردگال نامەک ڕۆشنایی زۆری خستووەتە سەر پێوەندیی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووریی نێوان دانیشتوانی کۆنی بەلوچستان و سند کە لەبارەیانەوە زانایەکان بە گشتی بێ ئاگا بوون. ئاخوەند بە درێژە باسی سێ دەستە هۆزی سند: بنیان و تاکین و مومیدان دەکات. ئەو زانیارییانەی ئاخوەند باسی کردوون لە ڕووی مێژووییەوە بە ڕادەیەکی زۆر ڕاست و دروستن. لەبەرئەوەی، هەموو مێژوونووسەکانی سەردەمەکانی دوایی سند لەوانە عەلی کوفی نووسەری چەچ نامە، میر مەعسوم نووسەری مێژووی مەعسومی و میر عەلی شێر قانع

تەهتەهۆیی نووسەری تۆحفەتولکرام لە پەڕاوە مێژووییەکانیاندا ئەم سێ دەستەی هۆزەکانی سندیان بە دانیشتووی ڕەسەنی سند باس کردووە.

چوارەم:

لە بەلوچستان کارمەندێکی سیاسیی ئینگلیز دێنس برەی کە لە ماوەی کارەکەیدا چوار ساڵی لە بەلوچستان بەسەر برد و لە چاو پێشڕەوەکانی سەربەستانە لێکۆڵینەوەی لەسەر زمانی "براهوی" دەست پێ کرد. ئەو لە پێشەکیی پەڕتووکەکەیدا بەم چەشنە دەدوێ: "پێناسە و سەرف و نەحوی زمانی براهوی... براهوی کێن و کەی هاتوونەتە بەلوچستان لەو چەشنە پرسیارانەن کە بۆ وەڵامەکانیان تا ئێستا چاوەڕوانین". لە ڕاستیدا دوورکردنەوەی بە هەڵەداچوونەکانی دێنس برەی لەمەڕ ڕەسەنایەتیی نەژادیی هۆزە براهوییەکان و زمانەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ کارنامەی بەرزی نووسەری "مێژووی مەردۆخ" شێخ محەمەد مەردۆخ کوردستانی و نووسەری کوردگال نامەک ئاخوەند محەمەد ساڵح کوردی بەلوچی زەنگەنە.

...... بۆیە ئێمە لە ڕادەبەدەر سوپاسمەندی شێخ محەمەد مەردۆخ کوردستانی نووسەری مێژووی مەردۆخ و ئاخوەند محەمەد ساڵح نووسەری کوردگال نامەکین کە پەردەی تاریکییان لەسەر ئەم گرفتە مێژووییە گرینگە هەڵدایەوە کە بە هۆیەوە لێکۆڵەرانی زانست پەرێشان بوون.

بۆیە بە بوونی ئەم دوو بەڵگەنامە مێژووییانە ئێمە لەو قۆناخەداین بە ڕاستی بزانین هۆزەکانی براخۆیی (براهوی) کێن و لە کوێوە هاتنە سەر زەوی بەلوچستانی ئێستا و بە چ چەشنێک ئەم دەستە گەورەی نەژادی بەلوچ لەم ماوە دوور و درێژەدا بە ناوی براخۆیی بەلوچەوە ناسران و هاتنە کایەوە.

بەپێی ئەم نووسەرە، کوردە براخۆییە بەلوچەکان کە ناوچەی تورانی سەڵتەنەتی تورانیان داگیر کرد، لەم ناوچەیە لە سەردەمی سەرەتای دامەزراندنی سەڵتەنەتی تورانییەوە ٢٢ هۆزی تورک لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوون و سەریان بۆ میری براخۆییە بەلوچە سەرکەوتووەکان دانەواند.

بەم چەشنە، کوردە براخۆییە بەلوچەکان و هۆزە تورکەکان تێکەڵاو بوون و لە سۆنگەی ئەمەش زمانی تورکی لە ئەنجامی کاریگەرییەکانی زمانی بەلوچی

شێوازی ئەمڕۆی زمانی براهوی هەڵبژارد.

ئەم خاڵە مێژووییە گرینگانەی دەستنووسی کوردگال نامەکمان بە کورتی باس کرد بە مەبەستی سەرنج ڕاکێشانی خوێنەران.

ئاغا نەسیرخان ئەحمەد زمیی بەلوچ
١٨ شەقامی سەریاب، کوێتە.
مێژووی ١٩٩١/٨/٢٧

## پێشەکیی نادر قەمبەرانی بۆ کوردگال نامەک

### دۆزینەوەیەکی مێژوویی نوێ

"کوردگال نامەک" گەرچی نزیکەی چوارسەد ساڵ لەمەوبەر نووسراوە، لەم زووانە دۆزراوەتەوە و دۆزینەوەی ئەم سەرچاوەیە بۆ بەلوچستان و نەتەوەی بەلوچ لە گەنجینەیەکی گرانبەها کەمتر نییە.

ئەم پەڕتووکە لەمەڕ مێژووی نەتەوەی بەلوچ دەروازەیەکی نوێی بۆ وردبوونەوە و بیرکردنەوە لە بەردەم توێژەران و خوێندکارانی مێژوو کردووەتەوە. تا ئێستا دێرۆکنووسان و لێکۆڵەرەوانان مێژووی بەلوچستان و نەتەوەی بەلوچیان بە نەتەوەکانی قارەی بچووکەوە پێوەند کردووە کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا هەوڵ و کۆششێکی بێ بەر و بێ ئەنجام بووە. بەڵام ئەم کتێبە ئاراستەی پشکنینی مێژووی بەلوچستان و نەتەوەی بەلوچی بەرەو ناوەڕاستی ئاسیا و نەتەوەکانی ئێران وەچەرخاندەوە کە بێگومان ڕووگە و ئاراستەیەکی ڕاست و دروستە. لەبەرئەوەی بەلوچ و کورد پێوەندییان بە یەک نەژادەوە هەیە و لە سەردەمانێک لێک دابڕاون و یەکێکیان لە ڕۆژهەڵات و ئەوی تریشیان لە ڕۆژئاوا، بگرە لە باکووری ڕۆژئاوا ئاوا بوونە. ئەم دوو نەتەوەیە لە نەژادی ئارییەکانن بەڵام لە ئاست نەتەوە ئارییەکانی تر نزیکایەتیی نێوانیان زۆر فراوانترە.

نەتەوەی بەلوچ لە ناوچەی ڕۆژهەڵات واتە سیستان و زابل و بەلوچستانی ئێستا کە لە کرمانەوە تا کەنارە ڕۆژئاواییەکانی ڕووباری سند دەگرێتەوە بڵاو بوونەتەوە و بە هۆی کەوشەنی سیاسیی جوگرافیایی پاکستان و ئێران و ئەفغانستان لەیەک جیا جیا دەژین. ئەمەش لە کاتێکدایە کە لە ڕووی مێژوو و زمان و کولتوورەوە لە یەک نەتەوەن. هەر بەم چەشنە نەتەوەی کوردیش لە ڕۆژئاوای ئاسیا لە سووریا و عێراق و ئێران و تورکیا بە هۆی سنووری سیاسیی جوگرافیایی لەیەک جیا جیا دەژین و پەرش و بڵاو بوونەتەوە.

بەپێی کوردگال نامـەک بەلوچیش بەشـێکی نەتـەوەی مـەزنی کوردە، لەبەرئەوەی ئەو هۆزانـەی لەناو بەلوچدا هـەن بە هـەمـان شـێـوە لەناو کـوردەکـانیش بە هـەمـان ناوەوە هەن و تەنـانەت لەناو بەلوچەکـاندا ئێستـاش هۆزێکی گـەورە هـەیە بە ناوی "کورد"ەوە بەناوبانگە. گەرچی ئاخوەند محەمەد سالّح چوارسەد ساڵ لەمەوبەر ئەم پەرتووکـەی نووسـیـوە، هەمـوو ئەو کـارەسـات و ڕووداوانەی مـێـژووی ئـاسـیـای ناوەڕاست و ئێرانـی وەکو خۆی نووسـیوەتەوە و هیچ جیـاوازییـەکیـان تێدا بەدی ناکرێت.

کوردگال نامـەک تازە ئاغا مـیر نەسـیرخـان ئەحمـەد زەیی بەلوچ دۆزیوەتییەوە و "ئەکادمی بەلوچی" دەقە فارسییەکەی بڵاو کردووەتەوە.

جێگەی سـەرنجە کە لەسەر مـێژووی نەتەوەی بەلوچ تا ئێستـا کتـێبێکی زۆر بڵاو کـراونەتەوە بەڵام هـەمـوویـان یان زۆربەیان دانراو و پێـوانەن. مـێـژوونووسـەکـانی ئێمەش زۆربەیان دانراوەکانی مێژوونووسەکانی ڕۆئاوایـان بە باوەڕپێکراو تەماشا کرد و کردیان بـە بناخەی لێکۆڵینەوەی خۆیان. تـا ئێسـتـا هـەر چەند مـێژوو لەمـەڕ نەتەوەی بەلـوچەوە نووسـرابێ، لەمـەڕ چـاوگە و سـەرچاوەگرتـنی بەلوچەکـان هیچ زانیـارییـەکی ئەوتۆ بەدەست نـەهاتووە کـە تینووێتـیی خـوێنەران و خـوێندکـارانی مـێـژوو بشکێنـێ. هـەڵبــەتە، دۆزینـەوەی "کــوردگــال نـامــەک" ئـاراسـتــەی نـوێی توێژینەوەی هێناوەتـە کایەوە. ئیـتـر مێژوونووسـان و خـوێندکارانی مـێژوو دەتوانن بچنە بنج و بناوانـی مـێژووی کۆنـی ئاسیای ناوەڕاست و ئێران و لەبارەی نەتەوەی بەلوچەوە ڕاستیی باوەڕپێکراوی زیاتر بە دەست بهێنن.

نادر قەمبەرانی
زانکۆی بەلوچستان، کوێتە.
٦ ئۆکتۆبەری ١٩٩٣

تێبینی: پاش ئەوەی کوردگال نامەک دەقە فارسـییەکەی لە شاری کوێتەی بەلوچستـانی پاکستان چاپ کرا، پرۆفیسۆر عەبدوڵڵا جەمالەدینی ئەرکی وەرگێرانی بۆ سەر زمانی ئوردو گرتە ئەستۆ، لەبەرئەوەی بەلوچەکانی پاکسـتان بـە گشـتی فـارسی نازانن کە بتوانن ئەم پەرتووکە بە نرخـە بخوێننەوە و لـە مێژوو و ڕابردووی نەتەوەکەیان بگەن. بە داخــەوە لە مـاوەی وەرگێـڕانەکەدا نەخـۆش دەکەوێت و داوای لە پرۆفیـسـۆر نادر

قەمبەرانی کرد کە کاری وەرگێڕانی پەڕتووکەکە تەواو بکات. ئەم بابەتەی سەرێ کورتکراوەی ئەو پێشەکییەی مامۆستا نادر قەمبەرانییە کە بۆ چاپە ئوردووەکەی کوردگال نامەکی نووسیوە. من ئەو خۆشبەختییەم هەبوو کە لە ساڵی ١٩٩٦ لە کاتی سەفەرم بۆ کوێتە بۆ بینینی مامۆستا میر نەسیرخان ئەحمەد زەیی بەلوچ نووسەری مێژووی بەلوچ و بەلوچستان لە نزیکەوە چاوم پێی بکەوێ. شایانی باسە مامۆستا نادر پیاوێکی زۆر ڕووخۆش و دڵسوزە. ئەو کات لە زانکۆی بەلوچستان لە کوێتە سەرۆکی بەشی زمانی فارسی بوو و وانەی بە قوتابیانی ماستەری زمانی فارسی دەگوتەوە. جگە لەمانە مامۆستا نادر پیاوێکی خەباتگێڕیش بوو و زۆرجار لەسەر خەباتی ئازادیخوازانەی بەلوچ زیندانی کراوە و ماوەیەکیش بۆ ئەفغانستان دوور خراوەتە. بەپێی ئەوەی لە هۆزی کەمبەرانی (قەمبەرانی)یە ئەویش لە نەوەی کوردە براخۆییەکانە. (وەرگێڕ).

بەشی یەکەم

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدالله رب العالمين وسبحان الذي احاط بكل شيء علمه ونفه في كل موجود حكمه، وظهر في جميع الامور حكمته وبان في كل مصنوع لطيفه صنعه، نحمده على نعمته غمرنا بموهبة العقل الذي اختصنا من ساير الحيوان به، فوجب علينا بذلك حجتة ولزمنا معه عبادته والاقرار بربوبيته [ما] وصلى الله على محمد عبده ورسوله وعلى آله من اهله.

## سەرەتا

من ئاخوەند سالّح کوڕی ئاخوەند سلێمان کوڕی ئاخوەند مەحمووود کوڕی ئاخوەند مووسا کوڕی ئاخوەند موبارەک کوڕی ئاخوەند ئەحمەد کوڕی مستەفا کوڕی لەیس کوڕی حەبیب کوڕی خەلەف کوڕی قەیسەر کوڕی عوسمان کوڕی ئەلیاس کوڕی عومران کوڕی یەعقوب کوڕی عیسا کوڕی سەنجەر کوڕی بەهادور کوڕی شاهبێگ کوڕی مەلیک کوڕی بەهمەن کوڕی ئەیبەک کوڕی یول بێگ کوڕی ئەحمەد کوڕی سەنان کوڕی حارس کوڕی سیراج کوڕی برسان کوڕی جابر کوڕی موعین کوڕی مەدان کوڕی حەکەم کوڕی باشار کوڕی ئەحمەد کوڕی ئابان کوڕی توراب کوڕی عوبەید کوڕی عیسا کوڕی سەعید کوڕی بەکر کوڕی خەلەف کوڕی سەوید کوڕی ئەورام کوڕی تیرداد کوڕی بەیکەر کوڕی شاگان کوڕی سەران کوڕی سەلەم کوڕی گرشاب کوڕی کوباد کوڕی رەسان کوڕی گودورز کوڕی تیرداد کوڕی ڕۆستەم کوڕی مهرداد کوڕی بوراک کوڕی شێربورز کوڕی بەهرام کوڕی ئیزبوک کوڕی روان شێر کوڕی مەردان کوڕی بەدلیس کوڕی مهران کوڕی بیسوت کوڕی شاهمیر کوڕی نوزەر کوڕی وەندان کوڕی سیاوش کوڕی فەرهاد

کوڕی بیدار کوڕی سیامەک کوڕی نۆجەهان کوڕی مهران کوڕی بورگان کوڕی کورمنگ کوڕی ئیسپیبود کوڕی فیروز کوڕی بەرسان کوڕی پاتاک کوڕی باکیل کوڕی مەرزەک کوڕی فرکی کوڕی کازان کوڕی شوانک کوڕی زرکان کوڕی دیزە کوڕی خانی کوڕی باجەل کوڕی مانور کوڕی حورموز کوڕی سابول کوڕی نەدران کوڕی سەوید کوڕی رامین کوڕی رشوان کوڕی زاخو کوڕی شوهان کوڕی زینل کوڕی پازو کوڕی کوساد کوڕی گیل کوڕی راسن کوڕی باشمان کوڕی ئارین کوڕی دلفان کوڕی سەلدوز کوڕی کولک کوڕی شبان کوڕی عەزیر کوڕی تور کوڕی زەنگان کوڕی بود کوڕی ماد کوڕی جیگ کوڕی تاگاز کوڕی مەنگور کوڕی گاور کوڕی کاد کوڕی پازو کوڕی سوبار کوڕی میران کوڕی وان کوڕی گورەک کوڕی شوهان کوڕی شکاک کوڕی سەنجار کوڕی ساسون کوڕی زاران کوڕی خۆشناو کوڕی حەکار کوڕی دراج کوڕی زەنگان کوڕی راسن کوڕی چەرکەش کوڕی مادی گەورە کوڕی غوران کوڕی شود کوڕی تێرحان کوڕی پشدەر کوڕی بولگار کوڕی دەخوو کوڕی سور کوڕی رودین کوڕی گیوەر کوڕی ئارین کوڕی میتان کوڕی بوغاز کوڕی کارداک کوڕی خەزەر کوڕی تورک کوڕی کومەر کوڕی یافس کوڕی نوح سڵاوی لێ بێ، لە هۆزی کوردی زەنگەنەم کە تیرەیەکی هۆزی "بودی"یە و لە ڕووی نەژادییەوە لە کوردە براخۆییەکانەوە نزیکە. باپیرە گەورەی ئەم دوو تیرەیە "بود"ە و هۆزی "بودی"یش یەکێکە لە حەوت تیرەی هۆزی "ماد". بود دوو کوڕی بە ناوی براخم و زەنگان هەبووە. سەرەتا نەوەی ئەم دوو کوڕەی بود بە ناوی تیرەی بودییەوە ناوبانگیان دەرکرد بەڵام لە دواییدا بە هۆی فراوانبوونی بەرەیان تیرەی بودی بەسەر دوو تیرەی گەورەی براخۆیی و زەنگەنەدا دابەش بوو.

بێژەرەکانی[5] کورد دەگێڕنەوە کە "کورد" خەڵکانێکن سەرەتا چەند هەزار ساڵ بەر لە زاینی مەسیح، هاتوونەتە ئەو ناوچانەی کەوتووەتە خوارووی "ئەرمەنستان" و ئێستا بە "ئازەربایجان" دەناسرێ. ئەو ناوچانە بە هۆی نیشتەجێبوونی ئەوان لەو سەردەمەدا بە ناوی "ماد"ەوە ناسرا و ناوبانگی دەرکرد. پاشان کوردەکان لێرەوە بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا و خوارووپەرت و بڵاو بوونەوە و نشینگەی ئێستایان کە کەوتووەتە خوارووی ئازەربایجان بە "کوردستان"

٥. لە دەقی فارسییەکەدا "راوی" نووسراوە.

دەناسرێ. بیرۆرەکان لەسەر ئەم بۆچوونە هاوبیرن کە نشینگەی سەرەتایی کوردەکان ناوەڕاستی "ئاسیا" بووە و لەوێوە هاتوونەتە کەنارەکانی باشووری دەریای "خەزەر". پاشان لەوێوەش وردە وردە لەگەڵ ڕەوتی سەردەم بەرەو لای زنجیرە چیاکانی"زاگرۆس" کە کەوتووەتە خوارووی "ماد" و لەلای ڕۆژهەڵاتەوە لە ناوچەی "دیجلە" بڵاو بوونەتەوە و نیشتەجێ بوونە.

سەرەتا پێوەندیی کوردەکان پێش دەسەڵاتداریتیی "کەیقوباد" و دروستبوونی دەوڵەتی "ماد"، بە دەسەڵاتداریتیی "شومیر"، "ئەکاد"، "کلدە". "ئاشور" و "عیلام" و دوای ئەوانیش بە "پیشدادی"یەکانەوە پێوەست بووە. کوردە مادەکان دوای ئەوەی لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو باکوری ڕۆژئاوای ئێران کۆچیان کرد و لەو شوێنانەدا نیشتەجێ بوون، لە سەدەی سێیەمی پێش زاین تاوەکو دەوروبەری سەدەی بیست و یەکەمی پێش زاین، بە شێوەی دەستە دەستە ژیانیان بەسەر بردووە. هەر دەستەی خاوەنی سەرۆکێکی تایبەت بووە و بە گشتی لە بارودۆخێکی ناتەبا و پاشاگەردانیدا بوونە. هەر هۆزەی لەلایەک نیشتەجێ بووە و لەژێر دەسەڵاتداریی فەرمانڕەوایەک ژیانیان بەسەر بردووە.

کاتێک بنەماڵەی "پیشدادی"یەکان لە "ماد" و "پارس" دەسەڵاتداریی خۆیان پێک هێنا، مادە کوردەکان بە بنەماڵەی ئەوانەوە پێوەند بوون و لەژێر دەسەڵاتداریتیی فەرمانڕەواکانی ئەوان ژیانیان بەسەر دەبرد. بەڵام لە سەدەی نۆیەمی پێش زاین، کاتێ دوا پاشای بنەماڵەی "پیشدادی"، گرشاسپ کوڕی وشتاب کوڕی تەهماسپ کوڕی مەنوچهر کوڕی ئێرەج کوڕی فەرەیدون کوڕی ئەپتیان کوڕی جەمشید کۆچی دوایی کرد و هێرش و شاڵاوی پاشاکانی "ئاشوور" بۆ سەر وڵاتی ماد و پارس دەستی پێ کرد، دەستەکانی کوردە مادەکان لە هەمبەر دەوڵەتی دەستدرێژکەر و توندڕۆی ئاشووری، ناچار بوون بۆ پاراستنی وڵاتەکەیان، سەڵتەنەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن. بۆ ئەم مەبەستە، سەران و سەردارانی "مادی گەورە" و "مادی بچووک" و کوردەکانی "پارس"، "گیل"، "دیلەم" و "خەزەر" بە گشتی لە دانیشتنێکدا کۆ بوونەوە و دوای ڕاوێژکاریی درێژخایەن، گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە "کەیقوبادی کورد" کە سەرۆکی یەکێ لە هۆزەکانی ماد بوو و لە ڕووی ئاوەزی، زانست، دادپەروەری و کارزانییەوە بێ هاوتا و بەناوبانگ بوو، بکەن بە فەرمانڕەوای سەڵتەنەتەکەیان.

"ئەفراسیاب" پاشای "توران" بە هۆی نزیکی و خزمایەتیی لەگەڵ پیشدادییەکان، خۆی بە فەرمانڕەوا و میراتگری ڕەسەنی سەڵتەنەتی ماد و پارس دەزانی. ئەمەش لەبەرئەوەی کە لە ڕووی بنەچەوە لە بەرەی "تور" بوو و زنجیرەی بنەچەی "تورانی"یەکانیش دەگاتەوە پیشدادییەکان. لەبەر ئەم هۆیە، ئەفراسیاب پاشایەتیی کەیقوبادی نەسەلماند و دەستی بە دژایەتیکردنی کرد. لە ئەنجام، شەڕ لە نێوان "توران" و "ماد" و "پارس" هەڵگیرسا، کەیقوباد توانی هێزی ئەفراسیاب بشکێنێ و وڵاتی توران داگیر بکات. سەڵتەنەتی توران لە ناوچەکانی: "سوغدستان"، "کابلستان"، "زابلستان"، "توران" و "مەکران" پێکهاتبوو. کەیقوباد پاش داگیرکردن و سەرکەوتن، هۆزە کوردەکانی لەم ناوچانەدا نیشتەجێ کرد. لەم نێوانە، زابلستانی دا بە کوردە "زەنگەنە"کان، تورانی دا بە کوردە "براخۆیی"یەکان، مەکرانی دا کوردە "ئەدرەگانی"، "ماملی" و "کرمانی"یەکان، بەو مەبەستەی پارێزگاری و چاودێریی سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی سەڵتەنەتی ماد بکەن و لە کاتی پێویست و شۆڕش و ڕاپەڕینی گێتی، ببنە بەربەست و جڵەو لە دوژمن بگرن. ئەم هۆزانە، لەم ناوچانەدا، بۆ هەموو کات نیشتەجێ بوون و خەریکی پارێزگاریکردنی سنوورەکانی سەڵتەنەتی ماد بوون.

## باسی قوتابخانەی ئیسلامی

لە سەردەمی کۆندا، "زەرەنج" پایەتەختی زابلستان بوو و نیشتەجێبووانی زابلستان پاش هاتنی ئیسلام، ئاینی پیرۆزی ئیسلامیان هەڵبژارد. لە سەردەمی خەلیفایەتیی حەزرەتی "عومەر"دا، زەرەنج بە دەستی "عاسم کوڕی عومەر" کە لەلایەن حەزرەتی عومەرەوە بۆ داگیرکردنی "سەجستان" ڕاسپێردرابوو، داگیر کرا. لەم بەستێنەدا، میر "ئەورام" سەرداری هۆزی کوردە "زەنگەنە"کان کە بە پشت ٤٩یەمین باپیرە گەورەی بنەچەمەی نووسەری ئەم پەرتووکەیە لەگەڵ باپیرانم پاش ئەوەی ئاینی ئیسلامیان قەبووڵ کرد، دەستیان بە پروپاگەندە و بڵاوکردنەوەی ئیسلام کرد.

لە سەردەمی دەسەڵاتداریی میر "مەحموود غازی" کوڕی "سوبەکتگین"، میری "غەزنە" لە ساڵی ٣٩٩ی کۆچیدا، وڵاتەکەی بەرینتر کردەوە و زابلستانی هێنایە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتداری خۆی. لەو کاتەدا، سەرۆکی کوردە زەنگەنەکان میر

"سـيـراج" كـه بە پشت ۳۲یەمین باپیـرمـه، له زەرەنج بناخـەی قـوتابـخـانەیەکی ئیسـلامی دامەزراند بە مەبەستی ئەوەی خەڵک لە ڕێبازی ئیسـلام ئاگەدار بکەنەوە و لە دیاردەی بێ دینی بیانپارێزن کە لە سەردەمی دەسەڵاتداریی "عەباسی"یەکاندا لە هەمـوو لایەک سـەری هـەڵدابوو. قوتـابخـانەکـە لەژێر بەڕێوەبـەرایەتیی سـەرۆکە کوردە زەنگەنەکـان لە بڵاوکردنـەوەی ڕێبازی ئیسـلام، ناوبانگی زۆری پەیدا کرد و قـوتابیـیـە دەرچووەکـانی دوای تەواوکـردنی زانسـتـە ئیـسـلامـیـیەکـان، تیـشک و پەروەردەی ئیسـلامـیان بە هـەمـوو دەوروبەردا بڵاو کردەوە. زنجـیـرەی وانەدانەوە و فێرکردنـی قوتابخانەکە تا کاتی میر "تەیموور گورکان" بەردەوام بوو کە لە سـاڵی ۷۸٥ی کۆچیدا لە ناکاو لە ماوەرەلنەهرەوە هێرشی کردە سـەر زابلستان کە لەگەڵ ڕەوتی سەردەم بە "سیستان" ناسرا.

شـەڕێکی سـەخت لە نێـوان مـیـر تەیموور و دەسـەڵاتداری زابلسـتـان مـیـر "قـوتبـەدین" لە زەرەنج پـایەتەخـتی سـیـسـتـان ڕووی دا. مـیـر تەیموور گـەمـارۆی زەرەنجی دا و پاش پێکدادانێکی سـەخت، سـیـسـتـانیـیـەکـانی شکست دا و دارودەستەکەی، ڕەشەکوژیی خەڵکی شارەکەیان کرد. لەم شەڕەدا، باپیرە گەورەم، میر "قەیسەر زەنگەنە"ش کوژرا.

بینـای قـوتـابخـانەکـە کـە لەنـاو شـار بوو تاڵان و وێران کـرا. زۆربەی بـەشی کتێبخانەکەش زیانی پێ گەیشت و زنجیرەی وانەدانەوە و فێرکردن کۆتاییی پێ هات. پاش نەمانی شەڕ و کوشت و کوشتارگە، میر "خەلەف" کوڕی میر "قەیسەر" لەگـەڵ خـزم و کـەسـوکـارەکەیدا چووە شـارۆکـەی "زابل" و بۆ هەمـوو کـات لەوێ نیشـتەجێ بوون. لێرەش قوتابخانەیەکی بچووکی کردەوە و سـەرقاڵی وانەدانەوەی ئیسلامی بوو. هەندێ پەرتووکی ئاینی و بەڵگەنامەی مێژوویی کە لە دزی و تاڵان و بڕۆی سەربازەکانی تەیموور مابوونەوە لەگەڵ خۆی هێنابوو.

زنجیرەی وانەدانەوە و فێـرکردن لەم قوتابخـانەیە تا سـەردەمی دەسـەڵاتداریی بنەمـاڵەی "سـەفـەوی"یەکان درێژەی کێـشـا و پاشـان کۆتاییی پێ هات. ئەمـەش لەبەرئەوەی نـاوچەی "قـەندەهـار" بەردەوام سـەرچاوەی گـێرمـە و کێشـە و شـەڕ و پێکدادان بووە لە نێوان سەڵتەنەتی ئێران و وڵاتی مەغۆلی هیندستان.

لە سـاڵی ۱۰٥۰ی کـۆچیـدا لە نێـوان "شـا عـەباسی دووەمی سـەفـەوی"ی

فەرمانڕەوای ئێران و "شا جەهان" پاشای مەغۆلی هیند شەڕ و کێشەی دوور و درێژ ڕووی دا و لە ئەنجام شا عەباس سەرکەوت و شا جەهان نەیتوانی ناوچەی قەندەهار دووبارە بهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی. بەمجۆرە، هەرێمی قەندەهار دووچاری پاشاگەردانی بوو و ئاشتی و ئاسایشی شار و شارۆکەکانی دەوروبەریش مەترسیی تێ کەوت. ئەمانە بە گشتی بوونە سۆنگەی پچڕانی زنجیرەی وانەدانەوە و فێرکردنی قوتابخانەکەی زابل.

پاش وەستانی وانە و خوێندن لە قوتابخانەی زابل، ئەو دەرفەتەم بۆ ڕێک کەوت کە خامەی جەوهەردار بەگڕ بخەم و داستانی کۆن و مێژووی دێرینەی کوردە بەلوچەکانی زابل و توران و مەکران، کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا تۆمار کرابوون و بە سوودوەرگرتن لەو چەند سەرچاوانەی کە لە هێرش و شاڵاوی تەیموور گورگان لە لەناوچوون ڕزگار بووبوون، جارێکی تر لە شێوەی نووسین دەربهێنم. ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانم خۆشەویستی و دڵگریی خۆم لە هەمبەر سەران و میرانی کوردە بەلوچەکان نیشان بدەم و وەکو ئەستێرەکانی گەردوون ڕۆشنایی هەمیشەیی بە کردەوە و چاکەکاریی سەرباز و ناودارانی کوردە بەلوچەکانی زابل و توران و مەکران بدەم. بۆ ئەوەی خووڕەوشتی شایانی ستایش و ڕازەکاریی مەزن و کردارەکانیان لە خانەی فەرامۆشکاریدا نەمێنێتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش، بەپێی توانا ئەوەندەی لێی بە ئاگا بوومە و زانیومە، لە مێژووی ١١ی ڕەبیعولسانیی ساڵی ١٠٧٠ی کۆچیدا، کۆتاییم بە نووسینیان هێنا. ناوی ئەم کتێبەشم نا "کوردگال نامەک"، لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی کتێبەکە لە سەرەتا تا کۆتایی باسی مێژووی ئەو دەستەیەی کوردە مادەکان دەکات کە لە نزیکەی ٨٥٠ ساڵ پێش زاین، پاش دروستبوونی سەڵتەنەتی ماد، هاتوونەتە ئەم ناوچانە و تێیدا نیشتەجێ بوونە. ئەم دەستەیەی کوردە مادەکان لە تیرەکانی: "زەنگەنە"، "براخۆیی"، "ماملی"، "ئەدرەگانی" و "کرمانی" پێک هاتبوون و بۆ یەکەم جار بە هاوەڵی پاشای ماد، کەیقوبادی کوردی ماد هاتنە ناوچەکانی "زەرەنگ" (زەرەنج)، "توران" و "مەکران".

## باسی کورده زەنگەنەکان

کـوردی "زەنـگەنە" لەو بەشـەی کـوردن کـە بە کـوردی "ڕۆهـەڵاتی" دەناسـرێن و ناوبانگیان دەرکردووە. کوردی ڕۆهەڵاتیش ئەو دەستەیەی کوردن کە لە ڕۆهەڵاتەوە هاتنە "مـاد" و لێـرەوە بەرەو باشـوور و ڕۆئاوا کـۆچیـان کـرد و لە ناوچەی ئەم سـەردەمە کـە بە "کوردسـتـان" دەناسرێ نیشـتـەجێ بوون. بەپێی مـێژووی کۆن، دەسـتـەی ڕۆهـەڵاتی کـە بە "مـاد" دەنـاسـرێن لە حـەوت تیـرە: "پارتاسـنی"، "بوز"، "ئەستروشات"، "ئاری زانت"، "بودی"، "ماژ" و "دیلمـان" پێک هاتوون. تیرەی بودی لەگەڵ ڕەوتی سەردەم بەسەر دوو تیرەی "زەنگەنە" و "براخۆیی"دا دابەش بوو کە لە دوو کـوڕی "بـود": "زەنگان" و "براخم"ەوە سـەرچاوەیان گـرت و بە بۆنـەی ئەوانەوە نەوەکانیان بە "زەنگەنە" و "براخۆیی" ناوبانگیان دەرکرد.

ڕیشـەی زەنگەنـە بەم چەشنە دەست پێ دەکـات: حـەزرەتـی نوح سـڵاوی لێ بێ، یافس، کومەر، تورک، خـەزەر، کارداک، بوغاز، میتان، ئارین، گیوەر، رودین، سور، دەخـوو، بولگار، پشدەر، تێرحـان، شـود، غـوران، مـادی گـەورە، چەرکـەش، راسن، زەنگان، دراج، حـەکـار، [خۆشنـاو، زاران، سـاسـون، سـەنجـار، شکـاک، شـوهـان]، گـورەک، وان، مـیـران، سـوبار، پازو، کـاد، گـاور، مـەنگور، تاگـاز، جـیگ، مـادی بچووک.

مـادی بـچـووک حـەوت کـوڕی هـەبوو کـە ناوەکـانیـان بەم چەشنەیە: پـارتاسن، ئەسـتـروشـات، ئـاری زانت، بوز، مـاژ، بـود و دیلمـان. بود دوو کـوڕ: زەنگان و براخمی لە پاش بەجێ مـا. ڕیشەی بنەچەی زەنگان کە لە دوایی بە تیرەی زەنگەنە ناسـران بەم شـێـوەیە: مـادی بچـووک، بود، زەنگـان، تور، غـدیر، شـەبان، کـولک، سـەلدوز، دلفان، ئارین، باشـمان، راسن، گیل، کوسـاد، پازو، زینل، شوهان، زاخو، رشـوان، رامین، سـەوید، نەدران، سـابول، حـورمـوز، باجەل، خـانـی، دیزە، زرکـان، شوانک، کازان، فرکی، مەرزەک، باکیل، پاتاک، برسان، فیروز، ئیسپیبود، کورنگ، بورگـان، مـهـران، نوجـەهـان، سیـامـەک، بیـدار، فـەرهـاد، سـیـاوش، وەندان، نوزەر، شـاهـمـیـر، بیسـوت، مـهـران، بەدلیس، مـەردان، روان شـێـر، ئیـزبوک، بەهرام، شـێربـورز، بوراک، مهران، ڕۆسـتەم، تـیرداد، گودورز، رەسـان، کوباد، گرشـاسپ، سـەلەم، سەران، شـاگان، بەیکەر، تیرداد، ئەورام، سەوید، خـەلەف، بەکر، سـەعید،

عیسا، عویەید، توراب، ئابان، ئەحمەد، باشار، حەکەم، مەهران، موعین، جابر، برسان، سیراج، حارس، سەنان، ئەحمەد، پول بێگ، ئەیبەک، بەهمەن، مەلیک، شاهبێگ، بەهادور، سەنجەر، عیسا، یەعقوب، عومران، عوسمان، قەیسەر، خەلەف، حەبیب، لەیس، مستەفا، ئەحمەد، موبارەک، مووسا، مەحموود، داود، سلێمان، سالح.

کاتێک کەیقوباد فەرمانڕەوای ماد و فارس میرنشینی زابلستانی دا بە کوردە زەنگەنەکان، میر "سەوید" سەرۆکی تیرەی زەنگەنە بوو و بنەماڵەکەی تا سەردەمی هاتنی ئەسکەندەر پاشای ولایەتی "مەقدۆنیا"ی یۆنان لە زابلستان فەرمانڕەواییان کردووە. دوای میر سەوید، کوڕەکەی، "نەدران، کوڕەکەی، سابول، کوڕەکەی، حورموز، کوڕەکەی، باجەل، کوڕەکەی، خانی، کوڕەکەی، دیزە، کوڕەکەی، پاتاک و کوڕەکەی، برسان یەک لە دوای یەک لەسەر تەختی زابلستان فەرمانڕەواییان کردووە. درێژەی مێژوو و سەردەمی ئەم سەرۆکانەی کوردە زەنگەنەکان لە سەردەمی هێرش و شالاوی میر تەیموور گورگان، لە ساڵی ٧٨٥ی کۆچیدا لەناو چوونە. لەبەرئەوە، لەم بارەیەوە هیچ سەرچاوە و نووسراوێکمان لە بەردەستدا نییە کە بتوانین لە ڕوویانەوە درێژەی بارودۆخیان باس بکەین. هەڵبەتە، ئەوەندە دەزانین کە لە سەردەمی داگیرکردنی فارس، "ئەسکەندەری مەقدۆنی" کاتێ بە شوێن "دارا"دا دەگەڕا و ڕووی کردە ولایەتەکانی ڕۆئاوا، میر برسان میری ولایەتی زابلستان بوو و جگە لە گوێڕایەڵبوونی دەسەلاتی ئەسکەندەر هیچ چارەیەکی تری بۆ نەما. ئەسکەندەریش بە خەلاتی گرانبایی نەوازشی لەگەڵ کرد و لەسەر فەرمانڕەوایی زابلستانی هێشتەوە و بە هاوکاریکەری خۆی هەژمارد. مێژوونووسە یۆنانییەکان ناوچەی زابلستانیان بە "زەرەنگیانا" کە لە "زەرەنگ"ەوە وەرگیراوە ناساندووە.

ئەسکەندەر لە ساڵی ٣٢٣ی پێش زاین، هاتەوە "بابل" و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد. دوای مردنی ئەو، لە نێوان سەرلەشکرەکانی کێشە و دژایەتی و پێکدادانێکی زۆر لەسەر جێنشینی ئەو بەرپا بوو و لە ئەنجام سەڵتەنەتە پان و بەرینەکەیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد. بەشی ڕۆهەلاتی سەڵتەنەتەکە کە لە ماد و پارس پێک هاتبوو، درایە دەستی سەرلەشکر "سیلوکوس". سیلوکوس و بنەماڵەکەی، میر برسان و نەوەکانیان لەسەر میرنشینی زابلستان هێشتەوە. بۆیە

دوای میر برسان، کوڕەکەی، فیروز، کوڕەکەی، ئیسپیبود، کوڕەکەی، کورنگ و کوڕەکەی، بورگان یەک لە دوای یەک لەسەر تەختی زابلستان فەرمانڕەواییان کردووە و بە هۆی کرداری دادپەروەرانەیان بەناوبانگ بوونە.

پاشان میر "ئەشک" دەسەڵاتداری "بەلخ"، کە یۆنانییەکان بە "باختریا" ناویان بردووە، لە ساڵی ٢٤٥ی پێش زاین، بناخەی فەرمانڕەوایی خۆی دامەزراند و بنەماڵەکەی بە ناوی "ئەشکانی" بەناوبانگ بوون. کوڕەزای میر ئەشک، "تیردادی یەکەم" پاشماوەی ناوچەکانی سەڵتەنەتی ماد و پارسی داگیر کرد و هێنایە ژێر رکێفی دەسەڵاتداریی خۆی. بەمجۆرە، زابلستانیش هاتە ژێر دەسەڵاتی ئەشکانییەکان و فەرمانڕەوایی کوردە زەنگەنەکان لە زابلستان کۆتایی پێ هات. هۆی ئەمەش ئەوە بوو کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی پاشای ئەشکانی "مهردادی یەکەم"دا، هەندێ لە میرەکان ئاڵای یاخیبوونیان بەرز کردبووەوە و دژایەتییان دەکرد. دوای تێکشکانی ئەم شۆڕشانە، بارودۆخی فەرمانڕەوایە گوێڕایەڵ و ژێردەستەکان گوماناوی بوو و مهردادی یەکەم فەرمانڕەوای ولایەتە دوورەکان و دەسەڵاتدارە خۆماڵییەکانی لەسەر کار لادا و لە جێگەی ئەوان شازادە ئەشکانییەکانی دامەزراند. لەبەر ئەم هۆکارە، فەرمانڕەوایی بورگانی کوردی زەنگەنەش لە زابلستان کۆتایی پێ هات و شازادەیەکی ئەشکانی، "سناربار" هاتە سەر تەختی ولایەتەکە و زنجیرەی فەرمانڕەوایی ئەو و بەرەکەی لە زابلستان دەستی پێ کرد. بەم شێوەیە، دوای کۆچی دوایی سناربار، کوڕەکەی، گوندوس هاتە سەر تەختی میرنشینی. دوای کۆچی دوایی ئەویش، کوڕەکەی، گودا دەسەڵاتی میرنشینی گرتە دەست. بەم چەشنە، دوای "گودا"ش، ئەرشم، هۆشەنگ، سناربای دووەم و گرشاسپ یەک لە دوای یەک تا کاتی هاتنی تورکە "کۆشانی"یەکان، لەسەر تەختی میرنشینی زابلستان فەرمانڕەواییان کردووە.

## باسی کوردە براخۆییەکان

کوردە براخۆییەکان یەکێ لەو تیرە گەورانەی کوردن کە لە سەرتاسەری دنیا شێوازی شەڕی و ولاتگیرییان وەکو تیرەکانی تری کورد ناوبانگی دەرکردووە و تەنانەت خامەی " بۆنی عەنبەر"یش لە نووسین و ستایشی خەسڵەتی چاکیان زیز و دەستەمۆیە. کوردە براخۆییەکان لە دەوروبەری ساڵی ٨٥٠ی پێش زاین، پاش

دروستبوونی سەڵتەنەتی مادە کوردەکان لە ماد و پارس کە لە دواییدا بە ناوی سەڵتەنەتی ماد و پارس ناوبانگی دەرکرد، بۆ یەکەم جار بە پشتیوانیی کەیقوباد پاشای مادە کوردەکان پایان نایە سەر خاکی "بەلوچستان" و دەسەڵاتداریی ئەو سەرزەوییەیان هێنایە ژێر قەڵەمڕەوی خۆیان. پاش نیشتەجێبوونیان لەو ناوچانەدا، لەلایەن ئەو خەڵکانەی کە بەر لە هاتنی ئەوان لەو ناوچانەدا نیشتەجێ بوون، بە "کوردگال" ناسران، ئەمەش بە مانای "ئەوانەی بە کوردی دەپەیڤن" دێت. هەر بۆیە سەرەتا ئەم تیرەی کورد بە "کوردگال" ناوبانگیان دەرکرد.

بنەچەی کوردە براخۆییەکان بەم شێوە ی خوارەوەیە:

گێڕەوە ئاینییەکان دەگێڕنەوە کە دوای تۆفانی نوح سڵاوی لێ بێ، سێ کوڕەکەی: حام، سام و تافس لە گێژەن ڕزگاریان بوو و هەموو مرۆڤی دنیا بە نەوەی ئەم سێ کوڕەی پەیامبەر نوح سڵاوی لێ بێ دەزانن. دەڵێن نەژادی ئەم سێ کوڕە لە دواییدا ئەوەندە زۆر بووە کە بۆ گوزەرانیی ژیان بە هەموو پەنا و قوژبنێکی دنیادا بڵاو بوونەوە. یەکەم جار ڕوویان کردە ناوچەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی گردایی زەوی و لەوێ نیشتەجێ بوون و پاشان هەندێکیان بەرەو خواروو کۆچیان کرد و لە ناوچەی ئەم سەردەمەیان نشینگەیان دامەزراند. حەزرەتی یافس هەشت کوڕی هەبوو و یەکێکیان ناوی کومەر بوو. زنجیرەی بنەچەی کورد لە کومەرەوە بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

یافس، کومەر، تورک، خەزەر، کارداک، بوغاز، میتان، ئارین، گیوەر، رودین، سور، دەخوو، بولگار، پشدەر، تێرحان، شود، غوران، مادی گەورە، چەرکەش، راسن، زەنگان، دراج، حەکار، خۆشناو، زاران، ساسون، سەنجار، شکاک، شوهان، گورەک، وان، میران، سوبار، پازو، کاد، گاور، مەنگور، تاگاز، جیگ، مادی بچووک.

مادی بچووک حەوت کوڕی هەبوو، واتە: پارتاسن، ئەستروشات، ئاری زانت، بوز، ماژ، بود و دیلمان. لەم حەوت کوڕەی مادی بچووک، حەوت تیرەی کورد دروست بوو و هەریەکەی بە ناوی باپیرە گەورەی خۆیەوە ناسرا. ئەم تیرانەی کورد بە "کوردی ڕۆژهەڵاتی" دەناسرێن، لەبەرئەوەی ئەوان لەلای ڕۆژهەڵاتەوە هاتوونەتە [ماد] و فارس.

کوردە براخۆییەکان لە نەوەی "بود"ن و بنەچەکەیان دوای بود بەم شێوەیە: بود، براخمی گەورە، جاگین، پوران، حوتان، دوسەک، ئاروک، زوراک. براخمی بچووک باپیرە گەورەی هەشت تیرەی "براخۆیی"یە. لە زمانی کوردیدا "براهیم" بە "براخم" بێژە دەکرێ، لەبەرئەوە نەوەکانی برخم بە "براخۆیی" ناسران. براخمی بچووک هەشت کوڕی هەبوو کە ناوەکانیان بەم شێوەیە: کیکان، گۆران، سارون، غوز، مشکان، ئەرمیل، بۆلان و گریشکان. لەگەڵ ڕەوتی سەردەم نەژادی کوڕەکانی براخمی بچووک ئەوەندە زۆر بوون کە هەشت تیرەی جیایان لە براخۆییەوە دروست کرد و هەر تیرەیەک بە ناوی باپیریەوە ناسرا و ناوبانگی دەرکرد. بەم شێوەیە نەوەی کیکان بە کیکانی، نەوەی گۆران بە گۆرانی، نەوەی سارون بە سارونی، نەوەی غوز بە غوزداری، نەوەی مشکان بە مشکانی، نەوەی ئەرمیل بە ئەرمیلی، نەوەی بۆلان بە بۆلانی و نەوەی گریشکان بە گریشکانی ناسرا.

کوردی براخۆیی وەکو تیرەکانی تری کورد لە "ماد" ژیانیان دەبردە سەر و سەرەتا لە سەردەمێکی نادیار واتە چەند هەزار پێش زاین هاتوونەتە ئەو ناوچانەی کە کەوتووەتە باشووری ماد و بە "کوردستان" دەناسرێت. کیکان کوڕی هەرە گەورەی براخمی بچووک بوو، لەبەرئەوە پلەی سەرداری و سەرۆکایەتیی کوردە براخۆییەکان لای کیکان بوو. ڕیشەی هەشت کوڕی براخمی بچووک بەم شێوەی خوارەوەیە:

ا- کیکان، زوراک، سەنگین، ئارین، پندران، داخور، زیبار، ئومران، سەنگین، خومان، کیکان.

ب- گۆران، شیدان، باشمان، دلوت، زینل. تەکش، کاش، شیدان، کوساد، باشمان، گۆران.

پ- سارون، زیدەک، باشوک، کورتی، لاسین، مامش، دوسەک، سارم، باسیر، داخور، زاخو.

ت- غوز، ئەورام، راسن، دوغان، کاتێن، گیوەر، غوز، گوروس، ماهەک، روچاپ، مهران.

ج- مشکان، ئەیلە، ئوکی، مشک، ئەیلە، باشار، مرداس، گیلەک، توراب، کویان، مشکان.

چ- ئەرمیل، مەرزەک، زروان، کویان، مەنگور، سابول، مەرزەک، زروان، کاش، شاول، ئەرمیل.

ح- بۆلان، زینل، بوزیک، کازان، مەلیل، کارچی، شاگان، شوهان، کرماج، بوزیک، بۆلان.

خ- گریشکان، بەروز، باسیر، گیژ، بولاک، بەروز، گریشکان، کرەجک، ماخان، چرموک، لەرزین.

## دەوڵەتی ماد

کاتێ "گرشاسپ" دوا پاشای بنەماڵەی پیشدادییەکان دنیای فانیی بەجێ هێشت، وڵاتی ماد و پارس دووچاری باری شڵەژاوی و بێهێزی و پاشاگەردانی بوو. ئەم بارودۆخە بووە هۆی پەشۆکاوی و ترسانی سەرۆک هۆزەکانی ماد و پارس. لە ئەنجام، هەموو سەران و سەرداران و ریشسپییەکان لە دانیشتنێکدا کۆ بوونەوە و دوای ڕاوێژکاری لەناو خۆیاندا بە گشتی بڕیاریان دا کە کەیقوبادی کوردی ماد کە سەرۆکی گشتیی هۆزەکانی ماد بوو، لە جێگەی گرشاسپ لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی جێنشین بکەن.

بەم شێوەیە، کەیقوباد لە ساڵی ۸۵۳ی پێش زاین، هاتە سەر تەختی ماد و پارس. لەو کاتەدا، کوردە براخۆییەکان بە تیرەیەکی بەهێز و ئازای کورد دەژمێردرا و میر کیکان وەکو سەرۆکەکانی تری کورد، سەرۆکی گەورەی هۆزەکەی واتە کوردی براخۆیی بوو و لەگەڵ حەوت سەرۆکی تری تیرەکانی کوردی براخۆیی، واتە: میر گۆران گۆرانی، میر زاخو سارونی، میر مهران غوزداری، میر مشکان مشکانی، میر ئەرمیل ئەرمیلی، میر بۆلان بۆلانی و میر لەرزین گریشکانی، هەموو کات بۆ هاوکاریی کەیقوبادی پاشای ماد ئامادەساز بوون و لە ئیشوکاری سەڵتەنەتەکەدا، یارمەتی و هاوەڵییان دەکرد.

## شەڕی نێوان ماد و توران

ئەفراسیاب پاشای توران لە ڕووی میراتەوە خۆی بە میراتگری ڕەوای سەڵتەنەتی پیشدادییەکان کە لە ماد و پارس پێک هاتبوو دەزانی و زۆری پێ قەڵس بوو کە کەیقوبادی کوردی ماد بە فەرمانڕەوای ماد و پارس هەڵبژێردراوە. هەر بۆیە،

ئالای دژایەتیکردنی بەرز کردەوە و لە ئاکامدا شەڕی توران لەگەڵ ماد دەستی پێ کرد. کەیقوبادیش کاتێ دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی گرتە دەست، بەر لە هەموو شتێک بۆ لەناوبردنی ئەفراسیاب بەڕێ کەوت و لە یەک شەڕدا توانی شکستی پێ بدات و ئەفراسیاب داوای ئاشتی بکات. دوای ئاشتی، کەیقوباد لە تەک سەربازەکانی لە "بەلخ" پایەتەختی سەڵتەنەتی تورانەوە گەڕایەوە ماد.

لەم شەڕەدا، هەموو تیرە و هۆزەکانی کورد هاوکاری و هاوەڵیی کەیقوبادیان کرد. کاتێک کەیقوباد گەیشتە "زەرەنگ"، فەرمانی بە سەرۆکەکانی کوردە "براخۆیی"یەکان دا هێرش بەرنە سەر ولایەتی توران و سەرۆکەکانی کوردە "ئەدرەگانی" و "ماملی" و "کرمانی"یەکان هێرش بەرنە سەر ولایەتی مەکران و بە زەبری شمشێر داگیریان بکەن. ئەم دوو ولایەتە هەردووکیان لە ولایەتەکانی وڵاتی توران بوون.

پاش ئەوەی ئەم سەرۆکانەی باسمان کردن ئەم ولایەتانەیان داگیر کرد و سەرکەوتن و کامەرانییان بەدەست هێنا، کەیقوباد میرنشینی تورانی دا بە میر کیکان براخۆیی و میرنشینی مەکرانی دا بە میر ئەیلە ئەدرەگانی. کوردە براخۆیی و ئەدرەگانییەکان تا ڕووخانی سەڵتەنەتی دەستەی ماد لەم ولایەتانە فەرمانڕەواییان دەکرد.

دەستەی کوردە مادەکان تا شەش پشت لەسەر تەختی سەڵتەنەتی ماد و پارس فەرمانڕەواییان کرد کە ناوەکانیان بەم چەشنەیە: کەیقوباد، کەیکاووس، توس کە بە "کەیخەسرۆ"ش ناسراوە، فەریبورز، کواکسار و ئازدیاک.

## سەرۆکە هاوچەرخەکانی

## تیرەکانی کوردی براخۆیی و پاشاکانی ماد

کەیقوباد یەکەم پاشای بنەماڵەی ماد بوو و لە سەردەمی سەرەتایی فەرمانڕەواییەکەدا، ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر کیکان کیکانی، میر گۆران گۆرانی، میر زاخو سارونی، میر مهران غوزداری، میر مشکان مشکانی، میر ئەرمیل ئەرمیلی، میر بۆلان بۆلانی و میر لەرزین گریشکانی.

بەپێی ئەوەی کەیقوباد تەمەنی درێژ بووە، سەردەمی فەرمانڕەواییەکەیشی لە ماوەیەکی دوور و درێژ پێک هاتووە. بۆیە، لە دوا سەردەمی فەرمانڕەواییەکەیدا ئەم میرانەش لە تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر زوراک کیکانی، میر کرمجک گۆرانی، میر سەلدوز سارونی، میر کیتون غوزداری، میر مرداس مشکانی، میر مشکان ئەرمیلی، میر باجەل بۆلانی و میر تادی گریشکانی.

دوای ئەوەی کەیقوباد کۆچی دوایی کرد، کوڕەکەی، کەیکاووس هاتە سەر تەختی سەڵتەنەت و ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر وشتاب کیکانی، میر شادین گۆرانی، میر شاگین سارونی، میر کاشک غوزداری، میر کرمجل مشکانی، میر خومان ئەرمیلی، میر پوران بۆلانی و میر زیدان گریسکانی. کەیکاووس بە وەجاخ کوێری کۆچی دوایی کرد، لەبەرئەوە هۆزەکانی کوردی ماد "توس"ی کوڕی فەریبورزیان بە سەرۆکی گشتیی سەڵتەنەتی ماد هەڵبژارد. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی ئەو بوون: میر زگرین کیکانی، میر کاش گۆرانی، میر سابول سارونی. میر کیچان غوزداری، میر گڵباگ مشکانی، میر کلەجک ئەرمیلی، میر خومان بۆلانی و میر بروش گریشکانی.

دوای ئەوەی توس دنیای فانیی بەجێ هێشت، کوڕەکەی، "فەریبورز" هاتە سەر تەختی سەڵتەنەت. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر زیبار کیکانی، میر رامین گۆرانی، میر سورچن سارونی، میر مانور غوزداری، میر توراب مشکانی، میر کرماج ئەرمیلی، میر کیتون بۆلانی و میر پازو گریشکانی. فەریورز لە شەڕی "ئاشووری"یەکاندا کوژرا. پاشان سەرانی کورد "کواکسار"یان هێنایە سەر تەختی فەرمانڕەوایی کە پێنجەمین پاشای بنەماڵەی کوردە مادەکان بوو لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی ماد و پارس فەرمانڕەوایی بکات. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر براخم کیکانی، میر بوغاز گۆرانی، میر مانی سارونی، میر گاور غوزداری، میر مانور مشکانی، میر گورەن ئەرمیلی، میر ترمان بۆلانی و میر تاپین گریشکانی.

دوای ئەوەی کواکساریش کۆچی دوایی کرد، کوڕەکەی، "ئازدیاک" هاتە سەر تەختی سەڵتەنەتی ماد کە دوا پاشای بنەماڵەی کوردە مادەکان بوو و بە هۆی لێنەهاتوویی تەختەکەی لە دەست دا. ئەم تیرانەی کوردی براخۆیی هاوچەرخی

بوون: میر گۆران کیکانی، میر راسن گۆرانی، میر شوهان سارونی، میر مهران غوزداری، میر بەیکەر مشکانی، میر کوساد ئەرمیلی، میر حەکار بۆلانی و میر خیزان گریشکانی.

## ڕووخانی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی کوردە مادەکان

بنەماڵەی ماد لە ماد و پارس نزیکەی ۳۰۰ ساڵ فەرمانڕەواییان کرد. کەیقوباد بناخەی سەڵتەنەتەکەی دامەزراند و کەیکاووس، توس، فەریبورز و کواکسار پلە و پایە و مەزنایەتیی وڵاتەکەیان بە لووتکە گەیاند. بەڵام ئازدیاک بووە هۆی ڕووخانی دەسەڵاتی بنەماڵەکە. ئەمەش لەبەرئەوەی کەسێکی لێنەهاتوو و بێهێز بوو و نەیدەتوانی ئیشوکاری سەڵتەنەتەکە بەڕێوە ببات. لەگەڵ ئەوەشدا، ستەمکاری و ئازاردانی خەڵکی بە بەشێک لە ڕابواردنی خۆی دەزانی. خەڵک بە دەستییەوە دەیان ناڵاند و خۆشیان نەدەویست. بە بینینی ئەمە، میران و سەردارانی ماد و پارس لەگەڵ یەکتردا ڕاوێژیان کرد و بڕیاریان دا ئازدیاک لەسەر کار لابەرن و لەبەرئەوەی ئازدیاک هیچ کوڕی نەبوو بە "کوورش"ی هەخامەنشی کە کچەزای ئازدیاک بوو پێوەست بوون.

بەم شێوەیە، دەوڵەتی ماد کە بە هۆی هەنگاو و کردەوەکانی کواکسار بەوپەڕی شکۆمەندی و دەسەڵات گەیشتبوو ئازدیاکی جێنشینی نەیتوانی خۆی بە شایانی ئەم هەموو ماڵ و دارایییە بسەلمێنێ. بۆیە ستەمکارییەکانی وردە وردە لە ڕادەبەدەر چوو، سەرۆکەکانی سوپاش دڵیان لێ سارد بووەوە. لە ئەنجام، لەبەرئەوەی ئازدیاک کوڕی نەبوو، کوورشی هەخامەنشییان هێنایە سەر تەختی ماد.

## بنەماڵەی هەخامەنشییەکان

"هەخامەنش" یەکەم پاشای زنجیرەی پاشایەتیی بنەماڵەی هەخامەنشییەکان بوو و بە هۆی ناوی ئەوەوە بنەماڵەکەی بە ناوی "هەخامەنشی" ناوبانگی دەرکرد. لە سەرەتا، ئەم بنەماڵەیە لە "پارس" پاشایەتییان دەکرد و باجدەری دەوڵەتی ماد بوون. لە سەردەمی پاشایەتیی ئازدیاکدا، "کەمبوجی"ی هەخامەنشی فەرمانڕەوای پارس بوو کە ئازدیاک کردی بە زاوای خۆی و لەم نێوانەدا کوڕێک چاوی بە دنیا

هەڵهێنا کە ناوی "کوورش"یان لێ نا.

لەو کاتەدا، وەزیری ئازدیاک، "ئەرپاک"، بینی کاروباری وڵاتەکەی بەرەو ڕووخان دەچێت و لە ئازدیاک پاڕایەوە و داوای لێ کرد کاروباری سەڵتەنەتەکە بهێنێتەوە سەر باری ئاسایی. بەڵام ئەو مرۆڤێکی نەشیاو بوو، هەموو کات خەریکی ڕابواردن و یاری بوو و هۆشی نەدەدایە کاروباری وڵاتەکە. ئەرپاکیش دڵی لێی ڕەش بوو و خۆی لە بەرهەڵستکارەکانی ئازدیاک نزیک کردەوە. لە ئەنجام، سەران و میران و گەورانی کوردی ماد و پارس لە دانیشتنێکی تایبەتدا بە ئیمزای خۆیان نامەیەکی نهێنییان بۆ کوورش کوڕی کەمبوجی و نەوەی ئازدیاک نووسی و تێیدا بۆ فەرمانڕەواییکردنی ماد و پارس بانگهێشتنیان کرد. لە نامەکەدا پێیان ڕاگەیاند کە بە سوپایەکی بچووکەوە خۆی بگەیەنێتە نزیکی "ئەکباتان" پایەتەختی ماد، بۆ ئەوەی لەشکری کوردەکان بەگەڵی بکەون و پاشان لەسەر تەختی پاشایەتیی دابنێن.

کاتێک ئازدیاک ئاگەداری ئەم هەواڵە بووەوە، زۆر تووڕە بوو و خۆی بە لەشکرێکی زۆرەوە بەرەو پایەتەختی کوورش کەوتە ڕێ. شەڕێکی سەخت لە نێوان هەردوولا دەستی پێ کرد، بەڵام ئازدیاک هەر لە سەرەتای شەڕەوە شکستی خوارد و گرتیان. بەم شێوەیە، دەوڵەتی ماد ڕووخا و پاشایەتیی ماد و پارس لە مادەکانە و هاتە دەست هەخامەنشییەکان و زنجیرەی فەرمانڕەوایی هەخامەنشی لەسەر وڵاتی ماد و پارس دەستی پێ کرد.

## هەڵسوکەوتی هەخامەنشییەکان لەگەڵ کوردە مادەکان

دوای ئەوەی کوورش دەسەڵاتی سەڵتەنەتی ماد و پارسی گرتە دەست، بەپێی ئەوەی دایکی کورد بوو و پێوەندیی خوێنی لەگەڵ کوردەکاندا هەبوو، پێوەندیی دۆستانە و برایانەی لەگەڵ کوردەکانی ماد بەست. لەمەش زیاتر، کوردەکانی بە قۆڵ و بازووی بەهێزی خۆی سەیر دەکردن، پلە و پایەی بەرزی شایانەی دایە کەسانی بنەماڵەی پاشایی ماد و شازادەکانی مادی لەناو سوپای خۆیدا بە پلەی سەرداری بەرز ڕاگرت. هەروەها، کچە پووری خۆی واتە کچی "ئەریتما"ی زاوای ئازدیاکی بە ژن خواست.

جگە لەمانە، کوورش هەموو شێوە ڕێکخراوەییەکانی مادی وەکو خۆیان هێشتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی هەست و بیری بێگانەیی و جیاوازی لە نێوان کوردە مادەکان و هەخامەنشییەکاندا پەیدا نەبێت. هەروەها، ڕێز و نەوازشی لە سەران و سەردارانی ماد گرت و پلەی زۆربەیانی بەرز کردەوە. لەم نێوانە، دانی فەرمانڕەوایی کوردە براخۆییەکان لە توران و کوردە ئەدرەگانییەکان لە مەکران نا. بەم شێوەیە، دووەم سەردەمی فەرمانڕەوایی کوردە براخۆیی و ئەدرەگانییەکان لە توران و مەکران دەستی پێ کرد و تا کاتی دەست بەسەرداگرتنی "دارا" لەلایەن "ئەسکەندەر"ەوە، دەوامی هەبوو.

## سەرۆکە هاوچەرخەکانی

## تیرەکانی کوردی براخۆیی و پاشاکانی هەخامەنشی

کوورش بناخەی سەڵتەنەتی هەخامەنشیی لە ماد و فارس دانا. ئەو ئەم سەڵتەنەتەی لە ئەنجامی هاوکاریی کوردە مادەکان بەدەست هێنابوو، لەبەرئەوە نەوازش و ڕێزی لە سەران و میرەکانیان گرت. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی کوورشی گەورە یەکەم پاشای هەخامەنشییەکان بوون: میر زرشان کیکانی، میر ناگان گۆرانی، میر نێرمان سارونی، میر شیشار غورداری، میر گورگین مشکانی، میر باهور ئەرمیلی، میر بوغا بۆلانی و میر سەمبان گریشکانی.

پاش کۆچی دوایی کوورش، کوڕەکەی، کەمبوجی هاتە سەر تەخت و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر زرشان کیکانی، میر ناکان گۆران، میر نێرمان سارونی، میر شیشار غورداری، میر گورگین مشکانی، میر باهور ئەرمیلی، میر بوغا بۆلانی و میر سەمبان گریشکانی.

دوای مردنی کەمبوجی، "دارا" بووە پاشا و ئەم میرانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر زوراک کیکانی، میر دوج گۆرانی، میر هینار سارونی، میر کاشک غوزداری، میر بولور مشکانی، میر ئاماچ ئەرمیلی، میر دەرنیل بۆلانی و میر زیدەک گریشکانی. دوای مردنی، کوڕەکەی، "خشایارشا"

بووە جێنشینی و ئەم میرانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر ئەرجان کیکانی، میر چرموک گۆرانی، میر کابو سارونی، میر دیلەم غوزداری، میر توتک مشکانی، میر کەمبیل ئەرمیلی، میر خیزان بۆلانی و میر پیلار گریشکانی.

دوای کوژرانی، خشایارشا، کوڕەکەی، "ئەردەشێری یەکەم" هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی و ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر شاموز کیکانی، میر کازان گۆرانی، میر مرداس سارونی، میر خەرزان غوزداری، میر دوغان مشکانی، میر باسیر ئەرمیلی، میر مشکان بۆلانی و میر ماخان گریشکانی. دوای ئەوەی ئەردەشێری یەکەم دنیای فانیی بەجێ هێشت، کوڕەکەی "خشایارشای دووەم" هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی کە تەنیا چل و پێنج ڕۆژی ڕەبەق پاشایەتیی کرد، لەبەرئەوەی برای خۆی ئەوی کوشت. بەمجۆرە، لە جێگەی ئەو، "دارای دووەم"ی برای هاتە سەر تەخت. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی ئەم دوو پاشایەی هەخامەنشییەکان بوون: میر براخم کیکانی، میر زینل گۆرانی، میر ریگان سارونی، میرکوساد غوزداری، میر کاتین مشکانی، میر بولاک ئەرمیلی، میر سیکران بۆلانی و میر سارم گریشکانی.

دوای ئەوەی دارای دووەمیش کۆچی دواییی کرد، کوڕەکەی، "ئەردەشێری دووەم" هاتە سەر تەختی فارس و ئەم میرانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر سابول کیکانی، میر گۆران گۆرانی، میر کیتون سارونی، میر مشکان غوزداری، میر زروان مشکانی، میر ئەورام ئەرمیلی، میر ساسون بۆلانی و دارون گریشکانی. دوای مردنی ئەردەشێری دووەم، کوڕەکەی، "ئەردەشێری سێیەم" هاتە سەر تەخت. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر نورگان کیکانی، میر مهران گۆرانی، میر باشوک سارونی، میر بیفل غوزداری، میر بوزیک مشکانی، میر ئوکی ئەرمیلی، میر کەلغل بۆلانی و میر نوغێ گریشکانی. ئەم میرانەی تری تیرەکانی کوردی براخۆیی لە دوا سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەردەشێری سێیەم هاوچەرخی بوون: میر کیانوش کیکانی، میر گیشتار گۆرانی، میر ئیناخ سارونی، میر زەڕین ئەرمیلی، میر لاکور بۆلانی، میر بلباس گریشکانی، میر کرمجل غوزداری و میر براخم مشکانی.

"باگواس" كه كەسێكی خەسێنراو بوو، ژاری دەرخواردی ئەردەشێری سێیەم دا و دوای كوشتنی، هەر لە بنەماڵەی هەخامەنشییەكان پیاوێكی بە ناوی "كدمان" بە نازناوی "دارای سێیەم" هێنایە سەر تەختی فەرمانڕەوایی. ئەم میرانەی تیرەكانی كوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر كیكان كیكانی، میر روشی گۆرانی، میر جاگین سارونی ، میر شادین غوزداری، میر راسن مشكانی، میر نورگان ئەرمیلی، میر بەروز بۆلانی و میر ئاچاك گریشكانی.

## ڕووخانی فەرمانڕەوایی هەخامەنشییەكان

كوورشی مەزن دوای تەختنشینبوونی، بنەماڵەكەی بە ناوی هەخامەنشییەوە ناوبانگی دەركرد. ئەم بنەماڵە پاشاییە تاكو نۆ پشت فەرمانڕەواییان كرد و ناوی پاشاكان بەم چەشنەیە: كوورشی گەورە، كەمبوجی، دارای یەكەم، خشایارشای یەكەم، ئەردەشێری یەكەم، خشایارشای دووەم، دارای دووەم، ئەردەشێری دووەم و ئەردەشێری سێیەم.

پاشاكانی هەخامەنشی توانییان سەڵتەنەتەكەیان زۆر بەرین بكەنەوە و ناوبانگی زۆر دەربكەن. لەگەڵ یۆنانییەكاندا هەموو كات لە شەڕدا بوونە. "فیلقوس" فەرمانڕەوای ولایەتی "مەقدۆنیا" كە یەكێ لە فەرمانڕەوا خۆماڵییەكانی ولایەتەكانی یۆنان بوو، هاوكار و هاوسەرۆكەكانی لەگەڵ خۆی هاودەنگ كرد و یەكەتی و تەبایی پەرە پێ دا و ویستی شەڕ لەگەڵ هەخامەنشییەكان دەست پێ بكات. بەڵام خۆی لە ساڵی ٣٣٧ی پێش زاین لە شەڕێكی ناوخۆی یۆناندا كوژرا. پاشان كوڕەكەی، ئەسكەندەر لە جێگەی ئەو هاتە سەر تەختی مەقدۆنیا و لەگەڵ ولاتی پارس شەڕی دەست پێ كرد و سەركەوتن و كامەرانیی بەدەست هێنا.

"دارای سێیەم" دوا پاشای بنەماڵەی هەخامەنشییەكان دوای شكست خواردن بەدەستی ئەسكەندەر، لە شارێكەوە بۆ شارێكی تر ڕای دەكرد و ئەسكەندەری مەقدۆنیش بەردەوام بەدوایەوە بوو. لە ئەنجام، دارا میر و هاوكارەكانی خۆی لێی بێزار و دڵتەنگ بوون و بۆ ئەوەی لە دەست ئەسكەندەر ڕزگاریان بێت خۆیان بە كوشتیان دا. بەم چەشنە، ئەسكەندەر سەڵتەنەتی فارسی هێنایە ژێر دەسەلاتی خۆی و فەرمانڕەوایی بنەماڵەی هەخامەنشییەكان كۆتایی پێ هات.

## هاتنی ئەسکەندەری مەقدۆنی

ئەسکەندەر دوای کۆچی دوایی فیلقوسی باوکی، هاتە سەر تەختی ولایەتی مەقدۆنیا کە یەکێ لە ولایەتەکانی یۆنان بوو. سەرەتا ولایەتەکانی دەوروبەری هێنایە ژێر دەسەلاتی خۆی و کردنی بە هاوپەیمان و هاودەنگی خۆی. پاشان لە ساڵی ٣٣٤ی پێش زاین ڕووی کردە فارس و دەستی بە داگیرکردنی ناوچەکان کرد. هێزەکانی دارای پاشای هەخامەنشییەکانی یەک لە دوای یەک شکست دا و گەیشتە ولاتی "هیند".

دوای هاتنە ناو هیند، ناوچەی "پەج ئابە"[٦]ی هیندی داگیر کرد و ویستی بەرەوپێش بڕوات و ناوچەکانی تری هیند داگیر بکات. بەلام ئاواتەکەی نەهاتە دی، لەبەرئەوەی سەربازەکانی بە هۆی بڕینی ماوەیەکی درێژ و شەڕی پەیتا پەیتا، ماندوو و بێزار بووبوون و نکوولیان لە چوونە پێشەوە کرد. ئەسکەندەری مەقدۆنیش ناچار بوو بەرەو نیشتمانەکەی خۆی بگەڕێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە، لە ڕێگەی "توران"ەوە هاتە فارس و لەوێوەش چووە ناو "بابل". لە بابل نەخۆش کەوت و هەر لە هەرمتی لاوێتی دنیای فانیی بەجێ هێشت و ئەو سەڵتەنەتە پان و بەرینەی کە خۆی هێنابوویە ژێر دەسەلاتی خۆی، بە بێ سەرۆک بەجێ هێشت.

## پارچەبوونی سەڵتەنەتی ئەسکەندەر

مردنی کتوپڕی ئەسکەندەر و نەبوونی میراتگرێکی تەختەکەی، بووە هۆی کێشەیەکی دوور و درێژ لە نێوان سەرلەشکرەکانی ئەسکەندەر. ئەم کێشەیە تا ماوەیەکی درێژ بەردەوام بوو و سەرلەشکرەکان لە نێوان خۆیاندا چەند شەڕێکی سەختیان کرد و لە ئەنجام گەیشتنە ئەو ئاکامەی کە سەڵتەنەتە پان و بەرینەکەی ئەسکەندەر لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن.

---

٦. ناوی کۆنی "پەنجاب"ە، مانای "سەرزەویی پێنج دەریا" دەگەیەنێ کە ناوەکانیان بەم چەشنەیە: دەریای سند، بیاس، سوتلەج، جیهلەم و چەناب. ئەم ناوچەیە لە سەردەمەکانی کۆندا بە ناوی جیاجیا ناسراوە، وەکو: سەپەت سندهو، هەفت سندهو، پەنجنەد، پەنج ئابە و دوا ناویش پەنجاب. ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٩٤٧ ئەم ناوچەیەیان بەسەر ولاتانی هیند و پاکستاندا دابەش کرد (وەرگێڕ).

بەشی ڕۆهەڵاتی سەڵتەنەتەکە کە لە ناوچەکانی ماد، پارس، توران، مەکران، زابلستان و کابلستان پێکهاتبوو، بەخشرایە سەرلەشکر "سیلوکوس". سەرلەشکر سیلوکوس لە ساڵی ٢١٠ی پێش زاین دەسەڵاتی ئەم وڵاتەی گرتە دەست و تا ماوەیەکی درێژ لەم ناوچانە فەرمانڕەوایی کرد.

بەشی دووەم

## میرنشینی کوردە براخۆییەکان لە توران - خولی یەکەم

کەیقوباد سەرۆکی کوردە مادەکان لە نزیکەی ٨٥٠ ساڵ پێش زاین، دەوڵەتی ماد و پارسی دامەزراند. کەیقوباد لەبەرئەوەی ئەم وڵاتەی بە هێزی قۆڵی شمشێروەشێنە کوردەکانی خۆی بەدەست هێنابوو، تیرە ئازا و خۆبەختکەرە کوردەکانی گواستەوە ئەو ناوچە دوورانەی کە لە سنووری وڵاتەکانی ترەوە نزیک بوون. ئەمەش بە مەبەستی ئەوەی کە بە خاترجەمی پارێزگاری سنوورەکانی وڵاتەکەیان بکەن و لە هەموو لایەکەوە بە زوویی بەرگری لە هاتنە پێشی دوژمنانی دەوڵەت بکەن و دەستدرێژیی دوژمن بنکۆڵ بکەن و سەڵتەنەتەکەیان لەم چەشنە زیانانە بپارێزن.

کەیقوباد تیرەکانی مادی بەرەو گشت لایەکی وڵاتەکەی بڵاو کردەوە. تیرەی "پارتاسنی" بۆ ناوچەی لێوارەکانی دەریای "خەزەر" گواستەوە و لەوێ نیشتەجێیانی کرد، تیرەی "بوز" بە فەرمانی ئەو لە ناوچەی "هەمەدان" نیشتەجێ بوون، تیرەی "ئەستروشات" لە ناوچەی "سەمەرقەند" و "خارەزم" نیشتەجێ بوون، تیرەی "ئاری زانت" لە "ئازەربایجان" نشینگەی خۆیان پێک هێنا، تیرەی "بودی" کە لە دوو تیرەی براخۆیی و زەنگەنە پێکهاتبوو بەرەو لای خوارووی ڕۆئاوا کۆچیان کرد و لە ناوچەی "توران" و "مەکران" کە لکاوە بە ناوچەی "سندان"ەوە نیشتەجێ بوون. سێ تیرەی تری کورد کە بە ناوی "ئەدرەگانی"، "ماملی" و "کرمانی" دەناسران هاتنە مەکران و لەوێ نیشتەجێ بوون.

کەیقوباد دوای شکستدانی ئەفراسیاب پاشای توران و ڕووخاندنی دەسەڵاتداری ئەو لە وڵاتەکەیدا، زۆربەی هەرێمەکانی ئەم وڵاتەی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی و کوردی لەو شوێنانەدا ئاوا کرد. ئەوە بوو کوردە براخۆییەکانی لە توران و کوردە ئەدرەگانی، ماملی و کرمانییەکان لە مەکران نشینگەیان پێک هێنا و بۆ هەموو کات نیشتەجێ بوون. تیرەی کوردی براخۆیی لەو کاتەدا لە

بەرەی هەشت کوڕی براخمی بچووک، واتە: کیکانی، گۆرانی، سارونی، غوزداری، مشکانی، ئەرمیلی، بۆلانی و گریشکانی پێکهاتبوو. کیکان کوڕی گەورەی براخمی بچووک بوو، لەبەرئەوە پلەی سەرۆک و سەرداریی تیرەی کوردە براخۆییەکان درا بە بنەماڵەی "کیکان". هەروەها، کاتێ دەوڵەتی ماد دامەزرا، بەڕێوەبەرایەتیی تورانیش لەلایەن کەیقوبادەوە درا بە ئەوان واتە بە میر کیکان کیکانی کە لەو کاتەدا میری مەزنی کوردە براخۆییەکان بوو.

## ١- میر میران میر "کیکان"

دیوانی بولک:

کاتێک میر کیکان دەسەڵاتی میرنشینی تورانی گرتە دەست، بۆ بەڕێوەبردنی ئیشوکاری دەوڵەتی، "دیوان"ی دەسەڵاتداریی بە ناوی "دیوانی بولک" دامەزراند. لەم دیوانەدا، سەرۆکی هەموو تیرەکانی براخۆیی، واتە کیکانی، گۆرانی، سارونی، غوزداری، مشکانی، ئەرمیلی، بۆلانی و گریشکانی ئەندام بوون.

یارمەتیدانی کەیقوباد پاشا:

کەیقوباد دوای هاتنە سەرکاری، ویستی وڵاتەکەی لە ستەم و کارە ناڕەواکانی پاشاکانی "ئاشوور" ڕزگار بکا. بۆ ئەم مەبەستە، لەگەڵ "بلازیس" پاشای "کلدانی" کە ئەویش لە دەست دەستدرێژیی ئاشوورییەکان هەراسان بووبوو یەکیان گرت و هەردوو پاشا بە نیازی لەناوبردنی دەسەڵاتی ئاشوورییەکان و تاڵانکردنی پایەتەختی ئاشوور واتە "نەینەوا" بەڕێ کەوتن.

پێش ئەوەی شەڕ دەست پێ بکا، میر کیکان میری توران هەواڵی پێ گەیشت و لەشکرێکی لە سەربازانی کوردە براخۆییەکان کە لە سەربازی تیرەی کیکانی و هەروەها سەربازی تیرەکانی ئەدرەگانی، ماملی و کرمانی پێکهاتبوو بۆ یارمەتیدانی کەیقوباد بەڕێ کرد. ئەم لەشکرە لە دەرەوەی شاری نەینەوا ڕووبەڕووی لەشکری ئاشوورییەکان بووەوە و سێ جار شەڕ کرا و هەرسێ جاریش لەشکری ئاشوورییەکان شکستی خوارد. کەیقوباد بە سەرکەوتوویی و کامەرانی گەڕایەوە. خەڵکانی ئەم تیرانەی کوردە براخۆییەکان نەگەڕانەوە توران و مەکران، بگرە لەگەڵ کەیقوباد چوونە "ماد" و هەر لەوێش نیشتەجێ بوون.

چاککردنەوەی قەڵای "کیکان" و "مساتنک":

لە کاتی شەڕی نێوان تورانییەکان و مادەکان، قەڵای "کیکان"، "غوزدار"، "نغان"، "مساتنک" و "گل گالا" تێک درابوون. میر کیکان وێرانەی ئەم قەڵایانەی چاک کردەوە، چونکە نهێنیی پاراستن و بەهێزیی بەرگری لە قەڵای پتەودایە. پاشان میر کیکان سەربازی تێیاندا دامەزراند.

میر کیکان هاوچەرخی کەیقوباد پاشای ماد بوو و ئەم میرانەی تیرەکانی تری کوردی براخۆییش هاوچەرخی بوون: میر گۆران گۆرانی، میر زاخو سارونی، میر مهران غوزداری، میر مشکان مشکانی، میر ئەرمیل ئەرمیلی، میر بۆلان بۆلانی و میر لەرزین گریشکانی.

## ٢- میر میران میر "زوراک"

دوای کۆچی دوایی میر کیکان، کوڕەکەی، میر زوراک هاتە سەر تەختی میرنشینی توران. میر زوراک زۆر زانا و تێگەیشتوو بوو و لە بەڕێوەبەرایەتیی ئیشوکاری وڵات بێ هاوتا بوو. کاتێ میرنشینی توران هاتە ژێر دەسەڵاتی ئەو، بە مەبەستی ڕاژەکاریی جوانتری هەرێمەکانی توران، تیرەکانی کوردی براخۆیی لە ناوچە جۆرەوجۆرەکانی توران بڵاو کردەوە بۆ ئەوەی خەریکی کشتوکاڵ بن و ببنە هۆی ئاسوودەیی دانیشتوانی توران.

دابەشکردنی هەرێمەکانی توران

میر زوراک ناوچەی سەرووی توران کە بە "بنجیر" دەناسرا دایە تیرەی کیکانی و گۆرانی، دوای نیشتەجێبوونی ئەوان، ناوچەکە بە "کیکانان" ناوبانگی دەرکرد. ناوچەی ناوەڕاستی توران کە بە "کوهینار" دەناسرا دایە تیرەکانی غوزداری، سارونی، گریشکانی و مشکانی. دوای نیشتەجێبوونی ئەم تیرانە، شارەکە بە "غوزدار" ناوبانگی دەرکرد. ناوچەی خوارووی توران کە بە "سناربیل" دەناسرا دایە تیرەی ئەرمیلی و لەگەڵ ڕەوتی سەردەم و بە هۆی نیشتەجێبوونی ئەوان، ئەم ناوچەیە بە "ئەرمابیل" ناوبانگی دەرکرد. هەروەها، تەنگەی "دەرەنگان" کە کەوتووەتە شاخاویی "کیکانان" دایە تیرەی بۆلانی و دوای نیشتەجێبوونی ئەوان، ناوی "دەرەنگان" گۆڕا و بوو بە "بۆلان".

کۆچی دواییی کەیقوباد پاشای ماد و پارس:

لە سەردەمی فەرمانڕەواییی میر زوراک، کەیقوباد پاشای ماد و فارس لەساڵی ٧٥٩ی پێش زاین کۆچی دواییی کرد و پێنج کوڕی لە دوای خۆیدا بەجێهێشت کە ناوەکانیان بەم چەشنەیە: کەیکاووس، کیاپو، کیاشەر، کیارمێن و کیابشێن. میر و گەورانی وڵات، کوڕە گەورەکەی واتە کەیکاووسیان لەسەر تەخت جێنشین کرد.

هێرشی فەرمانڕەوای "سندان" بۆ سەر توران و شکست خواردنی:

فەرمانڕەوای "سندان"، "سنگهار" بە کتوپڕی لە تەنگەی "دەرەنگان"ەوە هێرشی هێنایە سەر "کیکانان" ناوچەی سەرووی توران. لەشکری کوردە براخۆییەکان لە نیوەی ڕێگە لە تەنگەی دەرەنگان ڕێگەیان لە دوژمن گرت. دوای شەڕێکی سەخت، شکستیان دان و جگە لەوانەی هەڵاتن و بە سەلامەتی دەرچوون، هەموو ئەوانی تریان کوشت.

باسی ڕۆستەمی پاڵەوان:

گێڕەوەکان دەگێڕنەوە کە "ڕۆستەم"ی پاڵەوان هاوچەرخی میر کیکان و میر زوراک بووە. "زاڵ"ی باوکی و "سام"ی باپیری میری "زابلستان" بوونە. ڕۆستەمی پاڵەوان سەرەتا لەگەڵ ئەفراسیاب پاشای توران پێوەندیی دۆستانەی هەبووە و لە سەرەتای سەڵتەنەتی "ماد" و "پارس"یشدا پشتیوانیی لە ئەفراسیاب کردووە و دژی کەیقوباد پاشای ماد جەنگاوە. زاڵ باوکی ڕۆستەم لە سەردەمی دەسەڵاتداریی خۆیدا بە دەستی کەیقوباد شکستی خواردبوو و پەنای بۆ ئەفراسیاب بردبوو.

زاڵ لەگەڵ ڕۆستەمی کوڕی ماوەیەک لای ئەفراسیاب دەمێننەوە، بەڵام لەم نێوانە ئەفراسیاب لە زاڵ زیز دەبێ و زاڵیش ڕوو لە کەیقوباد دەکاتەوە. کەیقوباد دەیکاتە هاوڕێی خۆی و لە دوا شەڕی نێوان ماد و توران، زاڵ یارمەتیی کەیقوبادی دا و دژی لەشکری تورانییەکان جەنگا. وڵاتی توران لەم شەڕەدا شکستی خوارد و کەیقوباد لە زاڵ ڕەزامەند دەبێت و میرنشینی میراتیی زابلستانی دەداتەوە دەست.

هێرشی میری سندان بۆ جاری دووەم:

"سنگهار مومیدان" فەرمانڕەوای "سندان" لە شکستی جاری یەکەمی پەندی وەرنەگرت و جارێکی تر هێرشی هێنایە سەر خاکی توران. ئەمجارەیان لە تەنگەی "جالیران"ەوە هاتە ناو خاکی توران و لە دۆڵی جالیران شەڕێکی سەخت لە نێوان کوردە براخۆیی و لەشکری "جدگال"ەکان ڕووی دا. دوای پێکدادانێکی سەخت، شەڕەکە دەبێتە تەن بە تەن و میر زوراک فەرمانڕەوای سندان میر سنگهار لە سواری هەسپ فڕێ دەداتە خوارێ، سەری دەبڕێ و بە نێزەکەی بەرزی دەکاتەوە. لەشکری دوژمن کاتێ میرەکەیان بە سەربڕاوی دەبینن، لە شەڕ بێ دڵ دەبن و ڕادەکەن. لەم شەڕەدا، زۆربەی سوپای دوژمن کوژران و لەناوچوون.

کۆچی دوایی میر زوراک:

میر زوراک هاوچەرخی کەیقوبادی کوردی ماد و پاشای ماد بوو و چەند ڕۆژ دوای کۆچی دوایی کەیقوباد، ئەویش دنیای فانیی بەجێ هێشت. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی میر زوراک کیکانی و کەیقوباد پاشا بوونە: میر کرەجک گۆرانی، میر سەلدوز سارونی، میر کیتون غوزداری، میر مرداس مشکانی، میر مشکان ئەرمیلی، میر باجەل بۆلانی و میر تادی گریشکانی.

۳- میر میران میر "وشتاب"

میر زوراک دوای ٤٤ ساڵ فەرمانڕەوایی، کۆچی دوایی کرد و کوڕەکەی، میر "وشتاب" هاتە سەر تەختی توران. وشتاب پیاوێکی بە ڕەوشت و ئاکار چاک بوو، دادپەروەریی کردبووە ڕێبازی خۆی و لەگەڵ خەڵکدا زۆر چاکەی دەکرد. بەم شێوەیە، هەموو تەمەنی خۆی لە خزمەتی خەڵکدا بەسەر برد و بۆ ماوەی ٤٥ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد.

میر وشتاب هاوچەرخی کەیکاووس فەرمانڕەوای ماد و پارس بوو و ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاونەژاد و هاوپلە و هاودەم و هاوچەرخی بوون: میر شادین گۆرانی، میر شاگین سارونی، میر کاشک غوزداری، میر کرەجل مشکانی، میر خومان ئەرمیلی، میر پوران بۆلانی و میر زیدان گریسکانی.

### ٤- میر میران میر "زگرین"

پاش کۆچی دوایی میر وشتاب، سەرۆکەکانی کوردی براخۆیی میر "زگرین" کوڕی میر وشتابیان بە پلەی میر میران هەڵبژارد. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا، کەیکاووس پاشای ماد بە وەجاخ کوێری کۆچی دوایی کرد و لە نێوان کوردەکان لەمەڕ هەڵبژاردنی پاشای ماد جیاوازیی بیروڕا و ناکۆکی پەیدا بوو و تیرە کوردەکان بە یەکدا هەڵچوون. ئەمەش لەبەرئەوەی دوای مردنی کەیکاووس، دوو کەس: "لهراسپ" زاوای کەیکاووس و "توس" کوڕی "فەریبورز" لە ژیاندا بوون و کوردەکان کێشە و حەفت و هەشتی ئەوەیان بوو کێ لەم دوو کەسە بە سەرۆکی سەڵتەنەتی ماد هەڵبژێرن.

لە نێوان ئەم دوو کەسەدا، لهراسپ هەرچەند نەوەی کوڕی کەیقوباد و زاوای کەیکاووس بوو، بەڵام مرۆڤێکی بە ئەزمون و کارزان و لێهاتوو نەبوو و لە سیاسەت و بەڕێوەبردنی سەڵتەنەت سەری دەرنەدەبرد. ئەمەش بووبووە هۆی ئەوەی لەنێو کۆمەڵگەدا مرۆڤێکی پەسندکراو بەدەنگ نەبێت. بە پێچەوانە، توس کوڕی فەریبورز مرۆڤێکی زانا و ڕۆشنبیر و سیاسەتوان بوو و کوردەکان ئەویان بە سەرۆکی سەڵتەنەت هەڵبژارد. لهراسپ لە ڕووی میراتەوە خۆی بە حەقتر و لە پێشتر دەزانی و ملکەچی فەرمانڕەوایی توس نەبوو.

لە ئەنجام، کوردەکان ئەم دووانەیان بەو چەشنە لەگەڵ یەک هاودەنگ کرد کە بڕیاریان دا فەرمانڕەوایی هەرێمی "باختەر" و "کابلستان" بدەنە لهراسپ. پاش ئەوەی دەسەڵاتی ئەم دوو هەرێمەیان بە لهراسپ سپارد، کێشەی نێوان لهراسپ و توس کۆتایی پێ هات و کە لهارسپیش کۆچی دوایی کرد، پاشایەتیی ئەم هەرێمانە لە ڕووی میراتەوە جارێکی تر هاتنەوە ژێر دەسەڵاتی توس.

کوردە براخۆییەکانی توران و کوردە ئەدرەگانی، ماملی و کرمانییەکانی مەکران لەم کێشەیەدا پشتیوانی و لایەنگریی توس پاشایان کرد و هیچ پێوەندییەکیان بە لهراسپەوە نەبوو.

هێرشی دادگەری سندان بۆ سەر توران:

نیو سەدە بەر لە تەختنشینی میر زگرین، میر سنگهار مومیدان هێرشی هێنایە

سەر توران، لە شەڕ شکستێکی ئابڕووبەرانەی خواردبوو و ڕێگەی هەڵاتنی گرتبووە بەر. "ماتان" کە کوڕی نەوەو ئەو بوو لە سەردەمی میر زگریندا دەیویست ئەو پەڵە ئابڕووبەرانەی باپیری لابدات و تۆڵەی شکانەکەی بکاتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش، زۆر بە نهێنی خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد. لەو کاتەدا، هەواڵدەرانی کوردە براخۆییەکان کە لەسەر سنوورەکانی توران دامەزرابوون، میر زگرینیان لە مەبەستی ماتان ئاگەدار کردەوە.

میر زگرین لەگەڵ سەرۆکەکانی تیرەکانی کوردی براخۆیی راوێژی کرد و سەربازە کوردەکانی لە دەوروبەری هەموو ئەو سنوورانەی توران کە بە سنووری سندانەوە لکابوو بڵاو کردەوە. میر زگرین ئەم گواستنەوە و دامەزراندنەی بە نهێنی ئەنجام دا بۆ ئەوەی نەزاندرێ کە کوردەکان بە مەبەستی شەڕ لە دەوروبەری سنوورەکان بڵاو بوونەتەوە. سەرهەنگانی لەشکر تیرهاوێژی بە ئەزموونیان لە تەنگەکانی سەر سنوور دامەزراند و ئەم پیلانە شەڕیەیان دانا کە کاتێک لەشکری سندان هاتە ناو خاکی توران، کوردەکان ڕابکەن، بۆ ئەوەی دوژمن وا گومان بکەن کە کوردەکان شکستیان هێناوە و بە خاترجەمی و بێ ترس بێنە ناوەوەی وڵات و گەمارۆدانیان ئاسان بێت.

لە ئەنجام، لە وەرزی گەرمای ساڵی ۷۰۰ی پێش زاین، ماتان لەگەڵ لەشکرەکەی هێرشی هێنایە سەر خاکی توران و لەشکری کوردەکان پاشەکشەیان کرد. ئەم فێڵەی کوردەکان سەری گرت و سەربازەکانی دوژمن هەستیان پێ نەکرد و بە شوێنی کوردەکان کەوتن تا هاتنە ناو کەژەکان. ئینجا کوردە براخۆییەکان لێیان وەرگەڕانەوە، وەکو کوللە و مێرووله ڕژانە سەر جدگالەکان، لە هەموو شوێنێکەوە گەمارۆیان دان و ماتان و گشت سەبازەکانیان کوشت. کاتێ کوڕی ماتان، "بەنگان" کە لە دەوروبەری "ئەرمابیل" خەریکی شەڕ بوو ئەم هەواڵەی بیست، لەباری پەشۆکاویدا، مەیدانی شەڕی بەجێ هێشت و بەرەو سندان هەڵاتەوە. هەرچەند میر کلەجک ئەرمیلی، میر سابول سارونی و میر کیچان غوزداری ڕێگەی هەڵاتنیان لێ گرتبوو، بەڵام ژیان هێشتان لە چارەنووسیدا مابوو و توانی لەگەڵ چەند خۆبەختکەرێکی خۆی بە برینداری هەڵبێ و بە سەلامەتی گەیشتەوە وڵاتەکەی خۆی.

ئەم شەڕە سەختە بە شێوەیەک ترسی دلێری و ئازایی و بە وەیی و قارەمانی و جوامێریی کوردە براخۆییەکانی خستە دڵی فەرمانڕەواکانی سندان کە لە سەردەمەکانی دوایی خوو و نەریتی شەڕ و پێکدادان لەگەڵ کوردەکان واز لێ بهێنن و پێوەندیی دۆستانەیان لەگەڵدا ببەستن. ئەمەش لە ئاکام بووە هۆی ئەوەی هاتوچۆ و بازرگانی لە نێوان کوردەکان و جدگالەکان دەست پێ بکات.

کۆچی دوایی میر زگرین:

میر زگرین دوای بەسەربردنی ٣٥ ساڵی شەڕوانانە، بارگەی لە دنیای فانی پێچایەوە. میر زگرین لەگەڵ توس کە بە "کەیخەسرۆ"ش دەناسرێ هاوچەرخ بووە. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی براخۆییش هاوچەرخی بوون: میر کاش گۆرانی، میر سابول سارونی، میر کیچان غوزداری، میر گلباگ مشکانی، میر کلەجک ئەرمیلی، میر خومان بۆلانی و میر بروش گریشکانی.

٥- میر میران میر "زیبار"

دوای کۆچی دوایی میر زگرین، کوڕەکەی، میر "زیبار" هاتە سەر تەختی میرنشینی توران. میر زیبار پیاوێکی زانا و زیرەک و زرنگ و کارا بوو و لە هونەری شەڕدا شارەزایی تەواوی هەبوو. میر زیبار نەیدەویست ڕووداوی وەک ئەو شەڕانەی کە لە سەردەمەکانی پێشوودا لە نێوان توران و سندان ڕووی دابوو جارێکی تر ڕوو بدەنەوە و نەتەوەی کوردی توران بۆ هەموو کات لەم چەشنە دەستدرێژکەرییانەی هێرشهێنەری دەرەکی سەلامەت بن. بۆ ئەم مەبەستەش، لەسەر سنوورەکانی ڕۆهەلاتی توران کە لکابوون بە سنووری سندان، سەرا و سەنگەری دروست کرد و سەربازی کوردی تێدا نیشتەجێ کرد کە شەو و ڕۆژ ئێشکیان دەگرت و هەردەم پاسەوانیی ناوچەکەیان دەکرد.

کۆچی دوایی توس (کەیخەسرۆ) پاشای ماد:

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی میر زیبار، توس پاشای ماد و پارس جیهانی فانیی بەجێ هێشت و کوڕەکەی، "فەریبورز"، هاتە سەر تەختی سەڵتەنەت.

دروستکردنی پەرستگەی "زۆراک" لە کیکان:

کاتێک کە میر زیبار میر میرانی توران بوو، فەریبورز پاشای ماد و پارس بوو. فەریبورز دووربین و دووربەندێش و سەخی و بە تەگبیر بوو. پێوەندییەکی بەهێزی لەگەڵ ئاینەکەیدا هەبوو و ناوەندی ئاینی "زەردەشت" کە تا سەردەمی فەرمانڕەواییی ئەو لە "بەلخ" بوو، گواستەوە "ئەکباتانا" پایەتەختی ماد.

میر زیبار لە بیرەوەریی گواستنەوەی ئەم پەرستگەیە زەردەشتییە، لە شاری "کیکان" پایەتەختی توران یەکەم پەرستگەی دروست کرد. شوێنی دروستکردنەکەیشی لەسەر بەرزترین لووتکەی زنجیرە چیای "زاوک" هەڵبژارد کە کەوتووەتە ٥ فەرسەخی خوارووی شاری کیکان. پەرستگەکەیشی بە ناوی "زوراک" ناساند کە لە زمانی کوردیدا مانای توانا و بەهێز دەگەیەنێت.

کۆچی دواییی میر زیبار:

میر زیبار بە بۆنەی جەژنی "نەورۆز" هاتبووە "غوزدار" و لەم جەژنەدا لە کاتی پێشبڕکێی نێزەبازی لە هەسپ کەوتە خوارێ و مرد. دوای ناشتنی میر زیبار، دەستاری میرنشینییان لەسەر میر "براخم" ی کوڕیان پێچا.

ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی میر زیبار بوون: میر رامین گۆرانی، میر سورچن سارونی، میر مانور غوزداری، میر توراب مشکانی، میر کرماج ئەرمیلی، میر کیتون بۆلانی و میر پازو گریشکانی.

## ٦- میر میران میر "براخم"

میر براخم دوای مردنی باوکی، هاتە سەر تەختی میرنشینی توران. میر براخم کوردەکانی خۆش دەویست و خوازیار بوو هەموو کارێکی میرنشینییەکە لەژێر چاودێریی خۆیدا ئەنجام بدرێ. بۆ ئەم مەبەستەش، هەموو کات لە گەشتکردن دابوو، هەموو کونج و قوژبنێکی هەرێمی تورانی بەسەر دەکردەوە، لە هەواڵی تیرەکانی کوردی دەپرسییەوە و داواکاری و پێداویستییەکانیانی بۆ جێبەجێ دەکردن. مروڤێکی ئاینداۆست و یەزدانپەرست بوو، لەبەر ئەوە پڕوپاگەندەی دینەکەی دەکرد و هەوڵی دەدا خەڵک لە ڕێگەی ئاینەکەیان دەرنەچن.

دروستکردنی پەرستگەی "حەلوان" لە غوزدار:

میر براخم بە مەبەستی بەهێزکردنی ئاینپەرستی، لە غوزدار لەسەر لووتکەی چیایەک کە کەوتووەتە ١٠ فەرسەخی لای ڕۆژهەڵاتی شارەکە، پەرستگەیەکی دروست کرد و ناویان لێ نا "حەلوان". حەلوان لە زمانی کوردی مانای دڵگیر دەگەیەنێت. لەبەر ئەم پەرستگەیە زنجیرە چیاکەش بە ناوی "حەلوان"ەوە ناسرا.

کوژرانی فەریبورز پاشای ماد لە شەڕی ئاشوور:

فەریبورز لە ساڵی ٦٢٥ پێش زاین قەڵەمڕەوی سەڵتەنەتەکەی لەلایەکەوە تا ڕووباری "جەیحون" و لەلایەکی ترەوە تا "هیند" بەرین کردەوە. دوای ئەوە، بە لەشکرێکی گەورەوە کە لە هۆزی جۆرەوجۆرەوە پێک هاتبوو بۆ شەڕی ئاشوورییەکان بەڕێ کەوت.

لە ئەنجامدا، لەشکرەکەی شکستی خوارد و خۆیشی لە شەڕەکەدا کوژرا. کوردەکان ترسی ئەوەیان لێ پەیدا بوو کە نەوەکا لەم بارودۆخە ناهەموارەدا وڵاتی ماد و پارس بێتە ژێر دەسەڵاتی ئاشوورییەکان. لەبەر ئەوە بە خێرایی سەرۆکی تیرەکانی کورد جارێکی تر کۆ بوونەوە و کوڕی فەریبورز، "کواکسار"یان هێنایە سەر تەخت.

ماف پێدانی بەشدارینەکردنی کوردە براخۆیی و ئەدرەگانییەکان لە شەڕە نەتەوەییەکان:

کاتێک "توس" هاتە سەر تەختی ماد و پارس، مافی بە کوردە براخۆییەکانی توران و کوردە ئەدرەگانی، ماملی و کرمانییەکانی مەکران دا لە شەڕە نەتەوەییەکان بەشداری نەکەن. ئەمەش لەبەرئەوەی کە ولایەتەکانی ئەوان لە پایەتەختەوە زۆر دوور بوو و بەرپرسی چاودێریکردنی سنوورەکانی ڕۆژهەڵات بوون. لە دۆخێکدا ئەوان لە ولایەتەکانیاندا ئامادە نەبوایەن، ترسی ئەوە پەیدا دەبوو کە وڵاتە بێگانەکان دەستدرێژی و هێرش بکەنە سەر ولایەتەکانیان. لەبەر ئەم هۆیە، مافیان پێ درا لە شەڕی نەتەوەیی بەشداری نەکەن.

پاشابوونی کواکسار:

دوای کوژرانی فەریبورز، کواکساری کوڕی هاتە سەر تەختی ماد و پارس. کواکسار ئەو میراتەی کە لە باوکیەوە بۆی بەجێ مابوو دەلالەتی لەوە دەکرد کە بەو چەشنە تۆڵە لە ئاشوورییەکان بکاتەوە. هەر بۆیەش، کواکسار کەوتە ڕێکخستنی سەربازی و سوپاسازی.

تۆڵەسەندنەوەی کواکسار لە ئاشوورییەکان:

کواکسار دوای ئەوەی لەشکرێکی مەزنی ئامادە کرد، بە مەبەستی تۆڵەکردنەوەی باوکی، هێرشی کردە سەر وڵاتی ئاشوور. ئاشوورییەکان بە سەختی بەرگرییان کرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کواکسار شکستیانی دا و شاری "نەینەوا"یشی گەمارۆ دا. "شاراکو" پاشای ئاشوور کاتێ زانی ئومێدی بەرگریکردنی نەماوە، لە کۆشکی پاشایی ئاگرێکی کردەوە و خۆی و بنەماڵەکەی تێدا سووتان.

هێرشی "سیت"ەکان بۆ سەر خاکی ماد:

کواکسار لە شەڕی ئاشووردا لە ناوچەی "نێوان دەریاکان" (بین النهرین) خەریکی شەڕ بوو کە هەواڵی ئەوەی پێ گەیشت کە "سیت"ەکان هێرشیان کردووەتە سەر خاکی ماد و دوای تێپەڕاندنی زنجیرە چیای "قەفقاز"، گەیشتوونەتە ناوچەکانی باکوری ماد و شەڕ و پێکدادانێکی نەبڕاوەیان بەرپا کردووە. کواکسار ناچار دەستی لە شەڕی ئاشوورییەکان هەڵگرت و بۆ پارێزگاریکردنی وڵاتەکەی گەڕایەوە. لە سەرووی زرێباری "ئورومیە" شەڕێکی سەختی لەگەڵ سیتەلان ئەنجام دا، بەڵام توانای بەرگرتنیانی نەما و ئاشتیی لەگەڵیاندا کرد. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ماد و باقیی ولایەتەکانی دەوروبەری ببنە بازاڕی تالآن و برۆ و زیانکاریی سیتەکان تا ئەو کاتەی کواکسار بە پیلان سەران و میرانی سیتەکانی بۆ میوانداریيەکی میری بانگهێشتن کرد و ئەوەندەی مەی دەرخوارد دان کە تەواو سەرخۆش بوون و لەم بارودۆخەدا یەکە بە یەکە کوشتنی. بەم چەشنە، باقیی سیتەکانیشی لە وڵاتی ماد کردە دەرەوە.

کۆچی دوایی میر براخم:

میر براخم دوای ٤٤ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن، کۆچی دوایی کرد. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی هاوچەرخی بوون: میر بوغاز گۆرانی، میر مانی سارونی، میر گاور غوزداری، میر مانور مشکانی، میر گورەن ئەرمیلی، میر ترمان بۆلانی و میر تاپین گریشکانی.

## ٧- میر میران میر "گۆران"

میر گۆران دوای ئەوەی باوکی کۆچی دوایی کرد، هاتە سەر تەختی میرنشینی توران و دادپەروەرانە ڕێژیمی میرنشینییەکەی بەڕێوە برد. مرۆڤێکی چاکەکار بوو و چاکەی لەگەڵ هەموو کەسێکدا دەکرد. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا کواکسار پاشای ماد کۆچی دوایی کرد.

پاشابوونی ئازدیاک:

دوای مردنی کواکسار، "ئازدیاک"ی کوڕی هاتە سەر تەختی ماد. ئەم پاشایە پیاوێکی لێهاتوو نەبوو و نەیتوانی بەڕێوەبەرایەتیی قەڵەمڕەوە پان و بەرینەکەی بکات کە لە میراتدا بۆی بەجێ مابوو. مەبەست و بنەمای ژیانی خۆی لەسەر ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و مەیخواردنەوە دانابوو. بەزم و شادیی بەسەر دەسەڵاتداری و شەڕ دا زاڵ کردبوو و ئازاردانی خەڵکی کردبووە شێوەی خۆی. لەبەر ئەم هۆیانە، خەڵک خۆشیان نەدەویست و لێی دڵڕەنجاو بوون.

لە پاشایەتی دەرکردنی ئازدیاک:

دەوڵەتی ماد کە بە هۆی کردار و هەنگاوەکانی کواکسار گەیشتبووە ئەوپەڕی شکۆداری و بەهێزی، لە سەردەمی ئازدیاکدا ڕووی لە ڕووخان و نەگبەتی کرد. لە سەردەمی پاشایەتیی ئازدیاک، هیچ کەسێکی وا نەمابوو کە بتوانێ دەوڵەتی ماد بەڕێوە ببات و تەنانەت گەورە و هەڵکەوتەکانی دەوڵەتی مادیش خۆیان بە خۆشگوزەرانییەوە وێڵ کردبوو. لەلایەکی تر، خاترجەمی و ئاسوودەیی لە ڕادەبەدەری خەڵک بووبووە هۆی تووڕەبوونی پاشا و ئەمەش پاشای لە ستەمکارییەکانی خۆی زیاتر گەرمتر کردبوو.

بەم چەشنە، پێوەندیی نێوان دەوڵەت و خەڵک ساردتر بووەو لەم بارودۆخەدا، وەزیری ئازدیاک کە ناوی "ئەرپاک" بوو لەگەڵ سەرۆک و میرەکانی کورد رێک کەوت و دوای ئەوەی لە دانیشتنێکی تایبەت لەمەڕ دەرکردنی ئازیاک راوێژی لەگەڵ کردن، بە نهێنی نامەیەکی بۆ "کوورش"، کوڕی "چش پشی دووەم"ی فەرمانڕەوای فارس و کچەزای ئازدیاک، نووسی و لە رێگەی کەسێکی باوەڕپێکراوەوە بە نهێنی ناردی بۆ "پارساگرد" ناوەندی وڵاتی پارس. لە نامەکەدا، کوورشی بانگهێشتن کرد کە بە سوپایەکی کەمەوە خۆی بگەیەنێتە نزیکی "ئەکباتانا"، بۆ ئەوەی لەشکری کوردی ماد لەگەڵ سەرۆکەکانیان پێیەوە پێوەست بن. کوورشیش بە بینینی ئەم نامەیە، لەگەڵ سەران و سەردارانی سوپای خۆی بەرەو ئەکباتانا بەڕێ کەوت.

شەڕی ئازدیاک لەگەڵ کوورش:

ئازدیاک بە بیستنی ئەم هەواڵە سوپایەکی گەورەی بە سەرۆکایەتیی ئەرپاک بۆ سەرکوتکردنی کوورش نارد. ئەرپاک لە دووەم هێرشدا، خۆی دەبەزێنێت و لەگەڵ لەشکری ماد بە کوورشەوە پێوەست دەبن. ئازدیاک بەم رووداوە چاوەڕواننەکراوە تووڕە بوو و ئەمجارەیان خۆی بە لەشکرێکی ترەوە بەرەو لای کوورش بەڕێ کەوت. ئازدیاک هەر لە سەرەتای شەڕ شکستی خوارد و گەڕایەوە ئەکباتانا و لەوێ داڵدەی گرت. لە ئەنجامدا، سوپای کوورش هاتنە ناو ئەکباتانا و ئازدیاکیان گرت و سەڵتەنەتی مادیان کۆتا پێ هێنا.

هەڵسوکەوتی کوورش لەگەڵ باقیی کورد:

کوورش دوای ئەوەی ئەکباتانا پایەتەختی مادی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی و تەختی پاشایەتیی بە دەست هێنا، رەفتاری میهرەبانانەی هەڵبژارد و رێز و نەوازشی لە بنەماڵەی ئازدیاک گرت. لەبەر ئەو پێوەندییە خوێنییەی کە لەلای دایکەوە لەگەڵ کوردەکان هەیبوو، لەناو سوپاکەیدا پلەی سەرداریی دایە شازادەکانی ماد. هەروەها، "سەپنەوی"ی کچی "ئاریتمار"ی زاوای ئازدیاک و کچە پووری خۆی بە ژن خواست. هەموو رێکخستن و دامەزراوەیی سەڵتەنەتی مادی وەک خۆی هێشتەوە، بۆ ئەوەی هەستی جیاوازی و بێگانەیی لە نێوان کورد و

پارسەکاندا دروست نەبێت. سەران و سەردارانی کورد لە هەر ناوچەیەک بوونایە نەوازشی کردن و پلەی بەرزتری پێ ڕاسپاردن.

لەبەر ئەم هۆیانە، کوردە براخۆییەکان لەسەر میرنشینی توران و کوردە ئەدرەگانییەکان لەسەر میرنشینی مەکران مانەوە و بەردەوام بوون. بە هەمان شێوە، لە هەر شوێنێک کورد پلەی بەرزیان بەدەستەوە بوایە، لەسەر پلەکانی خۆیان مانەوە و تەنانەت کوورش ئەو وڵاتەی کە بە دەستی هێنابوو بە "ماد" و "پارس"ەوە ناساندی و لە پێناسەکەی هیچ گۆڕانکارییەکی نەکرد.

کۆچی دوایی میر گۆران:

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی میر گۆراندا، پاشایەتیی ماد و پارس لە بنەماڵەی مادەوە هاتە دەست بنەماڵەی "هەخامەنشی"یەکان و کوورش بوو بە دەسەڵاتداری تەختی ماد و فارس. چەند مانگ دوای هاتنە سەر تەختی کوورش، میر گۆران کۆچی دوایی کرد.

ئەم سەرۆکانەی تیرانەی کوردی براخۆیی: میر راسن گۆرانی، میر شوهان سارونی، میر مهران غوزداری، میر بەیکەر مشکانی، میر کوساد ئەرمیلی، میر حەکار بۆلانی و میر خیزان گریشکانی هاوچەرخی بوون.

## تیرە "پارسی"یەکان

بەپێی گێڕانەوە، ناوی تیرە پارسییەکان بەم شێوەیە: پارساگرد، مارافین (مارافی)، مارسپین (ماسپیانی)، پانشیانی، دروسیانی (دروزی)، درۆپیکی، ساگارتی، گرمانی (ژرمنانی)، ماردی (مردی) و دایی (دارانی). لە ناویاندا، شەش تیرەی: پارساگرد، مارافین، مارسپین، پانشیانی، دروسیانی و گرمانی گوندنشین و شارنشین بوونە و تیرەکانی: درۆپیکی، ساگارتی، ماردی و دایی چادرنشین و کۆچەر بوونە.

لە نێوان تیرە شارنشینەکانیشدا، پارساگرد و مارافین و مارسپین بەرجەستەترین و بەرچاوترین هۆزی پارسییەکان بوونە و سەران و سەردارانی ئەوان بەسەر تیرە پارسییەکانی تر کە لە سەرەوە باسمان کردن باڵادەست بوونە و فەرمانڕەواییان بەسەردا کردوون.

## دەستەی هەخامەنشییەکان

تیرەکانی پارساگرد، مارافین و مارسپین لە هۆزی فەرمانڕەوای پارسییەکان بوون و تیرەی هەخامەنشیش شاخێکی هۆزی پارساگردە. کوورش میری ئەم تیرەیە، بناخەی فەرمانڕەوایی هەخامەنشییەکانی لە ماد و فارس دامەزراند.

"هەخامەنش" باپیری کوورش سەرداری هۆزی پارساگرد بوو و تیرە پارسییەکانی لە چوارچێوەی ڕژێمێکدا دا کۆ کردەوە و بناخەی فەرمانڕەوایی خۆی لە پارس دامەزراند. شارێکی بە ناوی "پارساگرد" دروست کرد و کردی بە پایەتەختی فەرمانڕەوایەتییەکەی. پاش مردنی، کوڕەکەی، چشپش، کوڕەکەی، کەمبوجیی یەکەم، کوڕەکەی، کوورشی یەکەم و کوڕەکەی چشپشی دووەم، یەک لە دوای یەک فەرمانڕەوایی فارسیان کردووە.

لە سەردەمی چشپشی دووەمدا، ولاتی "ئیلەم" بە هۆی هێرش و دەستدرێژییەکانی "ئاشوور بەنی پال" پاشای ئاشوور رووی لە ڕووخان کردبوو و ڕژێمی ولاتەکە بێهێز بووبوو. چشپش بە سوودوەرگرتن لەم بارودۆخە، هێرشی کردە سەر "ئەنشان" پایەتەختی ئەو ولاتە، توانی داگیری بکات و ولاتی ئیلەم (عیلام) بهێنێتە ژێر دەسەلاتی خۆی. چشپش دوو کوڕی بە ناوی "ئاریامان" و "کوورش" هەبوو و کوورش لە سکی کچی ئازدیاک پاشای ماد و پارس بوو. کاتێک کە چشپش تووشی نەخۆشیی کوشندە[7] هاتبوو، فەرمانڕەوایی "پارس"ی دایە ئاریامان و فەرمانڕەوایی "ئەنشان"یشی بە کوورش ڕاسپارد. ئەم دوو ولاتە هەردووک باجدەری پاشای ماد بوون.

ئازدیاک پاشای ماد و پارس بە هۆی لێنەهاتوویی، میر و سەرۆکەکانی کورد لەسەر کاریان لادا و لە جێگەی، کچەزای، کوورشی هەخامەنشییان هێنایە سەر تەخت. بەم چەشنە، فەرمانڕەوایی بنەماڵەی هەخامەنشی بەسەر ماد و پارس دەستی پێ کرد. بنەچەی دوو کوڕی چشپشی دووەم بەم چەشنەیە: کوورشی گەورە کوڕی چشپشی دووەم کوڕی کوورشی یەکەم کوڕی کەمبوجیی یەکەم کوڕی چشپشی یەکەم کوڕی هەخامەنش. ئاریامان کوڕی چشپشی دووەم کوڕی کوورشی یەکەم کوڕی کەمبوجیی یەکەم کوڕی چشپشی یەکەم کوڕی هەخامەنش.

---

٧. لە دەقەکە فارسییەکەدا "موت و زیست" نووسراوە.

بەشی سێیەم

## میرنشینی کوردە براخۆییەکان لە توران - خولی دووەم

دوای ڕووخانی بنەماڵەی کوردە مادەکان، سەران و سەرداران و میرانی تیرەکانی ماد و پارس کەنیشکەزای ئازدیاکی پاشای ماد و پارس کە بە کووروشی هەخامەنشی دەناسرا هێنایانە سەر تەخت. کوورش پاش هاتنە سەر تەختی، هیچ چەشنە گۆڕانکارییەکی لە دامەزراوەیی سەڵتەنەتی کوردی مادا نەکرد و وەکو شێوەی جارانی هێشتەوە. لەبەر ئەم هۆیە، میرنشینیی کوردە براخۆییەکان لە توران و کوردە ئەدرەگانییەکان لە مەکران وەکو جاران مایەوە و لەژێر سێبەری سۆزی هەخامەنشییەکان بۆ جاری دووەم بناخەی فەرمانڕەواییی خۆیان دامەزراند.

### ٨- میر میران میر "زرشان"

کاتێک میر گۆران کۆچی دوایی کرد، سەرۆکەکانی کوردە براخۆییەکان میر "زرشان"ی کوڕی ئەویان هێنایە سەر تەختی میرنشینی. میر گۆران دوو کوڕی هەبوو: میر "زین" و میر "زرشان". میر زین کوڕی گەورەی بوو، بەڵام لە سەردەمی ژیانی خۆیدا کۆچی دوایی کردبوو. بۆیە میر زرشان بوو بە جێنشین کە مەیلی زۆری لەگەڵ کشتوکاڵدا هەبوو.

دروستکردنی بەربەستی ئاو:

میر زرشان خوازیار بوو بۆ ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانیی خەڵکەکەی زەوییە بێبەرەکان سەرسەوز و ئاوا بکاتەوە و بۆ ئەم مەبەستەش سوود لە ئاسانییە ئاوییەکان وەربگرێ. ئەوە بوو لە بانووە[8] بێ ئاو و گیا شاخاوییەکان بەربەستی

---

٨. بانو: زەویی دەشت و بڵند، بان.

ئاوی زۆری دروست کرد و له ڕێگەی ئاوی باراناو ئاویاری بەربەستەکانی دەکرد. دوای ئەوە، ئەم شێوازە کشتوکاڵییە لە توران پەرەی سەند، دانیشتوانی توران لە سوودی کشتوکاڵ بەهرەمەند بوون و دارایی و ماڵ و سامانێکی زۆریان بە دەست هێنا.

هێرشی فەرمانڕەوای سندان:

گۆڕانکاریی پاشایەتی لە بنەماڵەی مادەوە بۆ بنەماڵەی هەخامەنشی بووە هۆی هێرشی دادگەریی سندان بۆ سەر توران. "باگارم" فەرمانڕەوای سندان گومانی کردبوو کە بە هۆی ئەم بارودۆخە نوێیەی گۆڕانکاریی پاشایەتییە، بەڕێوەبەرایەتی و کاروباری سەڵتەنەت هێشتان تەواو بناخەی دانەناوە و بەهێز نەبووە و دەبێ دەست بەسەراگرتنی خاکی توران ئاسان بێت.

بەم چەشنە، لە دووربینی سوودی وەرنەگرت و لە ڕێی "ئەرمابیل"ەوە هێرشی کردە سەر خوارووی توران. ئێشکگرانی سەنگەرە سەر سنوورییەکان ڕێگەی هاتنە پێشیان لێ گرتن و هەواڵی هێرش و دەستدرێژیی دادگەری سندانیان بە میر زرشان گەیاند کە ئەویش لەگەڵ سەربازە هۆزایەتییەکانی تیرەکانی کیکانی، غوزداری، ئەرمیلی، سارونی و مشکانی هاتە مەیدانی شەڕ و بە چابوک دەستی هێرشی کردە سە سەربازگەی دادگەری سندان. دەستە تیرهاوێژەکانی کورد بە چەشنێک تیربارانیان کرد کە لەشکری سندان لەباری پەشۆکاوی ڕێگەی هەڵاتنیان هەڵبژارد. تیربارانەکە ئەوەندە توندوتیژ بوو کە دوژمن نەیتوانی تەنانەت چەکە زەخیرە کراوەکانی خۆشیان ببەن و بەم چەشنە لەم شەڕەدا کوردەکان دەسکەوتێکی زۆر و بێ ئەندازەیان بەدەست هێنا.

کۆچی دوایی کوورشی مەزن:

کوورش دوای هاتنە سەر تەخت، بایەخی زۆری بە وڵات داگیرکردن دا و سەڵتەنەتەکەی زۆر بەرین کردەوە و بە نازناوی کوورشی مەزن ناوبانگی دەرکرد. بەڵام لە سەردەمی شەڕەکانی ولایەتەکانی ڕۆهەڵات کوژرا.

پاشابوونی "کەمبوجی"ی هەخامەنشی:

دوای مردنی کوورشی مەزن، کوڕەکەی، "کەمبوجی" هاتە سەر تەخت و ئەو ولایەتانەی گوێڕایەڵی خۆی کردن کە شۆڕشیان بەرپا کردبوو و یاخی بووبوون. کەمبوجی تووشی نەخۆشیی "فێ" هاتبوو، لەبەر ئەوە هەندێ جار زەبروزەنگی بەوپەڕی زیادی دەگەیشت. کەمبوجی لە دواییدا بۆ داگیرکردنی "میسر" بەڕێ کەوت و توانی داگیری بکات.

خۆ کوشتنی کەمبوجی:

کەمبوجی دوای داگیرکردنی میسر، بە سەرفرازی و کامەرانی گەڕایەوە و هێشتا لە "سووریا" بوو کە هەواڵی پێ گەیشت کە پەرستگەیەکی زەردەشتی ئاڵای شۆڕشی بەرز کردووەتەوە. بە بیستنی ئەم هەواڵە ناخۆشە زۆر خەمبار بوو و لەبەرئەوەی نەخۆشیی فێی هەبوو هاوسەنگیی مێشکی تێک چوو و خۆی کوشت.

کۆچی دوایی میر زرشان:

میر زرشان دوای ۳۱ ساڵ فەرمانڕەوایی، کۆچی دوایی کرد کە هاوچەرخی کوورشی مەزن و کەمبوجی بوو. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی: میر ناگان گۆرانی، میر نێرمان سارونی، میر شیشار غورداری، میر گورگین مشکانی، میر باهور ئەرمیلی، میر بوغا بۆلانی و میر سەمبان گریشکانی هاوچەرخی بوون.

## ٩- میر میران میر "زوراک"ی دووەم

دوای کۆچی دوایی میر زرشان، کوڕەکەی، میر زوراکی دووەم هاتە سەر تەختی توران. میر زوراکی دووەم وەکو باوکی مەیلی کشتوکاڵی هەبوو. زنجیرەی دروستکردنی بەربەستەکانی بەردەوام کرد و ئەو بەربەستانەی کە لە سەردەمی باوکی بە ناتەواوی مابوونەوە، کارەکانی بە ئەنجام گەیاندن و تەواوی کردن.

باوکردنی دابی "حەشەر":

زوراکی دووەم یەکەم میری توران بوو و لە سەردەمی میرنشینیی خۆیدا، دابی "حەشەر"ی برەو پێ دا. کارە گەورە و بایەخدارەکان لە ڕێگەی ئەم دابەوە بە

خێرایی ئەنجام دران، بەربەستی زۆر لە سەرتاسەری ناوچە بانووەکانی توران دروست کران و کشتوکاڵ بەرەوپێش چوو. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دانیشتوانی توران بەهرەی فراوان بە دەست بهێنن و بارودۆخیان ئاسوودە بێت.

شیکردنەوەی دابی حەشەر:

"حەشەر" بە مانای دەستەیەکی گەورە دێت، واتە کارێک کە دەستەیەکی گەورە یان ژمارەیەکی زۆری خەڵک بە هەرەوەزی ئەنجامی بدەن پێی دەڵێن ئەم کارە لە ڕێگەی "حەشەر"ەوە ئەنجام درا. دوای باوبوونی ئەم دابە، لە هەموو شار و شارۆکە و گوندەکانی میرنشینی توران خەڵک کۆ دەبوونەوە و کارەکانیان ئەنجام دەدا. لەگەڵ ڕەوتی سەردەم، ئەم چەشنە کارکردنە بە ناوی "حەشەر" ناسرا.

پاشابوونی "دارای یەکەمی" هەخامەنشی:

کەمبوجی وەجاخ کوێر بوو، لەبەر ئەوە وەزیر و میرەکانی دەرباری سەڵتەنەت "دارا" کە لە نەوەی "ئاریامان"ی هەخامەنشی بوو هێنایە سەر تەخت. دارا بە زانایی، بەهێزی، لێهاتوویی و دادپەروەرییەوە ناوبانگی دەرکردبوو، لە سیاسەت و ڕۆشنبیریدا بێ هاوتا بوو، بەوپەڕی بەهێزی و مەزنایەتییەوە فەرمانڕەوایی کرد و توانی وڵاتەکەی بە لووتکەی شکۆمەندی بگەیەنێ.

لەم نێوانە، بۆ سەرکوتکردنی پارێزگاری پەرستگە[9] کە لە هەموو ناوچەیەکی وڵات ئاڵای یاخیگەری و شۆڕشی بەرز کردبووەوە کەوتە ڕێ کە لە ئەنجام دەسگیری کرد و کوشتی. دوای ئەوە، دەستی بە وڵات داگیرکردن کرد.

کۆچی دوایی میر زوراک:

میر زوراکی دووەم دوای ٣٤ ساڵ فەرمانڕەوایی، کۆچی دوایی کرد. هاوچەرخی دارای یەکەم بوو و ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی: میر دوج گۆرانی، میر هینار سارونی، میر کاشک غوزداری، میر بولور مشکانی، میر ئاماچ ئەرمیلی، میر دەرنیل بۆلانی و میر زیدەک گریشکانی هاوچەرخی بوون.

---

٩. لە تێکستە فارسییەکەدا نووسراوە "گومات معبد".

### ١٠- میر میران میر "ئەرجان"

میر ئەرجان دوای کۆچی دوایی باوکی، هاتە سەر تەختی توران کە پیاوێکی چاکەکار و خووڕەوشت جوان بوو و بە دادپەروەرییەوە بەناوبانگ بوو. لە شاسواری تاک بوو و دەڵێن لە کاتی سەفەردا سێ قاتری زینکراو لە پێشی دەڕۆیشتن و یەک هەسپیان توانای سواریی ئەوی نەبوو. هەروەها، مرۆڤێکی کارا و بە کردەوە بوو و هەر کارێکی دەست پێ بکردایە بە ئەنجامی دەگەیاند.

دامەزراندنی لەشکری ئێشکچی:

میر زرشان لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا لەسەر سنوورە هاوبەشەکانی توران و سندان چەندین سەنگەری دروست کردبوو و تێیدا بە مەبەستی پاسەوانیکردن سەربازی نیشتەجێ کردبوو. میر ئەرجان کاتێک هاتە سەر تەخت، لەشکرێکی جیای ئێشکچیی دروست کرد کە بەردەوام لەناو سەنگەرەکاندا ئێشکیان دەگرتن و چاودێریی سنوورەکانیان دەکرد.

پاشابوونی "خشایارشا"ی هەخامەنشی:

دارای یەکەم کاتێک تووشی نەخۆشیی کوشندە هات، "خشایارشا"ی کوڕی کە لە سکی "ئاتوسا"ی کچی کوورش بوو بە شازادەی وەرگری تەخت هەڵبژارد و دوای مردنی هاتە سەر تەخت. لە سەرەتای دەسەڵاتداریدا، دانیشتوانی پارس لە دڵەوە دەیانویست و پەسندی کۆمەڵگە بوو.

داگیرکردنی "میسر" و "بابل":

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خشایارشادا، وڵاتی "میسر" و "بابل" شۆڕشیان بەرپا کردبوو و خۆیان لە ژێردەستی وڵاتی پارس ڕزگار کردبوو. لەبەر ئەوە، خشاریارشا بەرەو میسر بەڕێ کەوت و دوای شەڕێکی سەخت، میسرییەکانی شکست دا و ئاگری یاخیبوونەکەی کوژاندەوە.

دوای ئەوە، خشاریارشا ڕووی کردە بابل و شارەکەی گەمارۆ دا و سەربازانی ناو شار ناچار بوون چەک فڕێ بدەن و خۆیان بدەنە دەستییەوە.

### هێرشی [خشایارشا] بۆ سەر یۆنان:

خشایارشا کاتێ لەم داگیرکردنانە دەستی بەتاڵ بوو، سەرنجی بۆ هێرشکردنە سەر یۆنان ڕاکێشا. بۆ ئەم مەبەستەش، سوپای ئاوی و وشکاییی کۆ کردەوە و بە لەشکرێکی گەورەی پڕ چەک و ئامادەی شەڕ هێرشی کردە سەر خاکی یۆنان.

ئەم شەڕە درێژەی کێشا و لە کۆتادا لە شەڕی "سلاس" نەوەکانی پارس شکستیان خوارد. خشایارشا دوای ئەم شکستە، سەرداریی لەشکری بە "مەردونیا" دا و خۆی بەرەو پارس گەڕایەوە.

### کوژرانی "پندران" برای میر ئەرجان:

لە سەردەمی میرنشینی میر ئەرجان، دەستەیەک لە ڕێگران و تاوانبارانی جدگالەکانی سندان بە نهێنی چووبوونە شاخاویی نێوان شاری "کیکان" و "بلبلان" و لەسەر بڵندترین لووتکە چیای شاخاوییەکە مۆڵگەیان دامەزراندبوو. ئەم کەمینگەیە نشینگە و پەناگەیان بوو و کاتێ خەڵکانی ڕێبوار و کاروانەکان بە سەفەر دەڕۆیشتن، ڕێگەیان لێ دەگرتن و تالانیان دەکردن.

میر ئەرجان برای خۆی میر "پندران"ی بۆ سەرکوتکردنی ئەم دەستەیە هەڵبژارد کە ئەویش شەو بە کتوپڕی هێرشی کردە سەریان. بەڵام لە شەڕەکە بریندار بوو و زامەکەی ئەوەندە کاریگەر بوو کە گیانی دەرباز نەبوو و مرد. بە هۆی ئەم ڕووداوەوە، دۆڵەکە بە ناوی "پندران" بەناوبانگ بوو.

### کوژرانی خشایارشای هەخامەنشی:

کاتێک خشایارشا لە شەڕی یۆنان گەڕایەوە و هاتەوە پارس، دەبوو تۆڵەی شکست خواردنەکەی لە وڵاتی یۆنان بکردایەتەوە و خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکردایە. بەڵام بە پێچەوانە ژیانی خۆی بۆ ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و زۆر مەیخواردنەوە تەرخان کرد. دانیشتنەکانی بەزمی بەسەر ئامادەکاریی شەڕ و شەڕکردندا زاڵ کرد و دووچاری ترسنۆکی، بێدڵی و تەمبەڵی بوو.

لەبەر ئەم هۆیانە، میر و ئەندامانی دەوڵەت و میرەکانی سوپا لێی زیز و بێزار بوون. لەو کاتەدا، "ئەردەوان" میری سەربازانی ئامادەساز لەگەڵ گەورانی دەوڵەت و خەسێنراوی کۆشکی پاشایی ڕێک کەوت و خشایارشایان کوشت.

کۆچی دوایی میر ئەرجان:

میر ئەرجان ٢٥ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و تووشی نەخۆشیی زەردوویی هات و کۆچی دوایی کرد. هاوچەرخی خشایارشای پاشای هەخامەنشی بوو و ئەم میرانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی: میر چرموک گۆرانی، میر کابو سارونی، میر دیلەم غوزداری، میر توتک مشکانی، میر کەمبیل ئەرمیلی، میر خیزان بۆلانی و میر پیلار گریشکانی هاوچەرخی بوون.

## ١١- میر میران میر "شاموز"

میر "شاموز" لە جێگەی باوکی هاتە سەر تەختی توران کە پیاوێکی زانا و هۆشمەند بوو و هیچ کارێکی بێ ڕاوێژی سەرخێڵانی کورد نەدەکرد. سەرۆکەکانی تیرەکانی کوردی براخۆیی هەموو کات هاوکاری بوون و لە دیوانی ئامادەییان هەبوو. میر شاموز لە شمشێربازیدا بێهاوتا بوو و لە شەڕکردندا دوو شمشێری بە دەستەوە دەگرت و قەڵغانی بەکار نەدەهێنا.

پاشابوونی "ئەردەشێری یەکەم"ی هەخامەنشی:

"ئەردەوان" خشایارشای لە ژووری حەوانەوەیدا کوشت و خواستی "ئەردەشێر" کە شازادەیەکی کەم تەمەن بوو تەختنشین بکات و لەم ڕێگەیەوە دەسەڵاتی وڵاتەکە بگرێتە دەست خۆی. بەڵام بە بوونی "دارا" کوڕی گەورەی خشایارشا ئەمە نەشیاو بوو. بۆیە ئەردەوان، ئەردەشێری هان دا و واداری کرد کە دارای برا گەورەی کە باوکی خۆی کوشتبوو لە تۆڵەی تاوانەکەی بکوژێ.

بەم چەشنە دارا کوژرا و دوای ئەوە ئەردەوان بە خێرایی دژی ئەردەشێری تازە پاشا یاخی بوو و کۆششی دەکرد ئەویش لەناو ببات. بەڵام ئەردەشێر لە پیلانەکەی وریا بووەوە، سەری بڕی و وڵاتەکەی لە ئاژاوەگێڕی و کینەپەروەری و بەدئەندێشی ئەو ڕزگار کرد.

هێرشی میری سندان بۆ سەر تەنگەی "میلا":

"کندابوج" میری سندان لەگەڵ سەربازی پیادەڕۆ و سواریی جدگالەکان کە هەموو چەکدار و زرێپۆش بوون لە "کندابیل" پایەتەختی "بودها"وە کە کەوتووەتە

دەمی تەنگەی "مـیـلا" بەرەو خـاکی توران کـەوتە ڕێ و هـاتە تەنگەی مـیـلا. لەوێ سـەنگەری پاسـەوانیی سـەربازە کوردەکانی داگـیر کرد و هەموو ئێشـکگرەکـانی کـوشت و تەنیـا یەکـێکیشـیـان بە زیندوویی نەمـایەوە کـە هەواڵی ئەم هێـرشـەی لەشکری سندان بگەیەنێتە میری توران.

دوای چەند ڕۆژ، هـەواڵدەرەکـانی کـوردە براخـۆییـیـەکـانی غـوزدار هـەواڵی ئەم ڕووداوە دڵـتـەزێنەیان بە مـیـر شـامـوز گەیاند کـە ئەویش بە بیسـتنی زۆر دڵـتـەنگ و تووڕە بوو، لەشکری هـۆزایەتیی کوردەکانی بە خـێـرایی کۆ کـردەوە و لە کـێکانەوە هاتە غـوزدار. لەوێ لەگەڵ مـیرەکانی سەربازی ڕاوێژی کـرد و لەشکرەکەی بـەسـەر سێ قۆڵ[١٠]، قـۆڵی ڕاست و قـۆڵی چەپ و قـۆڵی نـاوەند دابەش کـرد. سـەرۆکـایەتیی قۆڵی یەکەمی دایە میر مرداس سـارونی، هـی دووەمی دایە میر خەرزان غوزداری و خۆیشی سـەرۆکایەتیی قۆڵی سێیـەمی گرتە ئەسـتۆ و بەرەو تەنگەی میلا کەوتە ڕێ. کاتێک لەشکری براخۆییـیەکان نزیکی سـەربازگەی جدگالەکان بوونەوە، دەسـتـەی سـەرەکیی سوپای سندان بە شێوەی چوار گۆشەیی خۆیان ڕێک خست. کوردەکان هێـشـتـان ژمـارە و هێـزی دوژمنیـان بۆ ڕوون نـەبووبووەوە، لـەبەر ئەوە سـەرەتا دەسـتـەی پێشـڕەو (پێش قـەرەوڵ) لـە پێشـاوپێشـی سـوپاکـە شـوێن خـۆیان گـرت. دەسـتـەی سـەرەکـیی شـەڕوانی براخـۆییـیەکـان کە هەمـوو چەک و زرێیەکـانیـان لەژێر بەرگی خوریدا شـاردبووەوە لە ناوەندی مەیدان بـوون و بە یەک ئاماژەپێکردنی مـیر ئەم سـەربازە سـوارانە بەرگەکـەیان فڕێ دا و بە هـاواری سامنـاک و دەنگی تەپڵەوە هێرشـیـان کـردە سـەر ڕیزەکـانی جدگالەکان. کندابوج مـیری سندان تەنانـەت پێش ئەوەی سـەر لـەو ترس و سـەرسـوڕمـانیـیـە بهێنێتـە دەر، خـۆی لە نێـوان لەشکری کـوردی براخـۆیـیدا بە گـەمـارۆدراوی دیتـەوە. تیـرهـاوێژەکـانی کـورد لەشـکری پیادەڕۆی جدگالەکانیان لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دا و تیربارانی مەرگیان کردن.

لە ئەنجام، شـەڕی تەن بە تەن لە نێوان جدگالەکان و کوردەکـان دەسـتی پێ کرد، کندابوج مـیـری سندان زامـدار بوو و بەرەو دواوە کـشـایەوە. هەندێ سـەربازی جدگالەکان لە گردێکی بچووک سەنگەریان گرت و قەڵغانەکانیان لە پێش خۆیان بۆ پاراستن دانا و بـەرگریـیـان لە خـۆیان کرد تا ئەو کـاتەی هـەموویان کـوژران. مـیر

---

١٠. بە مانای باڵ یان بەشی سوپا.

شاموز سەری کندابوجی لە لەشی جیا کردەوە، بە نووکی نێزەکەی بەرزی کردەوە و دووبارە ڕووی کـردە قـۆڵی ناوەندی لەشکری جـدگـالەکـان. سـەربازەکـانی جدگـالەکـان شکسـتـیـان خـوارد و ڕوویان لە هـەڵاتن کـرد. بەڵام لەلایەن کـوردە براخۆییەکانەوە لە هەموو لایەکەوە ڕێگەیان لێ بەسترابوو، لەبەر ئەوە ڕوویان لە هەر لایەک دەکرد بەرەو ڕووی شمشێری کوردەکان دەبوونەوە و دەکوژران.

ئەم شـەڕە لە سـاڵی ٤٥٤ی پێش زاین ڕووی دا و نزیکەی ١٥٠٠٠ سـەربازی جدگالەکان کوژران. کوردەکان لە یادی ئەم سەرکەوتن و کامەرانییە، ناوی شوێنی شـەڕەکەیان بـە ناوی میر شاموزەوە ناساند. ئەم تیرانەی خـوارەوەی جدگالەکان لەم شـەڕەدا لە پشـتیـوانیی کندابـوج میری سندان بەشدارییـان کردبوو: لوهانی. سـتـهونانـی، ئەبرانی، مـاچانی، بەمـبی، چەخـاوەری، جـانبی، دەنـداوەر، کلواری، مانجهوی، نسوری، پوهوری، رونجهایی، گونگو، مانگی، ئەنگاری، رادی، راندانی، جاموس، دهور، موندر، بورادی، سوماری، بهاتی، کهرلی، لاکە و کهوکهری.

کۆچی دوایی ئەردەشێری یەکەم:

ئەردەشـێـر دوای ٤٠ سـاڵ فـەرمـانڕەوایی، کـۆچی دوایی کـرد. لە سـەردەمی فـەرمـانڕەوایی ئەودا سـەڵتـەنەتی هەخـامـەنشی بەرەو ڕووخـان دەچوو و باری پاشاگەردانی لە وڵاتەکەدا ڕیشەی چاندبوو. لەگەڵ ئەم هەموو بێـهێزی و ناڕێکی و ناڕاستی و نەزانییـەدا، سەردەمی فـەرمـانڕەوایی ئەردەشێری یەکەم درێژخـایەن بوو.

کۆچی دوایی میر شاموز:

دوای مـردنی ئـەردەشـێـری یەکـەم، مـیـر شـامـوزیش کـۆچی دوایـی کـرد. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی: میر کازان گۆرانی، مـیر مرداس سارونی، مـیر خـەرزان غوزداری، میـر دوغـان مشکانی، مـیـر باسیـر ئەرمیلی، مـیر مـشکان بۆلانی و میر مـاخان گریشکانی هـاوچەرخی بوون.

### ١٢- میر میران میر "براخمی دووەم"

دوای مـردنی مـیـر شـامـوز، کـوڕەکـەی، مـیـر "براخـمـی دووەم" هـاتە سـەر تەخـتی مـیـرنشـینی توران. مـیـر براخـم پیـاوێکی خـووڕەوشت باش و وتار باش و سروشت

باش و ڕابردوو باش بوو. هەردەم ژیانی پڕ لە ئاسوودەیی بۆ تیرەکانی کوردی براخۆیی دابین دەکرد و بۆ چاکە و ئاسایشیان تێ دەکۆشی. هەروەها، پەرەی بە ئاسانکاری و ئامرازی کشتوکاڵ دا.

هەڵکۆڵینی "کارێز":

میر براخمی دووەم لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا سوودی لە سەرچاوەیەکی تری ئاو وەرگرت کە پێی دەڵێن "کارێز". لە ڕێگەی ئەم سەرچاوەیەوە توانییان زەخیرەی ئاوی ژێر زەوی بهێننە سەر زەوی و بۆ ئیشوکاری کشتوکاڵ بەکاری بهێنن. بەم چەشنە، لە سەردەمی میر براخمی دووەم دابی هەڵکۆڵینی کارێز بە شێوەیەکی بەرفراوان برەوی سەند و لە هەر شوێنێک شیاو بوایە خەڵکی ناوچەکە کارێزیان هەڵکۆڵی و ئاوەکەیان بەکار دەهێنا.

دابەشکردنی دەسکەوتەکانی شەڕ:

ئەو دەسکەوتانەی لە شەڕی کندابوج فەرمانڕەوای سندان کەوتبووە دەست کوردەکان ئەوەندە زۆر بوون کە میر شاموز لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا نەیتوانی دابەشیان بکات، لەبەرئەوەی چەند ڕۆژ دوای شەڕەکە کۆچی دوایی کرد. پاشان میر براخمی دووەمی کوڕی ئەم دەسکەوتانەی لە نێوان مافدارەکاندا دابەش کرد.

پاشابوون و کوژرانی "خشایارشای دووەم":

دوای مردنی ئەردەشێری یەکەم، کوڕەکەی، "خشایارشای دووەم" هاتە سەر تەختی سەڵتەنەت و تەنیا ٤٥ ڕۆژ فەرمانڕەوایی کرد. لەبەرئەوەی "سفدیانو"ی برای کە لە سکی کەنیزێک بوو و ئێرەیی پێ دەبرد، لە دانیشتنێکی شەوانەدا ئەوەندەی مەی دەرخوارد دا کە سەرخۆش بوو و بێهۆش کەوت و لەباری بێهۆشی دا کوشتی.

پاشابوونی "دارای دووەمی" هەخامەنشی:

کاتێک سفدیانو، خشایارشای کوشت، "ئوخوس" فەرمانڕەوای "بەلخ" بوو. ئەندامانی دەوڵەت بە هۆی ئەو کردارە ناشیرینە، لە سفدیانو دڵڕەنجاو بوون. بۆیە

لەگەڵ ئوخوس یەکیان گرت و سفدیانویان دەسبەسەر کرد. پاشان لە تۆڵەی خوێنی نارەوای برایەکەی کوشتیانەوە.

ئوخوس نازناوی "دارا"ی هەڵبژارد و هاتە سەر تەختی سەڵتەنەت کە پیاوێکی بەدکردار و خۆپەروەر و تەمبەڵ و بێهێز بوو. ئیرادەی بەهێز نەبوو و دەسەڵاتی حکوومەتەکەی لەژێر دەستی شاژن و سێ کەسی خەسێنراو دابوو. لەبەر ئەوە، لە سەرتاسەری وڵات شۆڕش و یاخیگەری بەرپا بوو. نائارامی دروست بوو و لە هەموو شوێنێک شەڕ و پێکدادان دەستی پێ کرد. ئەم بارودۆخە بووە هۆی بێهێزیی دەوڵەت و بنەماڵەی هەخامەنشی. بەڵام دارای دووەم لەگەڵ ئەو هەموو بەدکاری و تاوانبارییەدا تا ٢٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و پاشان کۆچی دوایی کرد.

کۆچی دوایی میر براخمی دووەم:

میر براخمی دووەم دوازدەم فەرمانڕەوای میرنشینیی توران بوو و ٢٤ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و پاشان کۆچی دوایی کرد. ئەم سەرۆک تیرانەی کوردی براخۆیی: میر زینل گۆرانی، میر ریگان سارونی، میرکوساد غوزداری، میر کاتین مشکانی، میر بولاک ئەرمیلی، میر سیکران بۆلانی و میر سارم گریشکانی هاوچەرخی بوون.

کۆچی دوایی دارای دووەم:

دارای دووەم نزیکەی ٢٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و کۆچی دوایی کرد. پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات "ئەرشک"ی کوڕی بە شازادەی تەخت وەرگر هەڵبژارد کە ئەویش پاشان بە نازناوی ئەردەشێری دووەمەوە هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی.

## ١٣- میر میران میر "سابول"

دوای مردنی میر براخمی دووەم، کوڕەکەی، میر سابول هاتە سەر تەختی توران. میر سابول پیاوێکی دادپەروەر و دووربین و دووربەندێش بوو. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا باری بێهێزی، بێ یاسایی، نائارامی و ناتەبایی لە وڵاتی

فـارس پەرەی سـەندبوو و مـیـرەکـانی دەوڵەت بە دوای شـەڕەنگێـزی و شـەڕ و پێکدادان دەگـەڕان. مـیـر سـابول ئامـادە نەبوو باری ناتەبایی و بێ یاسـایی لە ولایەتی ئەویشـدا پەرە بسـێنی. لەبەر ئەوە، ولایەتی توران و مـەکـرانی لە شـەڕ و زیانکاری و بەدخوو و بەدئەندێشان پاراست.

کۆچی دوایی میر سابول:

مـیـر سـابول کـیکانی دوای ٣١ سـاڵ فـەرمـانڕەوایی کـۆچی دوایی کـرد کـە هاوچەرخـی دارای دووەمی هەخـامـەنشی پاشـای پارس و مـاد بوو. ئەم سـەرۆک تیرانەی کوردی براخۆیی: میر گۆران گۆرانی، میر کیتون سارونی، میر مشکان غوزداری، میر زروان مشکانی، میر ئەورام ئەرمیلی، میر ساسون بۆلانی و دارون گریشکانی هاوچەرخی بوون.

پاشابوونی "ئەردەشێری دووەم":

ئەردەشـێـری دووەم دوای مـردنی باوکی هـاتە سـەر تـەخـتی پارس و ٤١ سـاڵ فەرمـانڕەوایی کرد. ئەردەشێر مرۆڤێکی لەسـەرخۆ و میهرەبان بوو و هەمـوو کات بە بورین و چاوپۆشـی کـاری دەکـرد. ئەمـەش دەبووە هۆی ئەوەی مـیـران و بەرپرسانی دەوڵەت سەرپێچی لە فەرمانەکانی بکەن.

لە سـەردەمی دەسـەڵاتداریی ئەودا ڕاپەڕین و یاخیگەرییـەکی زۆر لە کایەدا بوو. دەڵێن ژمارەی ژنەکـانی ٣٦٠ بووە و ١١٥ کوڕ و کچی هەبووە. زۆربەی منداڵەکانی لە سەردەمی ژیانی خۆیدا مردوون و چوار کوڕی بە ناوی دارا، ئەریاسپ، ئەرسام و ئوکس لە پاش خۆیدا بەجێ ماون و لەوانە کوڕە گەورەکەی بە شـازادەی وەرگری تەخت هەڵبژارد. دەڵێن ئەدەشـێری دووەم ٦٤ سـاڵ فـەرمانڕەوایی کردووە. ١٤-

١٤- میر میران میر "نورگان"

دوای ئەوەی مـیـر سـابول کـۆچی دوایی کـرد، سـەرۆکـەکـانی کوردی براخـۆیی کوڕەکەی ئـەویان کـە نـاوی "نورگـان" بـوو هێنایە سـەر تەخـتی مـیرنشـینی توران. کـاتێک مـیـر نورگـان دەسـەڵاتداریی مـیـرنشـینـی تورانی گرتـە دەست، بارودۆخی ناوچەکانی دەوروبەر نەگونجـاو و ناسـازگـار بوو و بازاڕی شـەڕ و ئاژاوە لە گشت لایەکی ولاتی ماد و پارس گەرم بوو. میرانی دەوڵەت لەگەڵ یەکتردا شەڕیان دەکرد

و هەر کامیان دەیویست لە بەرامبەرەکەی بەهێزتر بێت و وڵایەتی زۆرتر بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

میر نورگان مرۆڤێکی زیرەک و تێگەیشتوو بوو، لەبەرئەوە ڕێژیمی میرنشینییەکەی خۆی لەم جۆرە ئاژاوە و تەنگوچەڵەمانە پاراست و کوردەکانی بە بەرگریی تورانەوە خەریک کرد.

دروستکردنی قەڵای "نورگان":

دوای هێرشە گەورەکەی میری سندان بۆ سەر تەنگەی "میلا" لە سەردەمی میر شامۆزدا، ئەم ڕاستییە ڕوون بووەوە کە بەرگریکاریی تەنگەکە لاواز بووە. لەبەرئەوە، میر نورگان لە دۆڵی "سویندرون" کە لەلای باکوری تەنگەی میلاوە دەست پێ دەکات، قەڵایەکی پتەو و گەورەی دروست کرد. بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا بەخێرایی بەرگریی تەنگەکە بکرێ. ئەم قەڵایەی لە نزیک کانییەک لەسەر لووتکەی چیایەک دروست کرد و سەربازی کوردی تێدا بۆ ئێشک گرتن نیشتەجێ کرد. دوای دروستکردنی ئەم قەڵایە، ناوچەکە بە ناوی "نورگان"ەوە ناوبانگی دەرکرد و ناسرا.

کۆچی دوایی ئەردەشێری دووەم:

ئەردەشێری دووەم دوای ٦٤ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن، کۆچی دوایی کرد و چوار کوڕی لە پاش بەجێ ما کە ناویان دارا، ئەریاسپ، ئەرسام و ئوکس بوو. هەر لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتیی خۆیدا "دارا"ی بە شازادەی وەرگری تەخت هەڵبژاردبوو. میر سابول میر میرانی توران هاوچەرخی ئەو بوو.

پاشابوونی "ئەردەشێری سێیەم":

دوای کۆچی دوایی ئەردەشێری دووەم، کوڕە بچووکەکەی، ئوکس نازناوی ئەردەشێری سێیەمی بۆ خۆی هەڵبژارد و هاتە سەر تەخت. بەڵام مرۆیەکی کردار و خوو خراپ، سروشت خراپ و دەروون پیس بوو و لە نێوان مرۆی خراپدا پەروەردە کرابوو. هەر بۆیە سروشت و هەڵسوکەوتی ئەوانی هەڵگرتبوو و چووبووە ڕیزی ئەوان.

دارای برا گەورەی کە شازادەی وەرگری تەخت بوو هەر لە سەردەمی ژیانی باوکیدا بە فێڵ و پیلان کوشت. "ئەریاسپ"ی برایشی کە مرۆیەکی خووباش و ڕەفتارباش و ڕووخۆش و زمانخۆش بوو و پەسندکراوی ئەندامانی دەوڵەت بوو، هەڵسا ئەویشی لەناوبرد. هەروەها، هەموو خزم و کەس و نزیکەکانیشی کوشت، بۆ ئەوەی کەس لە داواکارانی تەخت و تاجی سەڵتەنەتەکە نەمێنێ.

کۆچی دوایی میر نورگان:

میر نورگان هاوچەرخی ئەردەشێری سێیەم بوو و ئەم سەرۆک تیرانەی کوردی براخۆییش: میر مهران گۆرانی، میر باشوک سارونی، میر بیفل غوزداری، میر بوزیک مشکانی، میر ئوکی ئەرمیلی، میر کەلفل بۆلانی و میر نوغێ گریشکانی هاوچەرخی بوون.

## ١٥- میر میران میر "کیانوش"

دوای مردنی میر نورگان، سەرۆکەکانی کوردی براخۆیی میر "کیانوش"ی کوڕیان هێنایە سەر تەختی میرنشینیی توران کە لە سەردەمی فەرمانڕەواییی خۆیدا بۆ تەبایی و یەکەتیی ڕیزەکانی تیرەکانی کورد تێ دەکۆشا. هەوڵدانی ئەو نەیهێشت شیرازەی کوردەکان تێک بچێ و لێک جیا ببنەوە و کێشە لە نێوانیان دروست ببێت. بە پێچەوانە یەکگرتوویی و پێوەستبوونیانی زیاتر پتەو کرد. ئەمەش زۆر پێویست بوو لەبەرئەوەی لە هەموو ناوچەکانی ماد و پارسدا ئاژاوەگێڕی و یاخیگەری پەرەی سەندبوو. دادگەری ولایەتەکان لە قووڵاییی ڕووخاندا بوون و کاروباری ڕێژیمی وڵاتی ماد و پارس دووچاری ناکۆکی و پاشاگەردانی هاتبوو.

کوشتنی ئەردەشێری سێیەم:

"باگواس" خەسێنراوی خزمەتکاری باوەڕپێکراوی ئەردەشێر بوو و هەوەسی پاشایەتی لە مێشکیدا چەقەرەی کردبوو. ئەو بەوە دڵی ئاوی نەدەخواردەوە کە دەسەڵاتی هەموو سەڵتەنەتەکەی لە دەست دابوو و بەڕێوەبەری ڕەش و سپیی وڵاتەکە بوو. بە هۆی ئەم هێڤییە ژاری دەرخواردی ئەردەشێر دا و کوشتی.

### کۆچی دوایی میر کیانوش:

میر کیانوش دوای ١٢ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن، لە کاتی لاوێتیدا تووشی نەخۆشیی ئاوڵە هات و کۆچی دوایی کرد. میر کیانوش هاوچەرخی ئەردەشێری سێیەم بوو و ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆییش: میر گیشتار گۆرانی، میر ئیناخ سارونی، میر زەڕین ئەرمیلی، میر لاکور بۆلانی، میر بلباس گریشکانی، میر کرمجل غوزداری و میر براخم مشکانی هاوچەرخی بوون.

### ١٦- میر میران میر "کیکانی دووەم"

دوای کۆچی دوایی میر کیانوش، کوڕەکەی، میر "کیکانی دووەم" هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە سەردەمی هاتنە سەر تەختی ئەودا باری ناڕێکی و شێواوی لە ماد و پارس بە لووتکە گەیشتبوو و پاشاگەردانی لە هەموو لایەک گەرم بوو. میر کیکان خۆی لە چوارچێوەی ئەم کێشانەدا بە گەمارۆدراوی بینی. بۆیە خۆی خەریکی ڕێکوپێککردنی ڕێژیمی نەتەوەیی و مەشق پێدانی لەشکری تیرەکانی کورد کرد.

### پاشابوونی "دارای سێیەم":

باگواس کاتێک ژاری دەرخواردی ئەردەشێری سێیەم کرد، کەسێکی لە بنەماڵەی هەخامەنشی کە ناوی "کدمان" بوو و ژیانی گۆشەنشینانەی بەسەر دەبرد و کوڕەزای "ئاستن"ی برای ئەردەشێری سێیەم بوو بۆ سەر تەختی سەڵتەنەت هەڵبژارد. کدمان کاتێک هاتە سەر تەخت، نازناوی "دارا"ی بۆ خۆی هەڵبژارد.

دارا مرۆڤێک بوو شایانی پاشایەتی بوو و لە هێما و ئیشوکاری سەڵتەنەت شارەزا بوو. هەروەها، مرۆڤێکی بەخشندە و دلێر بوو و لە پێشڕەوەکانی خۆی زۆر لێهاتووتر بوو. کاتێک باگواس ئەم ڕەفتار و خووڕەوشتە باشانەی لەم هەڵبژێردراوەی خۆی بەدی کرد، ترسی لێ هەستا و بڕیاری دا ئەویش بە ژار لەناو ببات. بەڵام دارا لە پیلانەکەی ئاگەدار بووەوە و ناچاری کرد خۆی ژار بخوا و بمرێ.

## بەشی چوارەم

## [ کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی یۆنانییەکان و هیندییەکاندا ]

هێرشی یۆنانییەکان بۆ سەر خاکی ماد و فارس:

وڵاتی یۆنان لە دوورگەی جۆرەوجۆری گەورە و گچکە پێکهاتووە و هەر دوورگەیەک لەژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەکدا بووە. ئەم فەرمانڕەوایانە لەناو خۆیاندا یەکگرتوو و تەبا نەبوونە، بگرە هەموو کات هێرشی تاڵانکەرانەیان بۆ سەر یەکتر هێناوە. لەبەر ئەم هۆیە، پاشاکانی ماد و پارس بەسەریاندا زاڵ بوونە.

مەقدۆنیا ولایەتێکی گەورەی وڵاتی یۆنان بوو کە پاشاکەی ناوی "فیلقوس" بوو و دەیویست ولایەتەکانی یۆنان یەکگرتوو بکات و هێرش بکاتە سەر خاکی ماد و پارس. لەوەش ئاگەدار بوو کە تا ئەو کاتەی چەک و ئامرازی شەڕیی لە دوژمن باشتر و باڵاتر نەبێت ناتوانێ بەسەر ئەوان واتە مادەکان و پارسییەکاندا زاڵ بێ. بەڵام کاتێک دەستی بە نوێسازیی چەکەکان و ئامادەکاریی شەڕ کرد، پیاوێک بە ناوی "پاسانیاس" بۆ چارەسەرییەکی یاسایی ڕووی لە دەرباری فیلقوس کرد و کێشەکە لە بەرژەوەندیی ئەو بڕیاری لەسەر نەدرا، بۆیە دڵی لە فیلقوس ڕەنجا و لە هەلێکدا کوشتی. دوای ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە، "ئەسکەندەر"ی کوڕی فیلقوس هاتە سەر تەختی مەقدۆنیا و ئیشوکارەکانی شەڕی کە باوکی دەستی پێ کردبوو گرتە دەست خۆی.

دەستپێکردنی شەڕ:

ئەسکەندەر لە ساڵی ٣٣٤ی پێش زاین سەرەتای شەڕی کردەوە و بۆ داگیرکردنی وڵاتەکانی ئاسیا بەڕێ کەوت. سەرەتا سووریا و میسری داگیر کرد و پاشان ڕووی کردە ناوچەکانی ماد و پارس و یەکەم شەڕ لەگەڵ وڵاتی ماد و پارس لە لێواری دەریای "کرینوکوس" (گرانیک) ڕووی دا. دووەم شەڕ لە ناوچەی "ئیسوس" ئەنجام درا. لەم شەڕەدا، سەربازانی مادەکان و پارسییەکان شکستیان

خــوارد و بەرەو دواوە پاشــەکشــەیان کــرد. ئەسکەندەر بە شــوێن دارا کــەوت و شــارۆکە و ولایەتەکانی وردە وردە داگیر کرد تا گەیشتە ناوچەی "گاگا میلان" و لێرەش دوای شەڕێکی سەخت، دارای شکست دا.

لە ئاکامی ئەم شکســتــەدا، دارا بێــدڵ بوو و ناوچەکــەی بەجــێ هێــشت و بەرەو ڕۆژئاوا هەڵات. لە ئەنجام، "بسوس" فــەرمانڕەوای بەلخ و "برســان" مــیری ســیســتــان لە ناوچەی "دمغان" دارایان بە دیل گرت. ئەسکەندەر زۆر بە خێرایی خۆی گەیاندە ناوچــەی ئەوان و کــاتێک بســـوس هــەواڵی هاتــنی ئــەسکەندەری بیـــست، لەگــەڵ هاوکارەکانی خــۆی دارای کوشت و بەم چەشنــە خۆی لە چنگی ئەسکەندەر ڕزگار کرد و چرای سەردەمی بنەماڵەی هەخامەنشیی کوژاندەوە.

هاتنی ئەسکەندەر بۆ هیند:

ئەسکەندەری مــەقدۆنی دوای داگیرکردنی ولایەتەکانی ڕۆژئاوای مــاد و پارس، تا دوو ســاڵ گەشــتی ئەم ســەرزەوییە داگیــرکراوانەی دەکرد. هەر چەند هــەمــوو وڵاتی مــاد و پارســی هێنــابووە ژێر دەســـەڵاتی خــۆی، ســروشــتــی بزۆزی وڵاتگیــرانەی تینــووێتی بەم ســەڵتــەنەتــە پان و بەرینەدا نەشکاند و چڵــێــسی وڵات داگیــرکــردن دیسان واداری کرد کە داگیرکردنی ئەم وڵاتانەی کەوتبوونە ڕۆهەڵاتی ماد و پارس هەڵسێ و بیــانهێنێتە ژێر دەســەڵاتی فــەرمانڕەوایی خــۆی. بۆ جێبەجێکردنی ئەم مــەبەســتــەش، زنجــیرە چیــای "هندوکــوش"ی تێ پەڕاند و هاتــە ناو خــاکی هیند و ولایەتی "پــەنجــاب"ی داگیــر کــرد. بە نیــاز بــوو هێــشــتــان بەرەوپێش بڕوات و ئەو ولایەتــانەی کــە کــەوتبــوونــە ڕۆهەڵاتی پــەنجــاب داگــیـــر بکات. بەڵام ســـەربازە یۆنانییەکان سەرپێچییان لە فەرمانەکەی کرد و بەرەوپێش نەچوون.

گەڕانەوەی ئەسکەندەری مەقدۆنی:

کــاتێ ئەســکەندەر هەســتی بەوە کــرد کــە ســەربازەکانی لە شــەڕ و هێــرشکردنی بەردەوام بێــزار و بێــدڵ بوونە، بە ناچاری و دەست دامــاوی بڕیاری گــەڕانەوەی دا. ســەرەتــا بەرەو باشــوور کــەوتە ڕێ و هــاتە ناو خــاکی سندان و لە لێــواری ڕووباری سندان[11] ســەربــازگەی دامەزراند. لــەوێ ســوپاکەی بەســەر دوو بەشدا دابەش کرد،

---

١١. دەبێ مەبەست "ڕووباری سند" بێ کە سەرچاوەی هەرە گەورەی ئاودانی پاکستانە =

بەشێکی کە لە سامان و باری گران و سەربازی بریندار پێکهاتبوو بە سەرۆکایەتیی سەرلەشکر "کرایتوراس" لە ڕێگەی تورانەوە بەرەو زابلستان نارد و خۆیشی لەگەڵ سوپاکەی لەوێوە چووە بەندەرگای "دیول". لێرە بۆ جاری دووەم سوپاکەی بەسەر دوو بەشدا دابەش کرد و بەشێکیانی بە سەرۆکایەتیی "نیارکوس" میری دەریا بە کەشتی و بەلەم بە ڕێگای ئاویی دەریای "عومان" بەرەو پارس نارد. بەشەکەی تریشی بە سەرۆکایەتیی خۆی بە ڕێگەی وشکیدا بەرەو پارس بەڕێ کەوت. سەرەتا هاتە ناوچەی "ئەرمابیل"ی خوارووی توران و دوای تێپەڕاندنی چەند ناوچەیەک گەیشتە ولایەتی مەکران. لە مەکرانەوە چووە پارس و لەوێشەوە هاتە بابل. لە بابل تووشی نەخۆشی هات و لە سەردەمی لاوێتی لە تەمەنی ٣٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

شەڕی کوردەکانی توران و مەکران لەگەڵ سوپای ئەسکەندەر:

کاتێک کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران هەواڵی ئەوەیان پێ گەیشت کە ئەسکەندەری مەقدۆنی لەگەڵ سوپاکەی لە خوارووی توران و مەکرانەوە دەگەڕێتەوە پارس، سەرۆکەکانی کوردی توران و مەکران لەگەڵ یەک ڕاوێژیان کرد و بڕیاریان دا بە لە بەرچاو گرتنی نەریتی جوامێریی کوردە بەلوچەکان لەگەڵ دوژمن بجەنگن. بۆ ئەوەی دوژمن ئەو گومانە نەکات کە دانیشتوانی خاکی توران و مەکران بێ هیچ بەرهەڵستکاری و خوێن ڕشتنێک خاکی خۆیان دەدەنە دەست دوژمنەوە.

نەخشەدانانی شەڕ:

ئەسکەندەر هێشتان لە خاکی سندان بەڕێوە بوو کە سەرۆکەکانی کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران لە ناوچەی "مەنگور"دا کۆ بوونەوە و پیلانی شەڕیان دانا و شێوازی بەرگریکاریی ناوچەکانیان ڕێک خست. تیرەکانی بۆلانی و گۆرانی

---

= و لە هیندستانەوە سەرچاوە دەگرێ، بە نێو هەرێمەکانی پاکستان تێپەڕ دەبێ و لە کۆتاییدا دەڕژێتە نێو ئۆقیانووس. بەپێی پەیمانی "سندتاس" کە لەژێر چاودێریی بانکی نێودەوڵەتی لە ساڵی ١٩٦٠ ئەنجام درا، ئاوی ئەم ڕووبارە پاکستان بەکاری دەهێنێ.

لەگەڵ سەردارەکانیان میر بەروز بۆلانی و میر روشی گۆرانی بەرگریی تەنگەی بۆلانیان پێ ڕاسپێردرا. میر شادین غوزداری و میر راسن مشکانی لەگەڵ تیرەکانیان بەرگریکردنی تەنگەی میلایان پێ ڕاسپێردرا. میر کیکان لەگەڵ تیرەکانی کیکانی، سارونی، ئەرمیلی و گریشکانی و هەروەها میر لبوسان لەگەڵ دەستەکانی تیرەکانی ئەدرەگانی، ماملی و کرمانی هاتنە ئەرمابیل و لەسەر ڕێگەی تێپەڕبوونی ئەسکەندەر سەنگەریان دروست کرد و چاوەڕێی هاتنی بوون.

شەڕ و دەرچوونی کوردە بەلوچەکان لە تەنگەی میلا:

کاتێک کرایتوراس سەرلەشکری یۆنانی لە لێواری ڕووباری سندانەوە گەیشتە دەشتی "بەدهان" و لەوێوە هاتە تەنگەی میلا، تیرەکانی کوردی بەلوچ شەڕی لێدان و دەرچوونیان دەست پێ کرد، شەوانە هێرشیان دەکردە سەر سەربازگەکەیان و سەربازانی دوژمنیان دەکوشت. کرایتوراس زۆر بە سەختی و دژواری تەنگەی میلای تێ پەڕاند و هاتە دۆڵی "کوهیرانی". لە بەردەم ئەم دۆڵە لە ناوچەی "زیدان" شەڕێکی سەخت لە نێوان کوردە بەلوچەکان و یۆنانییەکان ڕووی دا. میر راسن مشکانی کوژرا و میر شادین لەباری زامداریدا خۆی ڕزگار کرد و بەرەو ئەرمابیل بۆ یارمەتیدانی کوردە بەلوچەکان بەڕێ کەوت.

هاتنی ئەسکەندەر بۆ ناو خاکی توران و داگیرکردنی ئەرمابیل:

لەو کاتەدا، ئەسکەندەری مەقدۆنی لە وڵاتی سندانەوە هاتە ناوچەی ئەرمابیلی توران و لە دۆڵی "ئەرمیلان" سەربازگەی دامەزراند. لێرەدا کوردە بەلوچەکان و یۆنانییەکان ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە و کوردە بەلوچەکان شەڕی لێدان و دەرچوونیان دەست پێ کرد. دوای شەڕێکی سەخت، لەشکری کوردە بەلوچەکان بەرەو دواوە کشایەوە. میر جاگین سارونی و میر نورگان ئەرمیلی لەگەڵ دەستەسەربازەکانی خۆیان هاتنە ناو قەڵای ئەرمابیل و سەنگەریان بەست. ئەسکەندەر بە خێرایی بە دوایاندا گەیشتە ئەوێ، شارەکەی گەمارۆ دا و سەربازەکانی لە هەرچوار لاوە هێرشیان بردە سەر قەڵاکە و داگیریان کرد. لەم کوشت و کوشتارەدا لاوی شەڕوانی زۆری کوردە بەلوچەکان کوژران.

شەڕ لە تەنگەی "حوللین":

دوای داگیربوونی شاری ئەرمیلان، تیرەکانی کوردی سارونی و ئەرمیلی ڕایان کردە تەنگەی "حوللین" کە لێرەدا تیرەکانی تری کوردی توران و مەکران بۆ شەڕکردن لەگەڵ یۆنانییەکان کۆ بووبوونەوە. ئەسکەندەر لەگەڵ سەربازەکانیدا بە زوویی بە شوێنیاندا گەیشتە ئەوێ. پێکدادانێکی خوێناوی لە نێوانیاندا ڕووی دا و یۆنانییەکان بەسەر کوردەکان زاڵ بوون. لە ئاکام کوردەکان پاشەکشەیان کرد و لەنێو کەژەکاندا بڵاو بوونەوە. دوای ئەوە، هەموو تیرەکانی کوردی بەلوچ لە دۆڵی "گلگالا" کۆ بوونەوە و خۆیان بۆ شەڕێکی گەورە ئامادە کرد.

شەڕی "گلگالا" لە ناوچەی "راس کیچان":

ئەسکەندەر لەگەڵ سوپاکەی زۆر بە سەختی تەنگەی حوللینی تێ پەڕاند و لە دۆڵی گلگالا سەربازگەی دامەزراند. ئەم دۆڵە کەوتووەتە نێوان ڕووباری "پورال" و زنجیرە چیای "حوللین" کە مەیدانێکی پان و بەرینە. ئەسکەندەر لێرە مایەوە و چاوەڕێی دەکرد کە سوپایە ئاوییەکەی بگاتە لێواری "راس کیچان" کە بە دۆڵی گلگالاوە لکابوو و لەنگەر بهاوێن، پاشان لەشکری وشکایی و ئاوی پێکەوە ڕاوێژ بکەن و دوای کۆکردنەوەی تۆشەی ڕێگە، بەڕێ بکەونەوە.

کوردە بەلوچەکان کە لە کەژەکانی دۆڵی گلگالادا کۆ بووبونەوە دەستیان کردە سەر هێرشبردنە سەر لەشکرگەی ئەسکەندەر. شەڕی لێدان و دەرچوونیان تا پێنج شەو و ڕۆژ بەردەوام کرد. سێ شەو لەسەر یەک هێرشیان بردە سەر لەشکرگەی ئەسکەندەری مەقدۆنی، بەرەبەیان دەگەڕانەوە کەمینگەکانیان و لەناو دۆڵ و شاخەکاندا خۆیان دەشاردەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی سەربازە یۆنانییەکان ناخۆشیی شەکەتی و بێ خەوی بچێژن. لەباری بێ خەویدا بمێننەوە و هێزی بەرگرتنیان تێک بچێ. ڕۆژی پێنجەم سەرلەشکرەکانی کوردە بەلوچەکان بەرەبەیان بە ٢٥ هەزار سەربازی سوار لە سێ قۆڵەوە شالاویان بردە سەر لەشکرگەی ئەسکەندەری مەقدۆنی و بە شێوازی ڕیزبەندی شەڕیان دەست پێ کرد. سەرەتا ڕیزی یەکەم هێرشی بردە سەر دوژمن، پاشان ڕیزی دووەم جووڵایەوە و ڕیزی سێیەمیش بە دوای ڕیزی دووەم بەڕێ کەوت. هەموو تێکڕا

هێـرشـیـان بردە سـەر دوژمن و ڕۆژێکی زۆر سـەخـتـیـان بەسـەر سـەربازە یۆنانییەکاندا کردەوە. ئێوارە شەڕ کۆتاییی پێ هات و ١٠ هەزار پاڵەوان و لاوی کوردی بەلوچ کە شەڕکەر و ئازا و بە ئەزموون و ڕیزشکێن و خۆبەختکەر بوون بۆ بەرگری و پارێزگاریی نیشتمانەکەیان وەکو پێشمەرگە هاتنە مەیدان و گیانیان لەدەست دا. لەم شـەڕە خـوێنڕێژ و ترسناک و دڵپـێک و دڵبڕین و دڵازارەدا، ئەم سـەرۆکانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی: میـر جـاگێن سـارونی و مـیـر ئاچاک گریشکانی گیانی خۆیان لەدەست دا و لە مێژووی فیداکاریدا ناوی خۆیان تۆمار کرد.

کاربەدەستانی ئەسکەندەری مەقدۆنی لە توران و مەکران:

کـاتێک ئەسکەندەری مـەقـدۆنی ناوچەی خوارووی توران واتە ئەرمابیلی داگیـر کـرد، یەکێ لە سـەردارانی لەشکرەکـەی کـە نـاوی "هیـفی سـون" بوو لەو ناوچەیە بەجێ هـێـشت، بۆ ئـەوەی ڕێژیمی بەڕێوەبـردنی ئەم ناوچە تازە داگیـرکـراوانە بە شێوە و نەریتی یۆنانی بەڕێوە ببات. ئەسکەندەر پاشان هاتە ناو خاکی مەکران و سەرلەشکر "ئەپالی فانیس"ی بە فەرمانڕەوای ئەم ولایەتە دانا.

دەستبەکاروونی "کساندوس" وەکو فەرمانڕەوای توران و مەکران:

دوای ئەوەی ئەسکەندەری مەقدۆنی کۆچی دواییی کرد، سەرلەشکرێکی بە ناوی "سیلوکوس" هاتە سەر تەختی دەسەڵاتداریی ماد و پارس. ئەویش لەلای خۆیەوە پلەدارێکی لەشکری، "کساندوس"ی بە دادگەری توران و مەکران هەڵبژارد. دوای ئەوە کـسـانـدوس هاتە مـەکـران و دەسـەڵاتی حکوومـەتی ئەم دوو ولایەتـەی گـرتە دەست.

بارودۆخی نەگونجاوی کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران:

دوای ڕووخـانی پاشـایەتیی هەخامـەنشـیـیـەکان، فـەرمـانڕەوایە یۆنانییـەکان لە گشت ولایەتەکـان هاتنە سـەر کـار، گـۆڕانکارییـان بەسـەر شـێوەی ڕێکخـسـتنی هەخامەنشییەکاندا هێنا و لە جیاتیدا شێوە و دابی ڕێکخستنی یۆنانییان بە زۆر بەسەر ماد و پارسدا داسەپاند. هەر دەستـە و لایەنێک سـەرپێچیی لێ بکردایە، ئەوا دەسـەڵاتدار و کاربەدەستە یۆنانییەکان هێرشیان بۆ سـەر دەبردن. لەبەر ئەم

هۆیە، بەگشتی لە وڵاتی ماد و پارس ئاسایش و ئاشتی بەدی نەکرا و بازاڕی شەڕ و پێکدادان و کوشت و بڕین بەردەوام بوو.

کوردە بەلوچەکانی توران و مەکرانیش لە پەیڕەوکردنی شێوازی بەڕێوەبەرایەتیی یۆنانییەکان بێدڵ و ڕەنجاو بوون و ئامادە نەبوون ملکەچی بن. هەر ئەمەش بووبووە هۆی ئەوەی یۆنانییەکان لێیان دڵڕەش و بە قین بن و لەم بارودۆخە ناڵەبار و بێ چارەییەدا ژیان بەسەر بەرن.

هێرشی سیلوکوس بۆ سەر وڵاتی هیند:

سیلوکوس سەرلەشکری یۆنانی ماوەیەکی درێژ بەسەر فەرمانڕەواییەکەی لە ماد و پارس تێپەڕی نەکردبوو کە نازی بە بەهێزی و پتەویی خۆیەوە کرد و بە هۆی فراوانیی ئامراز و کەرەستە لە سەڵتەنەتە پان و بەرینەکەیدا لەخۆبایی بووبوو و خۆی لە وڵاتی هیند بە تواناتر دەزانی. ئەمەش وای کرد بە بێ هیچ تێڕامان و بیرکردنەوەیەک بەخێرایی هێرش بکاتە سەر هیند. بەڵام "چەندەران گوپتان مۆریان" شکستی دا و کاتێ زانی توانای بەرەنگاربوونەوەی نەماوە و هەستی بە هەڵە و باری ناهەمواریی خۆی کرد، داوای ئاشتیی کرد و هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی سەڵتەنەتی ماد و پارس کە لکا بوون بە وڵاتی هیندەوە وەکو تاوانی شەڕ دایە پاشای هیند. بەم شێوەیە ولایەتی توران و مەکران لەژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایی وڵاتی ماد و پارس دەرهات و هاتە ژێر دەسەڵاتی وڵاتی هیند.

کوردە بەلوچەکان لەژێر دەسەڵاتی وڵاتی هیند:

ئەم گۆڕانکارییە سیاسییە، فەرمانڕەوایی کوردە بەلوچەکانی ڕووبەڕووی کێشە و ناکۆکی و سەختی جۆرەوجۆر کرد. لەبەرئەوەی لە سەردەمی کۆندا وڵاتە سەرکەوتووەکان ئەم نەریتەیان بەکار هێناوە کە کاتێ ولایەتێکی نوێ بهاتبوایە ژێر دەسەڵاتیان، ئەوا دانیشتوانی ڕەسەنی ئەو ناوچانەیان دەگواستەوە وڵاتەکەی خۆیان و لە جێگای ئەوان نەتەوەی خۆیانیان لێ نیشتەجێ دەکرد. لەم بارودۆخەدا، کوردە بەلوچەکان دوو ڕێگەیان لەدەست دابوو: یەکەم، خۆیان بدەنە دەست دەسەڵاتدارە هیندییەکان و ملکەچی دەسەڵاتی هۆزە هیندییەکان بکەن. دووەم، بەپێچەوانە، سەربەخۆیی خۆیان بە پتەوی بپارێزن و لەدەستی نەدەن و بۆ

بەردەوامبوونی کۆشش بکەن. کوردە بەلوچەکان ڕێگەی دووەمیان هەڵبژارد و بۆ مانەوە و بەردەوامبوونی سەربەستیی خۆیان، دەستیان بە تێکۆشان و دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک کرد.

هاتنی تیرە هندییەکان بۆ ناوچەی توران و مەکران:

کاتێک بەرپرسە هندییەکان دەسەڵاتداریی بەڕێوەبەرایەتیی میرنشینەکانی توران و مەکرانیان گرتە دەست، هاتنی تیرە هندییەکان بۆ ناوچەی توران و مەکران دەستی پێ کرد. کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی کۆندا بەو تیرانەی "سندان"یان دەگوت "جدگال". ئەم تیرانە وەکو کوللە و مێرووله هێرشیان هێنایە سەر خاکی توران و مەکران و کوردە بەلوچەکانیان بە تەواوی لە مەکران دەرکرد. هەرێمەکانی ناوەند و خوارووی تورانیشیان کە بە "غوزدار" و "ئەرمابیل" دەناسران داگیر کرد و کوردە بەلوچەکانیان لەوێش بەدەرنا. بەڵام نەیانتوانی هەرێمی باکوری توران کە بە ناوی کیکانان دەناسرا داگیر بکەن، لەبەرئەوەی هەموو ئەو تیرانەی کوردی بەلوچ کە شکستیان خواردبوو، لەم هەرێمەدا کۆ بووبوونەوە و تیرەکانی کوردی زابلستانیش واتە: سەباحی، سنجاوی، سفاری و زەنگەنە، بۆ یارمەتی و هاوەڵیی برا بەلوچەکانیان هاتبوونە ناوچەی کیکان. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هێزی بەرگرییان پتەوتر بێت و جدگالەکان ئەو هیمەتەیان نەبوو شاڵاو بەرنە سەر کوردە بەلوچەکان.

هۆی یارمەتیی کوردەکانی زابلستان:

لە ڕۆهەڵات و باشوورەوە سنووری زابلستان بە توران و مەکرانەوە لکا بوو و فەرمانڕەوای زابلستان میر برسان لە نەژادی کورد بوو و کاتێ ئەم بارودۆخە نەگونجاوەی کوردەکانی توران و مەکرانی بەدی کرد، دڵی سووتا و لەناوچوونی ئەوانی بە بێهێزیی نەژادی کورد زانی. هەروەها، لەوەش ئاگەدار بوو کە بە لەناوچوونی تەواوی کوردەکانی توران و مەکران، ورەی جدگالەکان بەرز دەبێتەوە و هانیان دەدا هێرش بۆ سەر زابلستانیش بهێنن. لەبەر ئەم هۆیانە، خۆی بۆ هاوەڵیکردنی کوردە بەلوچەکان ئامادە کرد و بەڕێ کەوت.

شەڕی سەختی "سوهر ئابادان":

دوای داگیرکردنی ولایەتی مەکران و ناوچەی باشوور و ناوەندی ولایەتی توران، جدگالەکان لە سوهر ئابادان کۆ بوونەوە و سەرۆکەکەیان میر "ئەگماران" لە قەلای "نغان" لەگەڵ تیرەکانی: بنیان، مویدان و تاگین نیشتەجێ بووبوو و لەگەڵ کاربەدەستەکانی خۆی لەم بگرە و بەستەدا بوون کە چۆن هێرش بۆ سەر کیکان پایەتەختی توران بەرن. کوردە بەلوچەکان هەواڵی ئەم پیلانەیان پێ گەیشت و زۆر بەچاپووک دەستی هێرشیان بردە سەر سوهر ئابادان و لە ڕووبەڕووی سەربازگەی جدگالەکان لەشکری خۆیان بۆ شەڕ ڕیزبەندیی کرد. بەرەبەیان هەموو تێکڕا هێرشیان بردە سەر سەربازگەی دوژمن و شەڕیان دەست پێ کرد. میری زابلستان میر برسان لەگەڵ تیرەکانی کوردی سەباحی ، سنجاوی، سفاری و زەنگەنە هێرشیان بردە سەر قۆڵی ڕاستی دوژمن، میری توران میر کیکان لەگەڵ تیرەکانی کوردی براخۆیی هێرشیان بردە سەر قۆڵی لای ناوەندی لەشکری دوژمن و میری مەکران میر کباد لەگەڵ تیرەکانی ئەدرەگانی، ماملی و کرمانی شالاویان بردە سەر قۆڵی چەپی لەشکری جدگالەکان.

ئەم شەڕە تا سێ ڕۆژ بەردەوام بوو، جدگالەکان شکستیان خوارد و پاشەکشەیان کرد. پاشان میری جدگالەکان هێزی بەرگریکردنی لە خۆدا نەبینی و داوای ئاشتیی کرد و بەپێی پەیمانی ئاشتی دۆڵی سوهر ئابادان کرا بە سنووری نێوان ناوچەی کوردە بەلوچەکان و جدگالەکان. دەڵێن ئەم شەڕە لە ساڵی ٢٩٠ی پێش زاین ڕووی داوە.

لکاندنی ناوچەی کیکانان بە میرنشینیی زابلستان:

دوای هاتنی یۆنانییەکان و تیرەکانی جدگالەکانی سندان، شیرازەی "بولکی" (هۆزایەتی)ی کوردە بەلوچەکان لە مەکران و توران تێک چووبوو و لە بناخە دەرچووبوو. سەران و سەردارانی کوردە بەلوچەکان کە دنیادیتە و بە ئەزموون و کارزان و تێگەیشتوو بوون، لە شەڕەکانی یۆنانی و جدگالەکاندا گیانیان بەخشیبوو. میر راسن مشکانی لە چەنگی "کرایتوروس"ی سەرلەشکری یۆنانی لە تەنگەی "میلا"دا کوژرابوو، لەلایەکی تر میر جاگین سارونی، میر ئاچاک

گریشکانی، میر بۆلان ماملی و میر توران کرمانی لە شەڕی ئەسکەندەر پاشای یۆنانی شەهید کرابوون و هەروەها میر شادین غوزداری، میر نورگان ئەرمیلی و میر بەروز بۆلانی لە شەڕی خوێناویی سوهر ئاباداان کوژرابوون. لەناو سەرۆکەکانی کوردە بەلوچەکان تەنیا میر کیکان کیکانی و میر روشی گۆرانی لەم لێدان و کوشت و کوشتارانەدا بە ساغی مابوونەوە و شەهید نەکرابوون. ئەمەو لەبەرئەوەی شێوەی رێکخستنی هۆزایەتیی کوردە بەلوچەکان تێک چووبوو، نەیاندەتوانی سیاسەت و بەڕێوەبەرایەتیی خۆیان بێ یارمەتی و هاوەڵێی لایەنی تر بەڕێوە بەرن. بۆیە هیچ چارەیەکی تریان نەدۆزییەوە جگە لەوەی ناوچەی کیکانان بە میرنشینیی زابلستانەوە بلکێنن و پێیەوە پێوەست بن.

## بەشی پێنجەم

# شارستانیی کوردە بەلوچەکان

ئاینی کوردە بەلوچەکان:

ئاینی کوردەکان بەر لە کۆچکردنیان بۆ ناوچەکانی ماد، زۆر تاریک و نادیارە. بەڵام دوای هاتنیان بۆ ناوچەکانی ماد، لە شوێنەوار و نیشانەکان وا دەردەکەوێت کە ئاهوراپەرست واتە ڕۆشنایی پەرست بوونە، ڕووناکییان خۆش ویستووە و لە تاریکی ترساون و پێی دڵتەنگ بوونە.

وشەی ئاهورا لە "ئا" و "هور" پێک هاتووە. هور مانای "ئاگر" دەدات و "ئا"ش مانای "هاتوو" دەگەیەنێت واتە ڕاستییەک کە لە ئاگرەوە هاتبێت. ئەم ڕاستییەش چییە؟ "ڕووناکی"یە. کوردەکان ئاگریان بە هێمای ئەو ڕاستییە زانیوە. واتە ڕووناکییان بە پیرۆز زانیوە و دەیانپەرست. ڕۆژیشیان هەر بەم بۆنەیەوە کە نیشاندەری ڕاستیی ڕووناکییە بە پیرۆز زانیوە و دەیانپەرست.

کاتێک کوردە بەلوچەکانیش لە توران و مەکران نیشتەجێ بوون، ئاینی خۆیان برەو پێ دا و ئاینی بتپەرستیی تورانییەکانیش کە بەر لە هاتنی کوردەکان لەم ولایەتانە باوی هەبوو تەرک کرا.

نەریتی ئاینی کوردەکان زۆر سادە و ئاسان بووە. لە ڕۆژێکدا سێ جار، لە کاتی ڕۆژ هەڵهاتن و ڕۆژ ئاوابوون و چاشت یان نیوەڕۆدا، ئاگریان دەپەرستی. پەرستگەکەیان بە "ئارین" کە لە "ئار"ەوە هاتووە ناو بردووە. بە پاسەوانی ئاگردانی پەرستگەکەیان دەگوت "ئاریوان". بە گشتی لە هەر شار و لادێیەکدا ئاگردانێک هەبووە.

لە ولایەتی توران دوو پەرستگەی گەورە بە ناوی "ئارین زاوک" و "ئارین حەلوان" هەبووە کە فەرمانڕەواکانی کوردە بەلوچەکان لە شاری کیکان و غوزدار دروستیان کردبوو. ئەم دوو پەرستگەیە لەسەر لووتکەی چیای زاوک و حەلوان دروست

کرابوون. کوردە بەلوچەکان ئەم دوو پەرستگەیەیان زۆر بە پیرۆز دەزانی و لە ساڵێکدا دووجار، لە وەرزی بەهار و پایزدا، لە هەموو لایەکی توران و مەکرانەوە بۆ زیارەتی ئەم پەرستگەیانە دەهاتن. لەگەڵ هاتنی خۆشیاندا، دیاری و خواردنێکی زۆریان دەهێنا و چەندین ڕۆژ لەم پەرستگەیە پیرۆزانەدا دوعایان دەکرد و خەریکی پەرستنی یەزدان دەبوون.

چۆنیەتیی دروستکردنی بینای ئارین (پەرستگە):

لەبەرئەوەی داوونەریتی ئاینی کوردە بەلوچەکان زۆر سادە بووە، چۆنیەتیی دروستکردنی پەرستگەکەشیان لە ڕووی ڕازاندنەوە و نەخشاندنەوەی دەرەکی پاک بووە.

کوردە بەلوچەکان لە دینداری درێغییان نەکردووە. هەر بۆیە بینای پەرستگەکەیان پان و بەرین بووە و بە شێوەی لاکێشەیی دروست کراوە و تێیدا شەو و ڕۆژ ئاگر کراوەتەوە و خەڵک بۆ پەرستنی یەزدان کە ڕووناکییان بە نووری ئەو دەزانی دەهاتنە ژووری پەرستگەکە. لە ناوەندی ژووری پەرستگەکەدا بازنەیەک هەبووە کە تێیدا سێ ئاگردان هەبووە هەموو کات ئاگریان تێدا دەسووتا. خەڵکانی پەرستیاریش لە دەوری ئەم بازنەیەدا دادەنیشتن و نووری یەزدانیان دەپەرستی.

داوونەریتی کوردە بەلوچەکان:

أ. کوردە بەلوچەکان باوەڕیان بە ژیانی پاش مردن نەبووە و مەرگیان بە هۆی پچڕانی پێوەندیی بەردەوامی لە ئەهریمەن زانیوە. سەرەتا لاشەی مردوویان نەناشتووە و لەسەر بەرد یان لە جێگەی بەرزدا بەجێیان هێشتووە بۆ ئەوەی باڵندە و ئاژەڵ بیانخۆن و دووبارە ببنەوە بەشێک لە جەستەی گیانەوەران. بەڵام لە دواییدا، ئەم نەریتەیان تەرک کرد و مردوویان لەناو جەڕەی گەورە داناوە و لەناو کێوەکاندا ناشتوویانن.

ب. نەریتی مارەبڕین لە نێوانیاندا باو نەبووە. بۆ ئەنجامدانی زەماوەند، تەنیا ڕەزامەندیی هەردوولا واتە ژن و پیاو و باوک یان سەرۆکی بنەماڵە پێویست بووە.

ج. فرەژنی لەناو کوردەکاندا یاساخ نەبووە، بەڵام پێک گەیشتنی ناشەرعی (زینا) بە سەختی یاساخ بووە.

ج. دایک و کچ و خوشکیان بە ژن نەهێناوە و زەماوەند لەگەڵیاندا حەرام بووە.

ه. نەریتی خەتەنەکردنیان لەناو باو نەبووە.

و. کچەکان تا کاتی باڵغی شەلواریان لە پا نەکردووە.

ز. کورەکان تا تەمەنی باڵغبوون پشتێنیان لە پشت نەکردووە و لە شەڕدا کوشتنیان یاساخ بووە.

ج. کوردە بەلوچەکان لە ڕووی پیشەوە کۆچەر و ڕەوەدار بوونە. مێگەل و مەڕوماڵاتی زۆریان هەبووە و بە گالیسکە بزاون.

ح. کوردە بەلوچەکان خوویان بە نیشتەجێبوونی یەک جێیی نەبووە، هەر بۆیەش کوێستان و گەرمیانیان کردووە.

ی. پاشان کە ژیانی شاریان هەڵبژارد، دەستیان بە پیشەی کشتوکاڵ، باخەوانی و دارچاندن کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ زەخیرەکردنی ئاو، بەنداوی وایان دروست کرد کە بە دیتنی مرۆڤ سەری دەسوڕمێ.

ک. دەسەڵاتی بنەماڵە لای باوک و گەورەی بنەماڵەکە بووە. پاشان سەرۆک هۆزەکانیش لە چارەسەری کێشە گرینگەکان بڕیاردەر بوونە. لە هەموو کێشە ناوخۆییەکانی تر، دەسەڵاتی چارەسەرکردن بە تەواوی لە دەست سەرۆک هۆز و ڕیشسپییەکاندا بووە.

ل. کاتێک لەژێر دەسەڵاتی سوڵتانێکدا بوونایە، تەنیا سەرۆک هۆزەکان لایەنی پێوەندیکار لەگەڵ سوڵتاندا بوونە. ئەم لایەنە پێوەندیکارییەش پێوەندیی بە ئیشوکاری سیاسی و میریی وەکو شەڕ، ئاشتی، باج، لەشکر و نموونەی ئەوانە بووە.

م. لەگەڵ دراو ئەوەندە ئاشنا نەبوونە. پێداویستییەکانی خۆیان تەنیا لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕی کەلوپەلەوە بەدەست هێناوە.

ن. جلوبەرگ و کەوشیان زۆر بە سادەیی لە خووری و پێستی ئاژەڵی خۆماڵی یان کێوی دروست کردووە.

س. ژنەکان لە ئیشوکاری ڕۆژانەدا شان بەشانی پیاوەکان کاریان کردووە.

ع. چەکی کوردە بەلوچەکان لە تیروکەوان، گورز، شمشێر، خەنجەر، گوریسی ڕاو و بەردەقانی پێکهاتووە.

غ. نەریتی "حاڵ گرتن"[12]. نەریتی حاڵ گرتن لەناو کوردە بەلوچەکاندا باو بووە. کاتێک کەسێکی غەریب هاتووەتە ناو شارێک یان گوندێک و چووەتە ماڵی کەسێک، خاوەن ماڵ پاش بەخێرهاتن، هەواڵی سەفەرەکەی لێ پرسیوە. لەم ڕووەوە خاوەن ماڵ هۆی هاتنی کەسەکەی بۆ دەرکەوتووە.

ش. نەریتی حول. کوردە بەلوچەکان لەشکری هەردەم ئامادەیان نەبووە. لەبەرئەوە، لە کاتی شەڕدا لە ڕێگەی جارچییانەوە هەواڵی شەڕیان بە ناو وڵاتدا بڵاو کردووەتەوە و سەربازە کوردە بەلوچەکانیان ئاگەدار کردووەتەوە. بەمجۆرە هەواڵ گەیاندنەیان گوتووە "حول". حول وشەیەکی کوردییە کە بە مانای ئاشکراکردن دێت. لە کاتی نەریتی حولدا، شوێنی کۆبوونەوەی سەربازەکانیشیان دیاری کردووە. بەمجۆرە، سەربازی لەشکری کوردە بەلوچەکانیش لەو شوێنانە کۆ دەبوونەوە.

کشتوکاڵی کوردە بەلوچەکان:

سەرەتا کاتێک کوردە بەلوچەکان لە ناوەڕاستی ئاسیاوە کۆچیان کرد و هاتنە ماد، وەکو پیشە کۆچەر و ڕەودار بوونە و ماڵ و سەروەت و سامانیان لە مێگەل و مەڕوماڵات پێکهاتووە. بە کشتوکاڵ تامەزرۆ نەبوونە و بە گالیسکە سەفەریان کردووە.

بەڵام ئەم جۆرە ژیانە گۆڕانکاریی بەسەردا دێت کاتێک لە ساڵی ٨٥٠ی پێش زاین میری مەزنی کوردەکان "کەیقوباد" بنەمای سەڵتەنەتی مادی دانا و هێرشی کردە سەر وڵاتی توران و توانی لەناوی ببات و ولایەتەکانی لێ داگیر بکات کە پێک هاتبوون لە: سوغدستان، کابلستان، زابلستان، توران و مەکران. کەیقوباد پاشان تیرەکانی کوردی بەلوچی لەوانە براخۆیی، ئەدرەگانی، ماملی و کرمانی لە

---

١٢. نووسەر ئەم نەریتەی بە "حاڵ گرتن" پێ ناساندووە کە لە کوردی ئەم سەردەمەش هەر بە حاڵ گرتن یان هەواڵ پرسین دێت.

ولایەتەکانی توران و مەکران بڵاو کردەوە. ئەم تیرانە لە توران و مەکران نیشتەجێ بوون و پاشان دەستیان بە کاری کشتوکاڵی کرد. بۆ ئەم مەبەستەش کارێزیان هەڵکەند و بەربەستی ئاویان هەڵبەستا و سوودی زۆریان لە بەروبوومی کشتوکاڵ بەدەست هێنا.

زمانی کوردە بەلوچەکان:

کوردە ڕۆهەڵاتییەکان واتە کوردەکانی ماد بە هەمان زمان وتووێژیان کردووە کە ئاوێستای پێ نووسراوە. کاتێک کوردە براخۆیی، ئەدرەگانی، کرمانی و ماملییەکان هاتنە ناو خاکی توران و مەکران، هەر بەو زمانە گفتوگۆیان دەکرد. لەبەر ئەم هۆیە، خەڵکە خۆماڵییەکان ناویان لێ ناون "کوردگاڵ" واتە ئەو خەڵکانەی کە بە زمانی کوردی دەئاخڤن.

بێژەرەکان دەگێڕنەوە کە کاتێک کەیقوباد پاشای ماد وڵاتی تورانی داگیر کرد و کوردەکان دەسەڵاتی ولایەتی توران و مەکران و زابلستانیان گرتە دەست، هەندێک لە هۆزە تورانییەکان تورانیان بەجێ نەهێشت و نەچوونە سوغدستان کە نیشتمانی ڕەسەنی باپیرانیان بوو و فەرمانڕەواییی کوردەکانیان قەبووڵ کرد. ئەو هۆزە تورکانە کە کۆچیان نەکرد ناوەکانیان بەمجۆرەی خوارەوەیە:

گرگاوی،

گندارچی،

هەنگاسارتی،

موجارک،

ڕەزنداک،

سەمیغان،

سورغان،

مەندغار،

داهیماک،

ڕەتگاسارتی،

میموجاندک،

جوگمان،

هوناک،

جەسفاک،

بەزنجەک،

ئەلیاتون،

کاوکان،

ئەرزنگی،

سارغون، و

کالداش.

ئەم هۆزە تورانییانە بە زمانی تورکی وتووێژیان دەکرد و دوای ئەوەی ملکەچی دەسەڵاتی کوردەکان بوون، تێکەڵاوییان لەگەڵ کۆمەڵگەی کوردەکان دروست کرد و پێیانەوە پێوەست بوون. ئەمەش بەو مەبەستەی پێوەندیی برایەتیی نێوانیان بەهێزتر بێت.

ئەم تێکەڵاوبوونەی کوردە براخۆییەکان لەگەڵ هۆزە تورانییەکان بووە هۆی گۆڕینی زمانەکەیان. ئەم دوو زمانە، واتە کوردی و تورکی، کارتێکەرییان لەسەر یەک دانا و لەگەڵ ڕەوتی سەردەم، کوردە براخۆییەکان پەیڤینیان بە کوردی و تورکی برەو پێ دا.

ڕێژیمی لەشکریی کوردە بەلوچەکان:

لە سەڵتەنەتی ماد بۆ پارێزگاری و بەرگری و ئاسایشی ناوەخۆی وڵات، لە هەموو ولایەتەکان شێوازی لەشکریی کوردەکان وەکو یەک و یەکسان بووە. سوپا لە پیاو پێکهاتووە و گەنجانی هۆزە کوردەکانیان بە سەرباز وەردەگرت و سەرۆک و سەردارانی بەساڵاچوو و دنیادیتە و ڕێکخەر و بە ئەزموونی شەڕ دەبوونە بەڕێوەبەریان.

ئەو دەستەیەی هۆزەکانی کورد کە پیر و ڕیشسپی بوون و بە هۆی بێهێزی توانای بەشداریکردنی شەڕیان نەبوو، لە کاتی شەڕ چاودێریی ژن و منداڵ و شاژنەکانیان دەکرد. هەروەها، ئەرکی پاسەوانیکردنی مەڕوماڵات و چوارپێی

بارهەڵگر و کێڵگە و زەویوزاریشیان لە ئەستۆدا بوو.

نوێنەرایەتیی سوپای کوردە بەلوچەکان:

سوپای کوردەکانی توران و مەکران بەسەر چەند بەشدا دابەش بووە. بە هەر بەشێکی لەشکریان گوتووە "بولک" کە ناوەکانیان بەم شێوەیە بووە: کیکان بولک، گۆران بولک، سارون بولک، غوزدار بولک، مشکان بولک، ئەرمیل بولک، بۆلان بولک، گریشکان بولک، ئەدرەگان بولک، مامل بولک و کرمان بولک. لەسەر ئالآکەیان وێنەی سەری پڵنگ کێشراوە.

بولک لە چەندین تیرە (تایفە)، تیرە لە چەندین بەرەباب (عەشیرە)، بەرەبابیش لە چەندین "شەلوار"ەوە پێکهاتووە. بە خێزانی باوکێک کە چەندین منداڵی هەبووە گوتووە شەلوار. بەمجۆرە، شەلوار لە گەنجانی چەند شەلوارێکی یەک باوکەوە پێکهاتووە. لە سەربازانی چەند شەلواری تیرە و بەرەبابەوە "پارین"یان پێک هێناوە. لە سەربازانی چەند پارینی تیرەوە "جوک" پێک هاتووە و لە جوکەکانی هۆزیش "بولک"یان پێک هێناوە.

لەشکری کوردەکانی توران و مەکران بە سەر دوو بەشدا دابەش بوونە: سەربازانی پیادەڕۆ و سوارە. بەم دوو بەشەیان گوتووە "پایی" و "سوارەس"ی لەشکر. لەشکری پیادەڕۆ لە سێ دەستە: تیرهاوێژ، شمشێروەشێن و بەردەقانیهاوێژ پێکهاتووە. لە شەڕ شمشێروەشێنەکان لە دوای تیرهاوێژەکانەوە ڕادەوەستان و هاوکارییان دەکردن. لە پاش ئەمانیشەوە بەردەقانیهاوێژەکان لە کەمین دەوەستان. بەردەقانیهاوێژەکان ئەو دەستەیەی لەشکر بوونە کە بە بەردەقانی دوژمنیان بەردباران کردووە. خەڵکانی ئەم دەستەیە ئەوەندە بە چاپووکی بەردبارانیان کردووە کە دوژمن خۆیان پێ ڕانەگیراوە و شکاون.

لەشکری سوار لە دوو دەستە: سوارانی بارسووک و سوارانی بارگران پێکهاتووە. سوارانی بارگران هەموو جۆرە چەکێکیان هەڵگرتووە و سوارانی بارسووکیش تەنیا تیروکەوان یان نێزەیان هەڵگرتووە.

کوردە بەلوچەکان هیچ لەشکریی هەموو کات ئامادەیان نەبووە، هەڵبەتە هێزێکی بچووکی سەربازییان هەبووە کە بە ناوی پاسەوانانی سندان دەناسران و لە تیرەکانی کوردە بەلوچەکان پێکهاتبوون. ئەم هێزە لەسەر سنووری هاوبەشی

توران و سندان دامەزرابوو و ئەرکیان ئێشکگرتنی ئەو سنوورانە بووە، بۆ ئەوەی لە کاتی هێرشی دوژمن هەلی بەرگریکردن ئاسان بێت.

ناوی پلەدارەکانی لەشکری کوردەکان بەمجۆرە بووە:

سەران میران،

سەران بولک،

سەران جوک،

سەران پارین، و

سەران شەلوار.

رێژیمی مەدەنیی کوردە بەلوچەکان:

رێژیمی لەشکری و مەدەنیی کوردەکانی مەکران و توران هاوچەشن بووە. جیاوازییان تەنیا ئەوەندە بووە کە رێژیمی لەشکری پێوەندیی بە بەرگریکردنی ولات لە هێرشی دوژمن و رێژیمی مەدەنیش پێوەندیی بە بەڕێوەبەرایەتیی مەدەنییەوە بووە.

رێژیمی مەدەنیی کوردەکان لەسەر بناخەی پێوەندیی برایانەی نێوان هۆزەکان دامەزراوە. هۆز لە تیرە، تیرە لە چەند بەرەباب و بەرەبابیش لە چەند بنەماڵە یان "حەلەک"ەوە پێک هاتووە. بە هۆزیان گوتووە "تمن" یان "بولک"، بە تیرەیان گوتووە جوک، بە بەرەبابیان گوتووە پارین، هەر پارینێکیش لە چەند شەلوار یان حەلەکەوە پێکهاتووە.

لە رێژیمی مەدەنیدا، هۆزەکان لەژێر دەسەڵاتی سەرکردەیەکی مەزندا بوونە کە بە نازناوی "میر میران" بەناوبانگ بووە. هەر هۆز و تیرە و بەرەباب و شەلوارێکیش سەرۆکی تایبەتی خۆی هەبووە کە کوردەکان پێیان گوتوون: میران، سەرگوڵ، کماش و واجە. هەر بەم شێوازە رێژیمی مەدەنیی کوردە بەلوچەکان بەڕێوە براوە.

لادێ و گوند و شارە کوردەکان:

لە سەردەمی کۆندا، لە کاتی دەسەڵاتداریی ماد، ولایەتەکانی توران و مەکران و

زابلستان زۆر سەرسەوز و تەڕ و بە پیت بووە و خەڵکەکانیان ئاسوودە و خۆشحاڵ بوونە. لە هەموو لایەکی ئەم سەرزەوییانە، لادێ و گوند و شارەکان ئاوەدان و بە ڕۆنەق بوونە.

لە شارە کۆنەکان ئێستاش هەندێکیان بە ئاوەدانی ماونەتەوە، هەرچەندە ناوەکانیان گۆڕاوە. بەڵام زۆربەی لادێ و گوند و شارەکان لەگەڵ ڕەوتی سەردەم وێران و کاول بوونە و لەناو چوونە و ئێستا تەنیا شوێنەوارەکانیان ماوە و پێیان دەڵێن "تەپە".

## بەشی شەشەم

## ڕیشەی کوردە بەلوچەکان

ڕیشەی کوردە براخۆییە بەلوچەکان:

بەپێی سەرچاوە و بەڵگەنامە مێژووییەکان، کورد بەسەر دوو بەشدا دابەش دەبن. بەشی یەکەم ئەو کوردانەن کە لەلای ئارارات و زنجیرە چیای جودییەوە هاتوون و لە درێژایی ناوچەی دیجلە و فورات لە ڕۆئاوا تا سووریا و کەنارەکانی دەریای ڕۆم و لە ڕۆهەڵات تا کەنداوی فارس و لێوارەکانی دەریای عومان بڵاو بوونەتەوە. تیرە ڕەسەنەکانی ئەم بەشە لە لۆلۆ، گوتی، کاسو و سوباری پێکهاتوون. ئەم تیرە کوردانە لەبەرئەوەی لەلای ڕۆئاوای دەریای خەزەرەوە هاتوون بە کوردی ڕۆئاوایی دەناسرێن.

بەشی دووەم ئەو کوردانەن کە لە ناوەڕاستی ئاسیاوە بەرەو ڕۆهەڵاتی ئێرانی ئەم سەردەمە هاتوون و لەوێوەش بە ڕۆهەڵاتی دەریای خەزەرەوە تێ پەڕین و لە باشووری ئەم گۆماوە لە ناوچەی ئەتروپان بڵاو بوونەتەوە و نیشتەجێ بوونە. تیرە ڕەسەنەکانی ئەم بەشەش لە ماد، ناهیری و کاردۆخ پێکهاتوون. ئەم وڵاتە پان و بەرینەشی کە تێیدا نیشتەجێ بوون بە بۆنەی ناوی مادەوە بە مادایی یان میدیا ناساند. ئەم حەوت تیرەیە، تیرە ڕەسەنەکانی کوردن و لە دواییدا تیرەی فەرعیی تریان لێ جیا بوومتەوە و هەریەک لەم فەرعانەش بۆ خۆی گۆڕاوە بە تیرە یان هۆزێک. ئەم بەشەی دووەمی کوردەکان بە کوردی ڕۆهەڵاتیشیان پێ دەڵێن.

کوردی براخۆیی و ئەدرەگانی و ماملی و کرمانی لە هۆزی ماد جیا بوونەتەوە. لەبەر ئەوە لێرە درێژە بە باسکردنی بنەچەی تیرەکانی تری کورد نادەین و دێینە سەر باسکردنی ڕیشەی هۆزی ماد.

لە باسکردنی ڕیشەدا، لە حەزرەتی نوحەوە، سڵاوی لێ بێ، دەست پێ دەکەین کە دوای تۆفانەکە باوکە ئادەمی دووەمی مرۆڤایەتی بووە:

نوح سلاوی لیّ بیّ

سام — حام — یافس

١ کومەر — ٢ یادان — ٣ قتوبال — ٤ عیراش — ٥ ماشخ — ٦ مازاییّ — ٧ ماغوع

کومەر

تورک

راسن — سەنجار — خۆشناو — ساسون — دراج

راسن: باپیرە گەورەی راسنی

سەنجار: باپیرە گەورەی سەنجاری

خۆشناو: باپیرە گەورەی خۆشناوی

ساسون: باپیرە گەورەی ساسونی

دراج

حەکار

خۆشناو

دراج — حەکار — شکاک — زاران

دراج: باپیرە گەورەی دراجی

حەکار: باپیرە گەورەی حەکاری

شکاک: باپیرە گەورەی شکاکی

زاران

شوهان —— شکاک —— سەنجار —— ساسون


کرماج
شاد
ئارتوس
بەراز
بارزان
میران
باپیرە گەورەی کرماج
باپیرە گەورەی شادلو
باپیرە گەورەی ئارتوسی
باپیرە گەورەی
باپیرە گەورەی
باپیرە گەورەی
گورەک
سوبار
میران
وان
جودەک
پازو
باپیرە گەورەی جودەکی
کاد
گاور
مامش
جاف
مەنگور
باپیرەی گەورەی مامشی
باپیرە گەورەی جاف
تاکاز
جیگ
مادی بچووک



دیلمان
ماژ
پارتاسن
بوز
ئەستروشات
ئاری زانت
باپیرە گەورەی دیلمانی
باپیرە گەورەی ماژی
باپیرە گەورەی پارتاسانی
باپیرە گەورەی بوزی
باپیرە گەورەی ئەستروشاتی
باپیرە گەورەی ئاری زانتی
بود
ئەدرەگانی
ماملی
کرمانی
زەنگان
براخمی گەورە
باپیرە گەورەی زەنگەنە
جاگین
پوران
ئاروک — دوسەک — حوتان
بوزیک
ئالیک
راسن
جیگ
زوراک
باپیرە گەورەی بوزیکانی
باپیرە گەورەی ئالیکانی
باپیرە گەورەی راسنی
باپیرە گەورەی جیگانی




میر براخمی بچووک هەشت کوڕی هەبوو: کیکان، گۆران، سارون، غوز، مشکان، ئەرمیل، بۆلان و گریشکان. بە هۆی زیادبوونی نەوەی نەژادی ئەم هەشت کوڕەی براخمی بچووک، هەشت تیرەی کوردی براخۆیی دروست بوو بە ناوی: کیکانی، گۆرانی، سارونی، غوزداری، مشکانی، ئەرمیلی، بۆلانی و گریشکانی ناسران. ڕیشەی ئەم هەشت تیرەی هۆزی براخۆیی بەم چەشنەی خوارەوەیە:

ا. کیکان. زوراک. سەنگین. ئارین. پندران. داخور. زیبار. ئومران. سەنگین. خومان. کیکان.

ب. گۆران. شیدان. باشمان. دەلوت. زینل. تەکش. کاش. شیدان. کوساد. باشمان. گۆران.

ج. سارون. زیدەک. باشوک. کورتی. لاسین. مامش. دوسەک. سارم. باسیر. داخور. زاخو.

د. غوز. ئەورام. لاسین. دوغان. کاتین. گیوەر. غوز. گوروس. ماهەک. زوچاپ. مهران.

خ. مشکان. ئەیلە. ئوکی. مشکان. ئەیلە. باشار. مرداس. گیلەک. توراب. کویان. مشکان.

و. ئەرمیل. مەرزەک. زروان. کویان. مەنگور. سابول. مەرزەک. زروان. کاش. شاول. ئەرمیل.

ز. بۆلان. زینل. بوزیک. کازان. مەلیل. کارچی. شاگان. شوهان. کرماج. بوزیک. بۆلان.

س. گریشکان. بەروز. باسیر. گیژ. بولاک. بەروز. گریشکان. کرمجک. ماخان. چرموک. لەرزین.

پاشایەتیی بنەماڵەی پیشدادییەکان:

کاتێک مادەکان بەرەو ناوچەی ئەترۆپان خوارووی گۆماوی خەزەر کۆچیان کرد و لەوێ نیشتەجێ بوون، بە هۆی نیشتەجێبوونیان ناوچەکە بە ناوی ماد ناسرا و ناویانگی دەرکرد. ئەم ناوچەیە کەوتووەتە دەوروبەری باکوور و باشووری ئەسبەهان (ئەسفەهان) و ئەکباتان (هەمەدان).

ئەم دەستەیەی کوردەکان سەرەتا بەش بەش بوونە و هەر بەشێکیش خاوەنی سەرۆکی تایبەتی خۆی بووە. پیشەیان ئاژەڵداری بووە و خۆیان بە چالاکیی سیاسییەوە سەرقاڵ نەکردووە و لەژێر دەسەڵات و فەرمانڕەواییی کلدە، ئاشوور، بابل و عیلام ژیانیان بەسەر بردووە. بەڵام دوای ڕووخانی فەرمانڕەواییی ئەم بنەماڵانە، وڵاتی ماد و پارس لەژێر دەستی ئەوان ڕزگاری بوو و بۆ یەکەم جار بنەماڵەیەکی خۆماڵیی ماد و پارس ناسراو بە "پیشدادی" پاشایەتیی خۆیان لە ماد و پارس دامەزراند و تا شەش پشت فەرمانڕەوایییان کرد.

جەمشید دامەزرێنەری دەوڵەتی پیشدادییەکان بوو و ناوی پادشاکانی ئەم بنەماڵەیە بەمجۆرەیە: جەمشید، ئەپیتان، فەرمیدوون، مەنوچهر، تەهماسپ، وشتاپ و گرشاسپ. گرشاسپ دوا پاشای زنجیرەی فەرمانڕەواکانی بنەماڵەی پیشدادی بووە. دوای مردنی ئەو، وڵاتی ماد و فارس دووچاری بێهێزی و بۆشاییی دەسەڵاتی بووە. هۆکاری ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە لە بنەماڵەی پیشدادییەکان کەسێکی وا نەبووە شایستەی تەختی سەڵتەنەتەکە بێت.

لەو کاتە، ئەفراسیاب لە توران پاشا بووە و خەڵکانی هۆزەکانی کورد و هۆزەکانی تری ماد و فارس بەڕێوەبەرایەتی و دەسەڵاتدارییی ئەویان پەسند نەبووە. لەبەرئەوەی ئەفراسیاب پاشایەکی بەدکردار و بەدخوو و سرووشت خراپ بووە. هەموو میر و سەرۆک و سەردارانی ماد و فارسیش خواستیاری ئەوە بوون وڵاتی ماد و پارس لە هێرش و ڕەفتاری خراپ و لە ڕادەبەدەری ئاشوور ڕزگاری بێت. هەر بۆیە کەیقوباد سەرۆکی مەزنی مادە کوردەکان کە بە زانایی و دادپەروەری بەناویانگ بوو خستە سەر تەختی سەڵتەنەتی ماد. لە ئاکامی ئەم بەرخۆدانە، پاشایەتیی سەڵتەنەتی ماد و پارس لە بنەماڵەی پیشدادییەوە هاتە دەست مادەکان.

مێژوونووسەکان ناوچەی مادیان بە "کیان" و بنەماڵەی مادیان بە "کیانی"ش ناساندووە. پاش ڕووخانی دەسەڵاتی پیشدادییەکان، سەران و سەردارانی هۆزی کوردە مادەکان بە گشتی و سەرۆکەکانی هۆزەکانی پارس، گیل، دیلم و خەزەر دوای پرس و ڕا و ڕاوێژکاریی دوور و درێژ بەم ئاکامە گەیشتن کە سەرۆکی مەزنی مادە کوردەکان کەیقوباد کە بە ئاوەزی و دادپەروەری و کارزانی بەناوبانگ بوو بە دەسەڵاتداری تەختی سەڵتەنەت هەڵبژێرن. لەو کاتە، کوردی براخۆیی تیرەیەکی بەتوانا و مەزنی نەتەوەی کورد بووە و لەگەڵ ڕەوتی مێژوو هەشت بەرەبابی گەورەی لێ بەدی هاتووە کە ناوەکانیان بەم چەشنەیە: کیکانی، گۆرانی، سارونی، غوزداری، مشکانی، ئەرمیلی، بۆلانی و گریشکانی.

میری گەورەی ئەم تیرانە میر کیکان بووە کە لە تیرەی کیکانییەکان بووە. هەر یەکێک لە تیرەکانی تری هۆزی براخۆیی خاوەنی سەرۆکێکی تایبەتی بووە کە ناوەکانیان بەم شێوەیە: میر گۆران، سەرۆکی تیرەی گۆرانی، میر زاخو سەرۆکی تیرەی ساروکی، میر مهران سەرۆکی تیرەی غوزداری، میر مشکان سەرۆکی تیرەی مشکانی، میر ئەرمیل سەرۆکی تیرەی ئەرمیلی، میر بۆلان سەرۆکی تیرەی بۆلانی و میر لەرزین سەرۆکی تیرەی گریشکانی.

ئەم تیرانە وەکو هۆزەکانی تری کورد لە ناوچەی ماد نیشتەجێ بوونە. کاتێک کەیقوباد میری مەزنی مادە کوردەکان هاتە سەر تەختی سەڵتەنەتی ماد و بنەماڵەکەی تا شەش پشت پاشایەتیی کرد، لە سەردەمی ئەم پاشایانەی بنەماڵەی ماد کە هەندێ مێژوونووسی کۆن بە بنەماڵەی کیانیشیان نووسیوە، واتە کەیقوباد، کەیکاووس، توس، فەریبورز، کواکسار و ئازدیاک، ڕیشەی میرەکانی تیرەکانی کوردی براخۆیی بەم چەشنەی خوارەوە بووە:

ا. تیرەی کیکانی: کیکان. زوراک. وشتاب. زگرین. زیبار. براخم. گۆران.

ب. تیرەی گۆرانی: گۆران. کرەجک. شادین. کاش. رامین. بوغاز. راسن.

ج. تیرەی سارونی: زاخو. سەلدوز. شاگین. سابول. سورچن. مانی. شوهان.

د. تیرەی غوزداری: مهران. کیتون. کاشک. کیچان. مانور. گاور. مهران.

ه. تیرەی مشکانی: مشکان. مرداس. کرمجل. گڵباگ. توراب. مانور. بەیکەر.

و. تیرەی ئەرمیلی: ئەرمیل. مشکان. خومان. کلەجک. کرماج. گورەن. کوساد.

ز. تیرەی بۆلانی: بۆلان، باجەل، پوران، خومان، کیتون، ترمان، حەکار.

خ. تیرەی گریشکانی: لەرزین، تادی، زیدان، بەروش، پازو، تاپین، خیزان.

دوای ۳۰۰ ساڵ، پاشایەتیی بنەماڵەی ماد کۆتاییی پێ هات و فەرمانڕەواییی بنەماڵەی هەخامەنشی دەستی پێ کرد و کووڕشی مەزن میری تیرەی هەخامەنشی هاتە سەر تەختی سەڵتەنەتی ماد و فارس. پاشایەتیی ئەم بنەماڵەیە تا ۲۳۰ ساڵ فەرمانڕەواییان کرد و لە سەردەمی فەرمانڕەواییی ئەوان ڕیشەی سەرۆکەکانی تیرەکانی کوردی براخۆیی بەم شێوەیە بووە:

ا. تیرەی کیکانی: زرشان، زوران، ئەرجان، شاموز، براخم، سابول، نورگان، کیانوش، کیکان.

ب. تیرەی گۆرانی: ناگان، دوج، چرموک، کازان، زینل، گۆران، مهران، گیشار، روشی.

ج. تیرەی سارونی: نێرمان، هینار، کابو، مرداس، ریگان، کیتون، باشوک، ئیناخ، جاگین.

د. تیرەی غوزداری: شیشار، کاشک، دیلم، خەرزان، کوساد، مشکان، بیفل، کرمجل، شادین.

هـ. تیرەی مشکانی: گورگین، بولور، توتک، دوغان، کاتین، زروان، بوزیک، براخم، راسن.

و. تیرەی ئەرمیلی: باهور، ئاماچ، کەمبیل، باسیر، بولاک، ئەورام، ئوکی، زەرین، نورگارن.

ز. تیرەی بۆلانی: بوغا، دەرنیل، خیزان، مشکان، سیکران، ساسون، کەل غەل، لاکور، بەروز.

ح. تیرەی گریشکانی: سەمبان، زیدەک، پیلار، ماخان، سارم، دارون، نوغێ، بلباس، ئاچاک.

کاتێک ئەسکەندەری مەقدۆنی پاشای یۆنان هێرشی کردە سەر سەڵتەنەتی ماد و پارس و فەرمانڕەوایەتیی بنەماڵەی هەخامەنشییەکانی کۆتا پێ هێنا، ئەم میرانەی تیرەکانی کوردی براخۆیی دژی سوپای یۆنانییەکان لە مەکران و توران

جەنگان:

میری مەزن میر کیکان کیکانی، میر روشی گۆرانی، میر جاگین سارونی، میر شادین غوزداری، میر راسن مشکانی، میر نورگان ئەرمیلی، میر بەروز بۆلانی و میر ئاچاک گریشکانی.

ڕیشەی کوردە بەلوچەکانی ئەدرەگانی، ماملی و کرمانی:

دوای باسکردنی ڕیشە و نەژادی کوردە زەنگەنەکانی زابلستان و کوردە براخۆییەکانی توران، دێینە سەر باسی ڕیشەی کوردە ئەدرەگانی، ماملی و کرمانییەکانی مەکران. ئەم تیرانەش لە دەستەی کوردەکانی ڕۆهەلاتن و باپیرە گەورەی ئەمانیش وەکو تیرەکانی براخۆیی و زەنگەنە مادی بچووکە.

مادی بچووک حەوت کوڕی هەبوو کە ناوەکانیان: پارتاسن، ئەستروشات، ئاری زانت، بوز، ماژ، بود و دیلمان بووە. لەگەڵ ڕەوتی زەمانەدا، نەژادی ئەم حەوت کوڕە ئەوەندە زیاد بوو کە حەوت تیرەی گەورەی کوردی مادیان دروست کرد و بە ناوی: پارتاسنی، ئەستروشاتی، ئاری زانتی، بوزی، بوزی، ماژی، بودی و دیلمی ناوبانگیان دەرکرد.

باپیرە گەورەی هۆزی براخۆیی، براخم لەگەڵ باپیرە گەورەی هۆزی زەنگەنە، زەنگان برا بوونە و کوڕی بودی مادی بچووک بوونە. هەر بەم شێوەیە، باپیرە گەورەی تیرەی ئەدرەگانی، ئەدرەگان و باپیرە گەورەی تیرەی ماملی، مامل و باپیرە گەورەی تیرەی کرمانی، کرمان برا بوونە و کوڕی یەکێ لە حەوت کوڕەکانی مادی بچووک ئەستروشاتن. کەواتە لە ڕووی ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆمان دەردەکەوێت کە کوردەکانی هۆزی براخۆیی و زەنگەنە لەگەڵ کوردەکانی هۆزی ئەدرەگانی، ماملی و کرمانی نەوەی دوو برا بود و ئەستروشاتن کە ئەوانیش دوو کوڕی مادی بچووکن.

سەرەتای ڕیشەی تیرەکانی ئەدرەگانی و ماملی و کرمانی لە حەزرەتی نوحەوە دەست پێ دەکەین:



نوح سلاوی لێبێ
یافس
حام
سام
تغرغر
ریفان
توغز
قنچان
ختا
عەللان
ئەرکش
هیاتال
ئەشبا
غز
یەمەک
فور
چەرکە
خەزەر
کارداک
بوغاز
میتان
ئارین
پشدەر
بولگار
دەخوو
سور
رودین
گیومر
تێرحان
شود
غوران
مادی گەورە
ناهیر
کاردۆخ
باپیرە گەورەی کاردۆخی
باپیرەی گەورەی ناهیری
چەرکەش
کۆچەر
باپیرە گەورەی کۆچەری



راسن
تێرحان
باپیرە گەورەی تێرحانی
زەنگان
دراج
ساسون
خۆشناو
سەنجار
راسن
باپیرە گەورەی خۆشناوی
باپیرە گەورەی راسنی
حەکار
باپیرە گەورەی ساسونی
باپیرە گەورەی سەنجاری
خۆشناو
زاران
شکاک
حەکار
دراج
باپیرە گەورەی شکاکی
باپیرە گەورەی حەکاری
باپیرە گەورەی دراجی
زاران
ساسون
سەنجار
شکاک
شوهان




جودەک — پازو

باپیره گەورەی جودەکی

کاد

گاور

جاف — مامش — مەنگور

باپیره گەورەی جاف

باپیرەی گەورەی مامشی

تاگاز

جیگ

مادی بچووک




ئەستروشات سێ کوڕی هەبوو: ئەدرەگان، مامل و کرمان کە لەگەڵ ڕەوتی زەماندا بەرەیان زۆر بوو و سێ تیرەیان لێ بەدی کرا بە ناوی ئەدرەگانی، مامـلی و کرمانی. ڕیشەی ئەم سێ تیرەیە بەم شێوەی خوارەوەیە:

ا. ئەدرەگان. خەسان. کلچار. پارکان. جاگین. سەمەک. داخور. شاهەک. باهو. نودو. مەتەک. سابول. چونگ. شیکورد. مندگار. سندوان. رومبەر. دارون. ئەیلە.

ب. مامل. جلابین. سەمەک. چومبەر. حوتان. زوراک. ئوشاب. زینل. موڕاک. کاتین. بەمبەکان. کازان. ندامان. هوتکار. سارون. هیجوان. ماکول. ئونکار. زونگ.

ج. کرمان. کودان. شەمبەد. چلکان. دوشەک. پندران. دەرابیل. گامون. لاسین. بورک. نوتان. مەرزەک. لەوزا. کلزان. گۆران. پروکر. راغ. کەسەتک. هوشار.

کاتێک سەران و گەورانی هۆزەکانی کورد میری مەزنی مادە کوردەکان

کەیقوبادیان لەسەر تەختی ماد دانیشاند، میر ئەیلە سەرۆکی تیرەی ئەدرەگانی، میر زونگ سەرۆکی تیرەی ماملی و میر هوشار سەرۆکی تیرەی کرمانی بوونە. لە شەڕی نێوان پاشای ماد کەیقوباد و پاشای توران ئەفراسیابدا هاوکاری پاشای ماد بوونە. کەیقوباد لەم شەڕەدا ئەفراسیابی شکست دا و سەڵتەنەتی تورانی دابەش کرد.

لەم شەڕدا، ولایەتی مەکران لەلایەن میری تیرەکانی ئەدرەگانی و ماملی و کرمانی ئازاد کرابوو، هەر بۆیە کەیقوباد دەسەڵاتداریی ئەم ولایەتەی دایە دەست میری گەورەی ئەدرەگانی.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی ماد، ڕیشەی سەرۆکی تیرەکانی کوردی ئەدرەگانی و ماملی و کرمانی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

ا. ئەیلە. شیتاب. بوسا. مونحان. ئەبدا. مویرکان. سەمەک.

ب. زونگ. سول. پژگان. شاهول. شەخەل. توهو. نوکەف.

ج. هوشار. تگران. سوران. لادی. ئەورام. کنداف. ساتک.

لە سەردەمی میر سەمەک ئەدرەگانی، میر نوکەف ماملی و میر ساتک کرمانی دەسەڵاتی بنەماڵەی کوردی ماد کۆتایی پێ هات و بنەماڵەی هەخامەنشی شوێنی ئەوانیان گرتەوە کوورشی مەزن بناخەی فەرمانڕەوایی هەخامەنشیی لە ماد و پارس دانا. کوورش پێوەندیی نەژادیی لەگەڵ کوردە مادەکان هەبوو بەپێی ئەوەی دایکی لە بنەماڵەی پاشایی کوردە مادەکان بوو. لەبەر ئەم هۆیە، ئەو کوردەکانی بە بازووی شەمشێروەشێن و هاوڕێی نزیکی خۆی دەزانی و شێوەی بەڕێوەبەرایەتیی ڕژێمی دەوڵەتیی بنەماڵەی مادی لە شێوەی جارانیدا هێشتەوە. ئەمەش بۆ ئەوەی هەستی بێگانەیی و جیاوازی لە نێوان کوردەکان و بنەماڵەی هەخامەنشیدا دروست نەبێت. لە سۆنگەی ئەمە، فەرمانڕەوایی میرەکانی تیرەی کوردەکانی ئەدرەگانی و ماملی و کرمانی لە ولایەتی مەکران هاوچەنی میرەکانی تری کورد مایەوە. لەم سەردەمەدا، بنەچەی سەرۆکەکانی تیرەی کوردی ئەدرەگانی و ماملی و کرمانی بەم شێوەیە:

ا. سەمەک. جادی. هونران. جیسان. سوسن. پرتوس. تیبار. نوتار.

ب. نوکەف. تگێ. هیرەند. موندان. گرسان. توفان. مەلمان. بتو.

ج. ساتک. مەکال. شاهول. بوژیر. هەلیلان. جیسان. سەرەنگان. شربان. ئادمان. توران.

پێوەندیی نێوان کوردەکانی توران و مەکران:

کوردە براخۆییەکانی توران و کوردە ئەدرەگانی، ماملی و کرمانییەکانی مەکران هاونەژاد بوون. لەبەر ئەم هۆیەش، لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتییاندا، پێوەندی و هاموشۆی نێوانیان زۆر نزیک و برایانە و هاوڕێیانە بووە. ئەم پێنج تیرەیە نەوەی یەک باپیر بوونە کە ئەویش مادی بچووکە. واتە ئەمانە نەوەی دوو کوڕی مادی بچووک، بود و ئەستروشاتن. تیرەی براخۆیی و زەنگەنە نەوەی دوو کوڕی بود، براخم و زەنگانن. تیرەکانی ئەدرەگانی، ماملی و کرمانیش لە بەرەی سێ کوڕی ئەستروشات، ئەدرەگان و مامل و کرمانن.

ئەم تیرانەی کورد، نزیکەی پێنج سەدە لە مەکران و توران لە دوو سەردەمی پاشاکانی بنەماڵەی ماد و هەخامەنشتی دا فەرمانڕەواییان کردووە، لەم سەرەمە دووروودرێژەدا، دووچاری هەوراز و نشێوی زەمانە و شۆڕش و ڕووداوی جۆەوجۆری ڕۆژگار بوونە. لەگەڵ ئەوەشدا، پشوودرێژی و دلێری و بوێری و شەهامەت و جوامێرییان لەدەست نەداوە بەرەنگاری ئەم سەختی و ناحەزییانە بوونەتەوە. توانیویانە ئاژاوە و شەڕ بنبڕ بکەن و لەگەڵ یەک پێوەست و یەکگرتوو بن. بەم چەشنە، بە هاوبەشی فەرمانڕەوایی توران و مەکرانیان کردووە و هیچ کات لە نێوان خۆیان ڕێگەیان بە ناکۆکی و دووڕوویی و بێگانەبوونیان نەداوە.

ئەم کوردانە نەژاد و زمان و ئاین و داوونەریتیان وەکو یەک بووە و خاوەنی کۆمەڵگەیەکی هاوچەشن بوونە.

لە کاتی تەنگانە و بەڵا و ناحەزی و ئازاردا بۆ دەربازبوون دەستگرۆیی و هاوکاریی یەکتریان کردووە.

## بەشی حەوتەم

## کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی پاشاکانی سیلوکیی یۆنانیدا

پیشدادییەکان:

دەگێڕنەوە کیومەرس بناخەی فەرمانڕەوایی پیشدادییەکانی لە ماد و پارس و ئاریان تورکستان دانا و دوای ئەو کوڕەزاکەی نەوەی، هۆشنگی کوڕی سیامەک هاتووەتە سەر تەختی وڵاتەکە. دوای ئەو تەهمورس هاتووەتە سەر تەخت. دوای ئەوەی تەهمورس کۆچی دوایی کرد، جەمشید بەڕێوەبەرایەتیی حکوومەتی گرتە دەست. پاش ئەو، ئاپتیان هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی و پاش ئەوەی ئەویش کۆچی دوایی کرد، کوڕەکەی، فەرەیدوون هاتە سەر تەخت کە توانی زوحاکی تازی[۱۳] شکست بدا و لە زیندان بەندی بکات و خەڵک لە ستەم و دەستدرێژییەکانی رزگار بکات.




۱۳. تازی بە فارسی بە مانای عەرەب یان تانجی دێت.

فەرەیدوون دوو کوڕی بە ناوی تور و ئیرەج هەبوو و سەڵتەنەتەکەی لە نێوانیان دابەش کرد. لەم دابەشکردنەدا، تورکستان و خزرانی دایە تور و ماد و پارس و ئاریانیشی دایە ئیرەج. زنجیرەی ڕیشەی پیشدادییەکان بەم شێوەیە:

تیرەکانی سندان:

دەگێڕنەوە کە حام کوڕی نوح چەندین کوڕی هەبووە. یەکێ لەم کوڕانە ناوی سندان بووە و بە مەبەستی دۆزینەوەی ژیوار هاتووەتە سەرزەویی سندان و تێیدا نیشتەجێ بووە. ناوچەکە بەهۆی نیشتەجێبوونی ئەوەوە بە ناوی سندانەوە ناوبانگی دەرکردووە. لەگەڵ ڕەوتی سەردەم، ژمارەی نەوەکانی سندانی کوڕی حام ئەوەندە زۆر بووە کە بە سەر سێ تیرەی گەورەیدا دابەش بوونە و بە ناوی بنیان و تاکین و مومیدان ناوبانگیان دەرکردووە و لە ناوچەی جیاوازی سندان بڵاو بوونەتەوە.

ناوچەی توران و سندان هاوسنوور بوون و لە چاخی کۆنەوە خەڵکانی ئەم دوو ولایەتە بە یەکەوە پێوەندییان هەبووە. بۆیە پێویستە باس لەوانیشەوە بکەین. لە سەردەمی کەیقوبادی کوردی ماد کە کوردە براخۆییەکان ولایەتی تورانیان داگیر کرد و تێیدا نیشتەجێ بوون، ئەم تیرانەی سندان بوون کە ناوی "کوردگال"یان لە کوردەکان نا و کوردەنیش ناوی "جدگال"یان لێ نان کە لە ئەنجام هاموشۆ و مامەڵە لە نێوانیان دەستی پێ کرد.

لە نیشتمانی سندان سەرۆکەکانی ئەم تیرانە فەرمانڕەواییان کردووە و

ڕیشەی ئەم تیرانە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

ڕیشەی بنیان: نوح سڵاوی لێ بێ. حام. سندان. بنیان. لانگان. ماچان. ناهر. داهر. ماهر. دهاری. سهتان. ئەبران. جوکان. سودان. ئەنران. جونا. سامرا. ئەبرا. بمبان. چوخران. هنبی. بوڕا. هرچەندمر. سنگهار. سیاکر. ماتان. بنگان. وسایو. ئەسیار. بولڕا. باگارم. جوین. بجرا. کندابوج. ککسو. گوڕی. پرمیل. جەشەڵ. جبین. ئاگماران.

ڕیشەی تاکین: نوح سڵاوی لێ بێ. حام. سندان. تاکین. بونگان. سنگار. راتور.

داماچ، دمکیا، دیتان، جسودان، ماچ، سومر، مەستون، کلوار، ئەتار، درگ، ماین، بوتتی، سیالا، ئەرین، جویا، ئاوان، خەرەل، کتپەر، بەنگەر، کرپال، تونیان، منجون، چاچر، ئیری، کرار، سامت، درپال، سوپران، جەتتان، مەسەن، ئوتران، سیانچ، میسرو.

ڕیشەی مومیدان: نوح سلاوی لێ بێ، حام، سندان، مومیدان، ئەنگاران، مومدرا، گونگا، بوردی، شاهوک، سەخان، رونجان، وچان، دودا، بەخرا، بوڕا، جاماتی، شاپت، موتک، گدورا، مونا، واهو، چەتتا، ئەنگیر، ئەچرا، پەلال، کورک، وچانی، گوردان، دندو، دکهیر، گەججەر، هەری پال، کوری پال، ئودانا، هودکر، واچر، سومەر، سەببرا، موندر، گدران.

سەرکەوتنی جدگالەکان بەسەر توران و مەکران:

کاتێک ئەسکەندەری مەقدۆنی سەڵتەنەتی ماد و پارسی داگیر کرد و فەرمانڕەواییی بنەماڵەی هەخامەنیی کۆتا پێ هێنا، لە گەڕانەوەی بەرەو یۆنان، لە بابل کۆچی دواییی کرد و لەبەر نەبوونیی جێنشینێک، سەرلەشکرەکانی سەڵتەنەتی پان و بەرینی ئەویان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد. لەم دابەشکردنەدا، سیلوکوس بەشی ڕۆهەڵاتی سەڵتەنەتەکەی کە برێتی بوو لە ولایەتەکانی ماد، پارس، توران، مەکران، کابلستان و زابلستان بەرکەوت و بوو بە پاشای ئەم سەڵتەنەتە. بەڵام حەزی وڵاتگرتن بەرچاوی سیلوکوسی ڕەش کرد و بێ دووربینی هێرشی بردە سەر هیندستان و شکستی خوارد. لە ئەنجامی ئەم شکست خواردنە، سیلوکوس ولایەتەکانی توران و مەکران و کابلستانی وەکو تاوانی شەڕ دایە پاشای وڵاتی هیند چەندەران گوپتان مۆریان.

ئەم گۆڕانکارییە فەرمانڕەوابییە، جدگالەکان، تیرەکانی سندانی هان دا بڕژێنە ناو خاکی توران و مەکران. لەگەڵ هێرشهێنان بۆ سەر ئەم ولایەتانە لەگەڵ کوردەکان کەوتنە شەڕ. کوردەکان زۆر بە جوامێری و خۆڕاگری داکۆکییان لە خاکی خۆیان کرد و لە هەردوولا خەڵکێکی زۆر بریندار بوو و کوژران. ژمارەی جدگالەکان بە چەشنێ زۆر بوو کە کوردەکان نەیانتوانی سەربکەون و جدگالەکان

هەموو ولایەتی مەکران و خوارووی ناوەڕاستی توران تا مەڵبەندی دۆڵی سوهر ئابادانیان داگیر کرد و کوردەکانیان لەم ناوچانە وەدەرنا.

کوردە بەلوچەکانی مەکران و توران لە ناوچەی باکوری توران، کیکانان کۆ بوونەوە. لەو کاتە، کوردەکانی زابلستان بۆ پشتگیری و دەسگرۆیی برا کوردەکانیان هاتنە کیکانان و بە یەکەوە هێرشیان بردە سەر لەشکرگەی جدگالەکان لە سوهر ئابادان و دوای شەڕێکی سەخت توانییان شکستیان بدەن. لە ئەنجام، جدگالەکان هیچ چارەیەکیان بۆ نەما و داوای ئاشتییان کرد و دۆڵی سوهر ئابادان بوو بە هێڵی سنووریی نێوان ناوچەکانی جدگال و کوردەکان.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی کوردە مادەکان، ئەم فەرمانڕەوایانەی سندان هاوچەرخی پاشاکانی ماد بوونە:

میر هرجەندمر، میر سنگهار، میر سیاکر، میر ماتان، میر بنگان، میر وسایو، میر ئەسیار، میر بولرا.

دوای دەسەڵاتداریی کوردە مادەکان، لە سەردەمی هەخامەنشییەکاندا ئەم سەرۆکانەی جدگالەکان لە سندان فەرمانڕەواییان کردووە:

میر باگارم، میر جوبن، میر بجرا، میر کندابوج، میر ککسو، میر گوپی، میر پرمیل، میر جەشەل، میر جبین، میر ئاگماران.

فەرمانڕەوایی پاشاکانی سیلوکیی یۆنانی لە ماد و پارس:

ئەسکەندەری مەقدۆنی دوای داگیرکردنی وڵاتەکانی ڕۆهەڵات، لە گەڕانەوەی بەرەو یۆنان، لە بابل کۆچی دوایی کرد، بە نەبوونی میراتگرێک لە دوای خۆی، سەڵتەنەتە پان و بەرینەکەی کەوتە بەردەست سەرلەشکرەکانی و ئەوانیش لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کرد.

چارەنووس لە بەرژەوەندیی میری ڕێژیم سیلوکوس بوو و ڕۆهەڵاتی سەڵتەنەتەکەی کە برێتی بوو لە ماد، پارس، توران، مەکران، کابلستان و زابلستان بەر کەوت. سیلوکوس سەڵتەنەتەکەی بەرینتر کردەوە و توانی دەشتەکانی دەوروبەر بهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و تا ۳۰ ساڵ بە شکۆداری فەرمانڕەوایی کرد. هەرچەندە دوای ئەو، نەوەکانی نەیانتوانی ئەم وڵاتە بەرینە بەڕێوە بەرن.

سیلوکوس لە دوا ساتەکانی ژیانیدا خواستی بچێتەوە مەقدۆنیای نیشتمانی باپیرانی. بەڵام لە ڕێگە بە دەستی پیاوێک بە ناوی کیرانوس کوژرا. دوای ئەم ڕووداوە، ئەنتیوکوس هاتە سەر تەختی باوکی و تا ١٨ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد پاشان کۆچی دوایی کرد. لە شوێنی ئەو کوڕەکەی، ئەنتیوکوسی دووەم بوو بە پاشا و لە کاتی فەرمانڕەوایی ئەودا، دیودتوس دادگەری باختەر یاخی بوو و نازناوی شای بۆ خۆی هەڵبژارد. میرەکانی پارس چاویان بە سەرکەوتنی دادگەری[١٤] باختەر کەوت، ئازایەتی هاتە لەشیانەوە و ئاڵای شۆڕش و یاخیگەرییان هەڵدا. لە ئەنجامدا ئەم ڕووداوە بووە هۆی ئەوەی وڵاتی ئەشکانی سەرهەڵدات و دامەزرێت.

دوای مردنی ئەنتیوکوسی دووەم، فەرمانڕەوایی بنەماڵەی سیلوکی لە ماد و پارس بێهێز بوو و شەک و شۆکی تێ کەوت. لە ئەنجام، میر ئەشک، میری گەورەی پارس بناخەی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی ئەشکانی لە ماد و پارس دانا.

جێگەی سەرنجە کە فەرمانڕەواکانی بنەماڵەی سیلوکیی یۆنانی خووڕەوشتی دۆستانەیان لە تەک خەڵکی ماد و پارس بەکار هێناوە و خزمایەتییان لەگەڵ دەوڵەمەندەکاندا دروست کردووە. هەروەها، میرەکانی مادیان لەسەر پلەی بەرز داناوە و لەنێو سوپای خۆیاندا خەڵکی ماد و پارسیان بە سەرباز وەرگرتووە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، خەڵکی ماد و پارس لەژێر دەستەیی ئەوان خۆیان ڕزگار کرد.

میری ولایەتی زابلستان میر برسان زەنگەنە:

میر برسان میری گەورەی تیرەی کوردە زەنگەنەکان بوو و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی هەخامەنشییەکاندا وەک میرەکانی تری کورد خاوەن پلە و پایە بوو و لە ولایەتی زابلستان دەسەڵاتداریی کردووە. کاتێک ئەسکەندەری مەقدۆنی سەڵتەنەتی ماد و پارسی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی و سەرکەوت بەسەر بنەماڵەی هەخامەنشییەکاندا، دارای سێیەم دوا پاشای بنەماڵەی هەخامەنشی بوو و هاوکار و هاودەمەکانی لە ترسی بە دواگەڕانی ئەسکەندەری مەقدۆنی بە کوشتیان دا.

---

١٤. نووسیار وشەی یۆنانی "ستراب"ی بەکار هێناوە کە مانای دادگەر "حاکم" یان فەرمانڕەوا دەگەیەنێت.

بەم شێوەیە، دەسەڵاتداریی میر برسانیش لە زابلستان لەق بوو و دووچاری کێشە و ناخۆشیی جۆرەوجۆر هات. بەڵام چونکە پیاوێکی دانا و زیرەک بوو، سوودی لە ئاوەزی خۆی وەرگرت و خۆی دایە دەست ئەسکەندەر پاشای یۆنانییەکان و ئەسکەندەریش ئەوی لەسەر پلە و پایە و دەسەڵاتدارییەکەیدا هێشتەوە.

دوای ئەوەی ئەسکەندەر کۆچی دوایی کرد و سیلوکوسی سەرلەشکری هاتە سەر تەختی سەڵتەنەتی ماد و پارس، میر برسان گوێڕایەڵی ئەویشی کرد. لەبەر ئەوە سیلوکوس ئەوی بە لایەنگری خۆی هەژمارد و میرنشینییەکەی لە زابلستان ددان پێ دانا. دوای کۆچی دوایی میر برسان، کوڕەکەی، میر فیروز ئەرکی دەسەڵاتداریی میرنشینیی زابلستانی گرتە دەست کە هاوچەرخی ئەنتیوکوسی یەکەمی کوڕی سیلوکوس بوو. دوای کۆچی دوایی میر فیروز، میر ئیسپیبود هاتە سەر تەختی میرنشینیی زابلستان و دڵسۆزانە خزمەتی ئەنتیوکوسی دووەم پاشای بنەماڵەی سیلوکوسی کرد. ئەنتیوکوس بە جوانیی نوێنەرایەتیکردنەکەی شاد بووە و خەڵاتی گرانبەهای پێشکێش کردووە.

دوای کۆچی دوایی میر ئیسپیبودیش، کوڕەکەی، میر کورنگ بەڕێوەبەرایەتیی میرنشینیی زابلستانی گرتووەتە دەست. لە سەردەمی میرنشینیی ئەودا، فەرمانڕەوایی بنەماڵەی سیلوکی لە ماد و پارس دووچاری شڵەژاوی و کێشمەکێش بووە و لە قۆناخی ڕووخاندا بووە. ئەم سەرکێشی و شۆڕشانە لە ماد و پارس بووە هۆی دەرکەوتنی میرانی ئەشکانییەکانی پارس و بە چەشنێ کە بتوانن هێز پێک بهێنن و بەسەر فەرمانڕەوایی یۆنانییەکان زاڵ ببن و لە وڵاتەکەیان دەریان بکەن.

شۆڕشەکانی حاکمەکانی بە نەژاد یۆنانی لە ماد و پارس:

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەنتیوکوسی دووەم، کوڕی ئەوەی سیلوکوس، حاکمەکانی یۆنانی کە لە ولایەتەکانی ماد و پارس بریکار بوون، لە سەرۆکی خۆیان هەڵگەڕانەوە و زنجیرەی یاخیگەرییان دەست پێ کرد. سەرەتای ئەم سەرکێشی و یاخیگەرییە، حاکمی باختەر دیودتوس دەستی پێ کرد.

ئەنتیوکوس کە ئاگەداری ئەم شۆڕشە کرایەوە بە خێرایی ڕووی کردە ماد و پارس بۆ ئەوەی ئاگری ئەم شۆڕشە بکوژێنێتەوە. بەڵام نەیتوانی بەسەر دیودتوس

سەرکەوێت و لە ئەنجام دیودتوس توانی لە هەوڵی دامەزراندنی وڵاتێکی سەربەخۆ سەرکەوێت. کردەوەی دیودتوس کارتێکەریی دژکاری لەسەر سەڵتەنەتی بنەماڵەی سیلوکی بەجێ هێشت و ڕووداوەکە ئاگری سۆزی سەربەخۆیی لە دڵی خەڵکانی ماد و پارس هەڵکرد. لەم چوارچێوەیەدا، یەکەم جار دانیشتوانی خوراسان دەستیان بە خەبات و تێکۆشان کرد.

ڕێژیمی نوێی تیرەکانی کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران:

دوای لکاندنی ناوچەی باکوری توران واتە کیکانان بە میرنشینیی زابلستانەوە، کوردەکانی توران و مەکران لە کیکانان کۆ بووبوونەوە و بە هۆی هێرش و شاڵاوی ئەسکەندەری مەقدۆنی ڕێژیمی هۆزایەتیی ئەم کوردە بەلوچانە تێکوپێک چووبوو و زەبوونحاڵ و بێ سەروسامان بوون. بەڵام خۆشبەختانە خۆیان هێنایە ژێر ئاڵای فەرمانڕەوایی کوردە زەنگەنەکان و لە ستەم و زۆرداریی زۆری جدگالە بێ ویژدان و بەدکار و ناحەزەکانی سندان ڕزگاریان بوو.

کوردەکان لە کاتی مانەوەیان لە زابلستان بایەخی زۆریان بە ڕێکخستنی ڕێژیمی مەدەنی و هۆزایەتی و لەشکریی خۆیان دا کە بە هۆی هێرشەکانی یۆنانییەکان و جدگالەکانی سندان لە دۆخێکی شپرزەدا بوون. تیرەکانی کورد لەگەڵ بڵاوبوونەوە و نیشتەجێبوونیان بە ناوچەی جۆرەوجۆری زابلستان، دەستەیەکی بەهێز و توانای کوردیان دامەزراند کە لە سەردەمەکانی دواییشدا هیچ گۆڕانکارییەکی ناوخۆی وڵات نەیتوانی زیانیان پێ بگەیەنێ. فەرمانڕەوایە تازە هاتووەکانیش بە بینینی یەکەتی و تەبایی ئەوان خواستیاری هاوەڵی و پشتیتوانیی ئەوانیان دەکرد.

بەم شێوەیە، لەم بەڕێوەبەرایەتییە نوێیەی کوردە بەلوچەکان، ئەم تیرانەی خوارەوە خۆیان لەسەر بنەمای یەکگرتن ڕێک خست و گەشەیان بە برایەتیی نێوان خۆیان دا: ئەدرەگانی، براخۆیی، ئیشکەنە، زەنگەنە، مالی، کرمانی، درمانی، سەباحی، سنجاوی، سەففاری، خانی خەللی، باشاری، شاماری، سەنجانی، شیرکباری، موتلسانی، بازیجانی، سورانی، سریانی، بابینی، ماککی، توکانی، ئاسکانی، سەلاحی، شینوانی، گورجین، جەلابوک، هوتکاری، کوکانی، شەککانی، ندامانی، شوون، موجارانی، مورایی، قەنجانی، کیشانی، شەمبەد، جادی،

خاوەری، کدەک، جەمماک، سوهانی، دینوری، جەسفانی، سویانی، حەسرانی، دیگانی، گوجاری، شاهولی، ئەتوانی، شەنبیانی، سالمانی، ئونیزی، شاهەکی، بیوانی، سارولی، سەمەدینی، ئیلزاری و کرما.

ئەم تیرانەی کوردی بەلوچ لەژێر سایەی سۆزی میر برسان کوردی زەنگەنە لە میرنشینیی زابلستان ژیانیان بەسەر دەبرد و میر برسان میرەکانیانی بە سەرچاوەی هێز و توانای خۆی دەزانی.

رێکخستنی لەشکریی کوردە بەلوچەکان بەم شێوە بووە: لەشکری کورد بەسەر پێنج بەشدا دابەش بووە. بە هەر بەشێکی لەشکریان گوتووە "یەسەل". ناوی ئەم پێنج بەشەی لەشکر بەم شێوەیە بووە: براخین یەسەل، زەنگین یەسەل، ئەدرەگین یەسەل، مالین یەسەل و کرمین یەسەل. مانای ئەم ناوانە بەم شێوەیەیە: بەشی لەشکری تیرەی براخۆیی، بەشی لەشکری تیرەی زەنگەنە، بەشی لەشکری تیرەی ئەدرەگانی، بەشی لەشکری تیرەی مالی و بەشی لەشکری تیرەی کرمانی. بە کۆی لەشکری تیرەکانی کوردیان گوتووە "بولک–ی تیرەکان". میرەکانی ئەم تیرە گرینگانەی کورد واتە میر کیکان براخۆیی، میر برسان زەنگەنە، میر لبوسان ئەدرەگانی، میر کیشان مالی و میر ئەننو کرمانی سەرلەشکری ئەم بەشە لەشکرانەی خۆیان بوونە. میری زابلستانیش سەرلەشکری هێزی بولکی تیرەکان بووە. ئەم پێنج میرەی تیرەکانی کوردە بەلوچەکان بە ناوی "میرانی تیرەکانی پێنجینە" ناسرابوون.

میر برسان زەنگەنە، میر کیکان براخۆیی، میر لبوسان ئەدرەگانی، میر کیشان مالی و میر ئەننو کرمانی هاوچەرخی سیلوکوس، یەکەم پاشای بنەماڵەی سیلوکیی یۆنانی بوونە. میر فیروز زەنگەنە، میر مهراب براخۆیی، میر منگیپ، ئەدرەگانی، میر گنجان مالی و ماهداد کرمانی لە سەردەمی ئەنتیوکوسی یەکەم سەرۆکی تیرەکانی خۆیان بوونە. هەروەها، میر ئیسپیبود زەنگەنە، میر مهراب براخۆیی، میر منگیپ ئەدرەگانی، میر بەسران مالی و میر ماکەک کرمانی هاوچەرخی ئەنتیوکوسی دووەم بوونە.

لە سەردەمی فەرمانڕەواییی سیلوکوسی دووەم میر کورنگ زەنگەنە میری زابلستان بووە و میر سام براخۆیی، میر بەختیار ئەدرەگانی، میر بەسران مالی و میر ماکەک کرمانی سەرۆکی تیرەکانی خۆیان بوونە.

## بەشی هەشتەم

## کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی ئەشکانییەکاندا

ئەشکانییەکان:

کاتێک دیودتوس حاکمی باختەر دژی ئەنتیوکوسی دووەم پاشای بنەماڵەی سیلوکی شۆڕشی بەرپا کرد، ئەنتیوکوسی دووەم هەرچەند سەرکوتی کرد بەڵام نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ و بەسەریدا کۆچی دوایی کرد. پاشان کوڕەکەی، سیلوکوسی دووەم بوو بە جێنشینی و هاتە سەر تەختی ماد و پارس، لەم سەردەمەدا، حاکمی پارتیا، ئاندراگوراس هەڵەیەکی گەورەی کرد و برای میری پارس، تیردادی لە کۆشکی خۆی لەسەر خزمەتی میری سەرکۆنە کرد و سووکایەتیی پێ کرد.

میر ئەشک ئەم کردەوەی حاکمی پارتیای بە سووکایەتی و شەرەفبردنی بنەماڵەکەی خۆی تەماشا کرد و بڕیاری دا تۆڵەی بکاتەوە و بۆ ئەم مەبەستەش خۆی ئامادە کرد. ئەم دوو برایە لە ئاکام بە نهێنی لەگەڵ پێنج کەس لە هاوڕێیانی خۆیان یەکیان گرت و حاکمی پارس، ئاندرا گوراسیان بە کوشت دا و خەڵکی پارسیان بۆ شۆڕش و سەرهەڵدان ئامادە کرد.

دیودتوس حاکمی باختەر لەگەڵ ئەم دەستەیە یەکی گرت و فەرمانڕەوایی ئەشکی پەسند کرد. میر ئەشک لە شارێک بە ناوی ئەساک کە لە نزیک کوچان کەوتووەتە دۆڵی دەریای ئەترەک تاجی پاشایەتیی لە سەر نا.

لەبارەی پێناسەی چۆنیەتیی نەژادی ئەشکانییەکانەوە لە دیرۆکنووسە کۆنەکانەوە زانیاریمان بەدەست دەگات کە ئەوانە مرۆڤی بیاوان گەڕۆک و نیوە کۆچەری بوونە و لە دەشتە پان و بەرینەکان گەشەیان کردووە.

هەر دیرۆکنووسەکان دەڵێن کە پارتەکان بەشێکن لە دەستەی پارنی کە ئەوانیش بۆ خۆیان بەشێکن لە هۆزە بەدوویيەکان و بەناوی داها ناساندوویانن.

ئەم خەڵکانە لە سەردەمی گەڕانی بیاواندا بە پارس نەناسراون بگرە کاتێ بەرەو باشوور هاتن و لە پارس لە هەرێمی پارساوا پێگەیان پەیدا کرد بە ناوی پارسی ناسراون. لەگەڵ ڕەوتی سەردەم، سەرخێڵەکانیان لە پارس سەرمایە و پلە و پایەیان بەدەست هێنا.

لە ئەنجامدا، ئەشک میری مەزنی پارسەکان، بناخەی سەڵتەنەتی ئەشکانیی دانا. ئەشک بۆ پتەوکردنی سەڵتەنەتەکە لە ساڵانی سەرەتاییدا، هەموو کات سەرقاڵی شەڕ بوو و هەر لە کاتی ئەم شەڕ و کێشانەدا گیانی خۆی لە دەستدا. دوای ئەو، برایەکەی، تیرداد بوو بە پاشا و هێرشی بردە سەر ناوچەی هەرکانیە و هێنایە ژێر ڕکێفی خۆیەوە.

تیرداد پاشان خۆی بە پتەوکردنی فەرمانڕەوایییەکەی خەریک کرد و بۆ ئەم مەبەستەش ژمارەی سوپاکەی زیاد کرد و چەند قەڵایەکی دروست کرد. لەگەڵ ئەمەشدا، شارەکانی پتەو کرد و شارێکی نوێی بە ناوی دارا لە دەرەی گزکوە ئاپورتوان دروست کرد کە هەڵکەوتێکی ستراتیجیی زۆر بەهێز و نەگری هەبوو.

تیرداد دوای ۳۳ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد و تەختەکەی بۆ ئەردەوانی کوڕی بەجێ هێشت. لە سەردەمی ئەردەوانی یەکەمدا، ئەتیوکوسی سێیەم کە شەشەم پاشای بنەماڵەی سیلوکی بووە کەوتووەتە داوی چڵێسییەوە و بڕیاری داوە وڵاتەکانی ڕۆهەڵات کە لە دەستی باپیرانی چووبوون جارێکی تر بیانهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی. بۆ ئەم مەبەستەش، دەستی بە ئامادەکاریی شەڕ کرد.

پێوەندیی نێوان کوردە بەلوچەکان و پاشاکانی ئەشکانی:

ئەشک بناخەی دەوڵەتی ئەشکانیی دانا و بۆ بەهێزکردنی سەڵتەنەکەی بەردەوام تێ کۆشاوە و لەگەڵ دوژمنان لە بەربەرەکانێدا بووە و لەم نێوانە گیانی خۆی لەدەست داوە. پاشان برایەکەی، تیرداد، لە جێگەی دەبێت بە جێنشینی تەختی فەرمانڕەوایی ئەشکانی.

میر کورنگ کوردی زەنگەنە و میر میرانی کاتێ ئەم بارودۆخەی بینی، بە مەبەستی ڕاوێژکاری میرەکانی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان میر سام براخۆیی، میر بەختیار ئەدرەگانی، میر بەسران ماملی و میر ماکەک کرمانیی بۆ

لای خۆی بانگ کرد. له ئاکامدا، میرەکانی کوردی تێکڕا لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە پشتیوانی لە بنەماڵەی ئەشکانی بکەن. ئەمەش لەبەرئەوەی کە ئەوان هاونەژاد و هاونیشتمانی کوردەکان بوون.

هەر بۆیە کاتێک تیرداد هاتە سەر تەخت میرانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان بەڵێن و پەیمانی دۆستانەیان لەگەڵ بەست و پشتیوانیی کوردەکانیان پێ ڕاگەیاند. تیردادیش لە بەرامبەر ئەم هاوکاری و پێوەندە دۆستانەیەدا، مافی دەسەڵاتداریی میرنشینیی زابلستانی دایە میر کورنگ.

هێرشی ئەنتیوکوسی سێیەم بۆ سەر سەڵتەنەتی ئەشکانی:

دوای کۆچی دوایی تیردادی یەکەم، ئەردەوانی یەکەمی کوڕی هاتە سەر تەخت و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا ئەنتیوکوسی سێیەم کە شەشەم پاشای بنەماڵەی سیلوکی بوو و لە سووریا فەرمانڕەوایی دەکرد، بە تەماحی ئەوە کەوت کە ناوچەکانی سەڵتەنەتی ڕۆهەڵاتی ماد و پارس جارێکی تر بهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی. بۆ ئەم مەبەستە، ڕووەو ڕۆهەڵات کەوتە ڕێ تا گەیشتە پەرستگەی ئاناهیتا و تالانی کرد و دەستی بەسەر زەخیرەی ماڵ و دارایی پەرستگەکەدا گرت.

دوای ئەوە، بە لەشکرێکی گەورەوە بەرەو هەرکانیا چوو و پاش داگیرکردنی ناوچەکە هاتە دەوروبەری دەمغان. سەربازە ئەشکانییەکان و هاوکارانی لەشکری کوردە بەلوچەکان لە بەرزاییەکانی شاخەکانی دەمغان دامەزرابوون و لە ناکاو هێرشیان دەبردە سەر دوژمن.

لە ئەنجام، ئەنتیوکوس نەیتوانی بەسەر ئەشکانییەکاندا سەر بکەوێ و زۆربەی سەربازە یۆنانییەکان لەناو چوون. ئەنتیوکوس لە شاخاویی دەمغان لە هەرچوار لاوە گەمارۆ درا. بۆیە بە چاکی زانی ئاشتی لەگەڵ ئەردەوان پاشای ئەشکانییەکان بکات و پەیمانی یەکەتیی لەگەڵ بەست.

کوردە بەلوچەکان و یارمەتیدانی پاشای ئەشکانی:

کوردە بەلوچەکان لە شەڕی ئەنتیوکوسی سیلوکیدا پشتیوانیی ئەردەوانی یەکەمی پاشای ئەشکانییان کرد و دژی یۆنانییەکان جەنگان. میرەکانی کورد

لەوانە میر کورنگ زەنگەنە، میر سام براخۆیی، میر بسول ئەدرەگانی، میر ئەرجان ماملی و میر گۆران کرمانی بە ٤٠٠٠٠ سەربازی شەڕوانی کوردە بەلوچەکانەوە لە شەڕگە شان بەشانی سەربازانی ئەشکانییەکان لەگەڵ دوژمن دەجەنگان.

کۆچی دوایی ئەردەوانی یەکەم:

ئەردەوانی یەکەم دوای ١٩ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن دنیای فانیی بەجێ هێشت و دەسەڵاتدارانی سەڵتەنەت "پرپاتیوس"ی کوڕیان لە جێگەی ئەو کرد بە پاشا.

پاشابوونی پرپاتیوسی ئەشکانی:

دوای ئەوەی پرپاتیوس هاتە سەر تەختی باوکی، بۆ ماوەی ١٦ ساڵ پاشایەتیی کرد و پاشان کۆچی دوایی کرد. پرپاتیوس دوو کوڕی لە پاش بەجێ ما: فەرهاد و مهرداد. فەرهاد کوڕی گەورە بوو و بەپێی نەریتی پارسەکان هاتە سەر تەختی باوکی.

پاشابوونی فەرهادی یەکەمی ئەشکانی:

کاتێک فەرهادی یەکەم هاتە سەر تەختی پاشایی، کێونشینەکانی ئەلبورز لێی یاخی بوون و شۆڕشیان بەرپا کرد و لە خوارووی دەریای خەزەر دەستیان بە شەڕ کرد. فەرهاد کۆمەڵێک لە نێوانیان کە بە مەرەوییەکان بەناوبانگ بوون و زۆر سەرکێش بوون گواستەوە ناوچەی "چەرخ"ی لێوارەکانی دەریای خەزەر و لەوێ نیشتەجێیانی کرد. ماوەیەک دوای ئەم سەرکەوتنانە کۆچی دوایی کرد و لە جێگەی ئەو، برایەکەی، مهرداد کە لەلای زۆر خۆشەویست بوو هاتە سەر تەخت.

پاشابوونی مهردادی یەکەمی ئەشکانی:

دوای کۆچی دوایی فەرهاد، مهردادی یەکەمی برای هاتە سەر تەختی ئەشکانی. بە دەستپێکردنی دەسەڵاتداریی مهرداد، مەزنترین سەردەمی مێژوویی ئەشکانییەکان دەستی پێکرد.

لە دەوروبەری ١٧٥ ساڵ بەر لەدایکبوونی مەسیح، یوکراتیدس دەستی بە هەڵگیرساندنی شەڕ و گێرمە و کێشە کرد. مهرداد کاتێک هەستی بەم شلەژاوی و لاوازییەی کاروباری وڵاتی باختەر کرد، هێرشی بردە ئەو سەرزەوییە و تاپوریا و

ماوەرالنەهری داگیر کرد.

دوای ئەم سەرکەوتنانە، مهرداد داگیرکردنەکانی خۆی بەردەوام کرد و لە خوارووی زابلستانەوە تا دەوروبەری پورالین و ناوچەکانی ئاریان، توران و مەکرانیشی هێنایە ژێر دەسەڵاتداری خۆیەوە.

مهرداد شەشەم سوڵتانی بنەماڵەی ئەشکانی بووە.

## هاتنی کوردە بەلوچەکان بۆ ناو خاکی توران و مەکران:

مهرداد پاش داگیرکردنی ولایەتەکانی ماوەرالنەهر، ڕووی کردە سەرزەوییەکانی خوارووی زابلستان واتە توران و مەکران کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی یۆنانییەکاندا، سیلوکوس پاشا بە تاوانی شەڕ دابوونی بە پاشای هیند چەندراگوپتان مۆریان. ئەم ولایەتانە، نیشتمانی باپیرانی کوردە بەلوچەکان بوو. کوردە بەلوچەکان چاوەڕوانی دەرفەتێکی لەم چەشنە بوون کە بتوانن دووبارە نیشتانی باپیرانیان وەرگرنەوە. لەبەر ئەوە کوردە بەلوچەکان بە دڵ و گیان هاوکاری و هاوەڵیی مهرداد پاشای ئەشکانیان کرد.

کاتێک مهرداد پاشای ئەشکانی هێرشی بردە سەر توران و مەکران، میر بورگان میر میرانی زابلستان لەگەڵ سەرۆکی تیرە پێنجینەکانی کورد، واتە میر بەهرام براخۆیی، میر گنزان ئەدرەگانی، میر کالانچ ماملی و میر ئەستال کرمانی لەم شەڕەدا لەگەڵ مهرداد پاشای ئەشکانی بەشدارییان کردووە.

## شەڕ لە سوهر ئابادان:

کوردە بەلوچەکان لەگەڵ هەموو تیرەکانی خۆیان شالاویان بردە سەر خێوەتگەی جدگالەکان لە سوهر ئابادان. لەبەرئەوەی، هێرشەکە لە ناکاو بوو، جدگالەکان نەیانتوانی بە نەبەردی بەرهەڵستکاریی بکەن.

سەرلەشکری جدگالەکان پوران ویدا لەگەڵ چەند سەرهەنگێکی خۆی بە ناوی بالرا، موندرا و دگیا لە مەیدانی شەڕ کوشتران و لەشکری کوردە بەلوچەکان و ئەشکانییەکان گەیشتنە دەوروبەری کوهیار پایەتەختی توران.

شەڕ لە کوهیار:

هەواڵی هێرشی ئەشکانییەکان بە میری سوپای جدگالەکان گەیشتبوو لەبەرئەوەی ئەوان سەربازێکی زۆریان لە کوهیار کۆ کردبووەوە و بە سەرۆکایەتیی سەرلەشکرەکەیان رادهان ڕووبەڕووی لەشکری ئەشکانییەکان و کوردە بەلوچەکان بوونەوە.

لە کاتی شەڕدا، ڕێکخستنی لەشکریی ئەشکانییەکان و کوردە بەلوچەکان بەم چەشنە بووە: ڕێبەرایەتیی بەشی ناوەندی لەشکر میر سۆران میری قشونی ئەشکانییەکان دەیکرد، سەرۆکایەتیی باڵی راستی سوپا میر بەهرام براخۆیی کردوویەتی و باڵی چەپیش میر گنزان ئەدرەگانی سەرۆکایەتیی کردووە.

کاتێک دەنگی تەپڵی شەڕ بەرز بووەوە، پێکدادانێکی درێژخایەن دەستی پێ کرد. جدگالەکان لە ئاکام شکستیان بە تەوێڵی خۆیانەوە بینی و ڕوویان لە هەڵاتن کرد. سوپای ئەشکانییەکان و کوردە بەلوچەکان تا دەوروبەری گۆمی پورالین و دەریای عومانیان داگیر کرد.

لەم کاتەدا، میر بورگان میر میرانی زابلستان ناوچەی مەکرانی داگیر کرد و سەرلەشکری جدگالەکان "برهمابسین"ی کوشت. لەشکری برهمابسینیش هەموو لەباری پەشۆکاویدا لەناوچوون.

دوای ئەم سەرکەوتن و کامەرانییە، مهرداد کوردە بەلوچەکانی کە هاونەژادی بوون بۆ جارێکی تر لە ولایەتەکانی باپیرانیان واتە توران و مەکران نیشتەجێ کردەوە. هەروەها، دووبارە دەسەڵاتداریی توران و مەکرانی دایەوە ئەم تیرانەی کوردە بەلوچەکان کە لە سەردەمی پاشایەتیی مادەکان و هەخامەنشییەکانیش دەسەڵاتداریی ئەم ناوچانەیان کردبوو.

بەم شێوەیە، میر بەهرام براخۆیی لەسەر تەختی میرنشینی توران و میر گنزان ئەدرەگانی لەسەر تەختی میرنشینی مەکران دانیشاند و فەرمانڕەواییەکانی ددان پێ دانا.

ڕیشەی تیرەکانی کوردە بەلوچەکان لە دوورەوڵاتی:

ڕیشەی تیرەکانی کوردە بەلوچەکان لە کاتی دوورەوڵاتی بەم شێوەیە بووە:

أ. كوردی براخۆیی: میر کیکانی دووەم، میر بەختیار، میر مهراب، میر سام، میر شاهەک، میر بەهرام.

ب. کوردی زەنگەنە: میر برسان، میر فیروز، میر ئیسپیبود، میر کورنگ، میر بورگان، میر مهران.

ج. کوردی ئەدرەگانی: میر لبوسان، میر شاهەک، میر منگیب، میر بەختیار، میر بسول، میر گنزان.

د. کوردی ماملی: میر بۆلان، میر کیشان، میر کنجان، میر بەسران، میر ئەرجان، میر کالانچ.

ه. کوردی کرمانی: میر توران، میر ئەننو، میر ماهداد، میر ماکەک، میر گۆران، میر ئەستال.

## فەرمانڕەوایی کوردە بەلوچەکان لە توران و مەکران

## خولی سێیەم

کاتێک بنەماڵەی ئەشکانی دەسەڵاتداریی بنەماڵەی سیلوکیی بەنەژاد یۆنانییان لە ماد و پارس کۆتا پێ هێنا و یۆنانییەکان لە وڵات کردە دەر و فەرمانڕەوایی خۆیان ڕاگەیاند، سەرۆکەکانی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان میر بەهرام براخۆیی، میر گنزان ئەدرەگانی، میر کالانچ ماملی و میر ئەستال کرمانی لە دوورەوڵات بوون و لە ولایەتی زابلستان ژیانیان بەسەر دەبرد. ئەم سەرۆکانە پێوەندیی برایانەیان لە تەک ئەشکانییەکان دروست کرد و بۆ جاری سێیەم خۆیان بە لووتکەی دەسەڵات گەیاند.

بەم شێوەیە، میر بەهرام براخۆیی لەسەر تەختی میرنشینیی توران دانیشت و میر گنزان ئەدرەگانی دەسەڵاتی میرنشینیی مەکرانی گرتە دەست. بەم شێوەیە، بۆ جاری سێیەم فەرمانڕەوایی کوردی براخۆیی لە توران و کوردی ئەدرەگانی لە مەکران دەستی پێ کرد.

### میر میران میر بەهرام براخۆیی

میر بەهرام دوای ئەوەی هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران، خۆی سەرقاڵی

بەهێزکردنی پێگەی دەسەڵاتدارییەکەی کرد. لەم بەستێنەدا، ژمارەی سوپای تیرەکانی زیاد کرد و لەم شارانە: نفان، دەشتی سوهر ئاباداِن، کیکان، غوزدار و ئەرمائیل چەند قەڵای سەخت و بەهێزی دروست کرد.

میر بەهرام دەیخواست غوزدار بکاتە پایەتەختی میرنشینیی توران، بەڵام ئەم خواستەی سەری نەگرت. ئەمەش لەبەرئەوەی لە سەردەمەکانی پێشوودا، پایەتەختی میرەکانی کوردە براخۆییەکان لە ناوچەی باکوری توران، لە شاری کیکان بووە. هەڵکەوتی ئەم شارە زۆر بەهێز و نەگر بووە.

کۆچی دوایی مهردادی یەکەم:

مهردادی یەکەم ۳۳ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد. لە سەردەمی خۆیدا سەڵتەنەتی ماد و پارسی بەرین کردەوە و فەرمانڕەواییەکەی بە ئاستی هێز و شکۆی جیهانی گەیاند و ناوبانگی ڕۆشنایی هەتایی پێ دا. پاشان دنیای فانیی بەجێ هێشت و کۆچی دوایی کرد.

هێرشی هۆزەکانی ساکا بۆ سەر کەوشەنی ماد:

مهردادی یەکەم لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا کاتێک سەرقاڵی داگیرکردنی ولایەتەکانی توران و مەکران بوو، هەواڵی هاتنی ساکایەکانی پێ گەیشت کە لە ناوچەی خۆیانەوە هاتوونەتە تورکستان و لەوێشەوە ڕوویان لە باشوور کردووە و گەیشتوونەتە نزیکی سنوورەکانی پارس.

مهرداد پاش دەست بەسەراگرتنی ولایەتەکانی توران و مەکران، بە پەلە بەرەو هەرکانیا بەڕێ کەوت و هێرشی بردە سەر ڕێی هێرشی ساکایەکان کە لە شاڕێی گەورەی مەڕۆ و هاتم پیلوسەوە بەرەو ئەکباتانا ڕوویان هێنابوو. مهرداد بەم چەشنە لەگەڵیان سەرقاڵی شەڕ بوو.

ساکایەکان کاتێک بەرەو ڕووی بەرهەڵستکاری و خۆڕاگری بوونەوە، بەرەو خواروو چوون و لە ڕێگەی مەڕۆ و هیرات و زابلستانەوە ڕێگەی هیندیان گرتە بەر.

پاشابوونی فەرهادی دووەم:

فەرهاد دوای کۆچی دوایی باوکی هاتە سەر تەختی ئەشکانی. پاشای

سیلوکی دیمتردس لەژێر دەستی باوکی بەند بوو. فەرهاد کە بوو بە پاشا وەکو باوکی خووڕەوشتی میهرەبانانەی لەگەڵ ئەم دیلە پاشاییە بەکار هێنا.

لەو کاتەدا، ئەنتیوکوس برای دیمتردس بەسەر ناحەزەکەی، تریفون، سەرکەوت و پاشایەتیی سووریای هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی. پاش ئەم سەرکەوتنە، بە مەبەستی ئازادکردنی دیمتردسی برای لە بەندیی ئەشکانییەکان، بە لەشکرێکی گەورەوە بەرەو ماد هێرشی هێنا. دوای سێ شەڕ، ئەنتیوکوس سوپای ئەشکانیی شکست دا. زستان داهات و ئەنتیوکوس دەبوو بگەڕێتەوە سووریا بەڵام ئەوەی نەکرد و لە دەوروبەری ماد مایەوە. فەرهادیش ڕووی لە پاشەکشە کرد.

ئەنتیوکوس پاشای سیلوکی سەربازی زۆری هەبوو بۆیە ناچار بەسەر شارە جیاوازەکانی دابەش کرد. ئەمەش بێگومان بووە هۆی بارگرانی لەسەر شانی خەڵکە شارنشینە خۆماڵییەکان و ڕق و کینەیان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاد دەبوو. هەروەها سەربازانی سیلوکیش بە هۆی چەند مانگ مانەوەیان بە بێکاری، بێهێز و تەوەزەل بووبوون. ئەمە جگە لەوەی بە هۆی بڵاوبوونەوەیان بە دەوری شارە جیاوازەکان باڵادەستییان لە هەمبەر هێزەکانی ئەشکانییەکان لەدەست دا.

ئەنتیوکوس لەم بارودۆخەدا ویستی شەڕ دەست پێ بکات و بۆ ئەم مەبەستە خێرا چوو نزیکترین دەستەی هێزەکانی بەسەر بکاتەوە. بەڵام کاتێک گەیشتە شوێنی مەبەست بۆی دەرکەوت کە فەرهاد لەمەیان لەو زووتر بەخۆ کەوتووە. سەردارەکانی ئامۆژگارییان کرد کە لەگەڵ سوپای دوژمن کە ژمارەیان لەوان زیاترە نەکەوێتە شەڕ و واز لە پاشای ئەشکانی کە بۆ پێویست لە کێوەکانی دەوروبەر سەنگەری گرتبوو بهێنێ.

ئەنتیوکوس پێی نەنگ بوو لە ئاست دوژمنێک کە پێشتر خۆی شکستی دابوون ڕوو لە هەڵاتن بکات و هێرشی هێنایە سەر سوپای ئەشکانی. سەربازانی سیلوکی کە لە ڕووی چەک و قەوارەوە بێهێز و لاوازتر بوون لە بەرامبەر سوارەکانی ئەشکانییەکان تێک شکان و هەڵاتن. ئەنتیوکوس بە تاک و تەنیایی مایەوە ئەشکانییەکان کوشتییان و سوپاکەشیان بە تەواوی لەناو برد.

کوژرانی فەرهاد بە دەستی ساکایەکان:

لە شەڕی پێشووی ئەنتیوکوسدا، فەرهاد سەربازی لە هۆزەکانی ساکایەکان

بەکرێ گرتبوو بەڵام سەربازەکان لە کاتی شەڕ نەگەیشتن و هەر بۆیەش ئەنتیوکوس فەرهادی شکست دابوو. بەڵام ئەمجارەیان پاش ئەوەی فەرهاد دوژمنی شکست دا داوای کرێیەکەی لە ساکایەکان کردەوە.

ساکایەکان لە بەرسڤدا گوتیان سەربازەکانمان بۆ شەڕ ئامادەن. بەڵام لەبەرئەوەی کاتی شەڕ تێ پەڕیبوو، فەرهاد سەرۆکی ساکایەکانی قەبووڵ نەکرد لەبەر ئەم هۆیەش ساکایەکان دەستیان بە یاخیگەری و تاڵان و بڕۆی ناوچە پارێزراوەکانی ئەشکانییەکانیان کرد. لەم شۆڕش و یاخیگەرییەدا، بەشێکی هۆزەکانی ساکایەکان کە بە ئوکا بەناوبانگ بوون بە تەماحی چەپاوکردن و داگیرکردنی ناوچەکان لە پێش پێشەوە بوون.

فەرهاد لە بەرامبەر ساکایەکان لەشکرێکی پێک هێنا و هەندێ سەربازی یۆنانیشی کە لە شەڕەکانی ئەنتیوکوسدا بە دیلی گرتبوون بەگەڵ سوپاکەی خۆی دا وای لێکدایەوە کە لە سەرزەویی خۆیانەوە زۆر دوورن و بۆ پاراستنی گیانی خۆیان وەفاداری دەبن دژی دوژمن بۆی دەجەنگن. بەڵام لە مەیدانی شەڕ کاتێک یۆنانییەکان هەستیان بە زەبوونحاڵی فەرهاد کرد، پشتیان بەردا و چوونە ناو سوپای ساکایەکان.

لە ئەنجامی ئەم خوێنرێژی و کوشت و بڕینە فەرهاد گیانی لەدەست دا.

پاشابوونی ئەردەوانی دووەم:

پاش ئەوەی فەرهاد لە شەڕی ساکایەکان گیانی لەدەست دا، ئەردەوانی مامی بوو بە جێنشینی و کێشەی هێرشە دژوارەکانی ساکایەکانی بەم شێوەیە چارەسەر کرد کە بە ڕواڵەت قەبووڵی کرد باجیان بداتێ. بەڵام لەبەرئەوەی ساکایەکان ناوچەیەکی بە پیتی ئەشکانییەکانیان داگیر کردبوو، ئەنجامی کارەکەی هەر بە شەڕ گەیشتەوە.

ئەردەوان لە یەکێک لە قۆڵەکانی باختەرەوە هێرشی هێنایە سەر ساکایەکان، لە کاتی شەڕ زامێکی کوشندە بەر باسکی کەوت و لەبەرئەوەی چەکەکە ژاراوی بوو گیانی دا.

### کۆچی دوایی میر بەهرام براخۆیی:

میر بەهرام ٤٢ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و لە سەردەمی پیریدا کۆچی دوایی کرد. ئەردەوانی دووەمی پاشای ئەشکانی هاوچەرخی ئەو بوو و هەروەها ئەم میرانەی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکانیش: میر مهراب زەنگەنە، میر گنزان ئەدرەگانی، میر کالانچ ماملی و میر ئەستال کرمانی هاوچەرخی بوون.

### میر میران میر شەهداد براخۆیی:

دوای کۆچی دوایی میر بەهرام، کوڕەکەی میر شاهداد هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا، هۆزەکانی ساکایەکان لە ناوچەی باختەر هێرشیان هێنایە سەر ڕۆهەڵاتی خوراسان و بەشێکی بە پیتی وڵاتی ئەشکانییەکانیان داگیر کرد. ئەردەوانیش هێرشی بردە سەریان و لە شەڕ کوژرا.

پاشان، مهردادی دووەمی کوڕی هاتە سەر تەخت و دەسەڵاتداریی سەڵتەنەتی ئەشکانیی گرتە دەست و بۆ سەرکوتکردنی هۆزەکانی ساکایەکان تێ کۆشا.

### پاشابوونی مهردادی دووەم:

پاش ئەوەی ئەردەوانی دووەم لە شەڕی ساکایەکان کوژرا، بەرپرسانی سەڵتەنەت مهردادی کوڕیان هێنایە سەر تەخت. مهردادی دووەم وەکو مهردادی یەکەم، هاوناوی گەورەی خۆی، سەردەمی پاشایەتیی بە ڕووداوی گرینگەوە بەسەر برد و ناوبانگی زۆری پەیدا کرد و بە نازناوی مهردادی مەزن ناسرا.

مهردادی دووەم لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا ڕێگریی لە پێشڤەچوونەکانی ساکایەکان کە هۆزی بیاوانیبوون کرد و بەشی سەرەکیی ئەم هۆزانەی بەرەو خواروو بۆ ناو وڵاتی هیند ڕاو نا و سەڵتەنەتی خۆی لە شەڕ و ئاژاوە و گیروگرفتی ئەوان بۆ هەمووکات ڕزگار کرد و پاش ٣٦ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد.

### شەڕی کوردە بەلوچەکان لەگەڵ ساکایەکان:

پاش کوژرانی پاشای ئەشکانی ئەردەوانی دووەم لە شەڕی ساکایەکان،

هۆزەکانی ساکایەکان ورەیان بەرز بووەوە هێرشیان هێنایە سەر ناوچەی توران و سیستان. بەشێکی ساکایەکان لەژێر فەرمانی میر توخاس بەرەو توران هێرشیان هێنا. سەرۆکەکانی تیرەکانی کوردە بەلوچەکان: میر شاهداد براخۆیی، میر نوجان زەنگەنە، میر دلگین ئەدرەگانی، میر دروار ماملی و میر زرەک کرمانی لە ناوچە زیخاوییەکانی دۆلی نشکیندا جڵەویان لە هێرشەکەیان گرت.

کاتێک ئەم دوو هێزە ڕووبەڕوو بوونەوە، شەڕ و پێکدادانێکی سەخت ڕووی دا و توخاس میری ساکایەکان شکستی خوارد و ڕێگەی هەڵاتنی گرتە بەر و گەڕایەوە باختەر.

میر میران میر فیروز براخۆیی:

میر شاهداد دوای ۳۱ ساڵ فەرمانڕەوایی، جیهانی فانیی بەجێ هێشت و کوڕەکەی، میر فیروز هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لەو کاتە ساکایەکان بۆ جارێکی تر هێرشیان هێنایە سەر توران و مەکران و دەستیان بە داگیرکاری کرد.

شەڕ لەگەڵ ساکایەکان لە دۆلی مساتنج:

میرانی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان بە بیستنی هاتنی ساکایەکان بۆ ڕاوێژ کۆ بوونەوە. ئەوان سەرقاڵی ڕاوێژکاری بوون کە میر موغو ساکا لەگەڵ سەربازەکانی هاتە ناوچەی کیکانان و لە دۆلی "مساتنج" لە نزیک شاری سامپوران خێمەیان هەڵدا. میرەکانی کوردە بەلوچەکان: میر فیروز براخۆیی، میر سیامەک زەنگەنە، میر بەهرام ئەدرەگانی، میر سام ماملی و میر مهراب کرمانی بە خێرایی بە مەبەستی ڕێگرتن لە هاتنە پێشیان بە لەشکری تیرەکانیانەوە هێرشیان بردە سەر شوێنی دوژمن و لە دەوروبەری شاری سامپوران لەگەڵ دوژمن ڕووبەڕوو بوونەوە. میر موغو ساکا شکستی خوارد و داوای ئاشتیی کرد و لە سەرۆکەکانی کورد پاڕایەوە کە ڕێگە بە خۆی و تیرەکانی بدەن لە تەنگەی بۆلانەوە تێ پەڕن.

کوردەکان داواکەیان قەبووڵ کرد و بەم چەشنە ئەو لەگەڵ تیرەکانی خۆی چووە ناو خاکی ڕۆژئاوای هیند.

پاشابوون و کوژرانی گودرزی یەکەم:

مـــهردادی دووەم دوو کـــوڕی لە پاش بەجـێ مــا: گـــودرز و ئوروود. گـودرز کـوڕە گەورەکەیان بوو و بەپێی دەستووری ئەشکانییەکان هاتە سەر تەختی باوکی و تا حەوت ساڵ فەرمـانڕەوایی کرد. بەڵام لەبەرئەوەی لەگەڵ برایەکەی گرفتی هەبوو، ئوروود بە کوشتی دا و خۆی هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی.

پاشابوون و کوژرانی ئوروودی یەکەم:

پاش ئەوەی ئوروود بـە فێڵ گـودرزی برای کوشت و لە جێگەی خۆی هاتە سـەر تەخت، مـاوەیەکی زۆر دەسـەڵاتداریی نەکـرد و تـا شـەش سـاڵ پاشـایەتیـیـەکـەی درێژەی کـێـشـا. ئەمـەش لەبەرئەوەی، لایەنگران و پشـتـیـوانانـی گـودرز لـە تۆڵەی کوشتنی گودرز، ئوروودیان کوشت و سزای کردەوەکەیان دایەوە.

پاشابوونی سەنا تورک:

دوای کوژرانی ئوروودی یەکەم، لە بنەماڵەی ئەشکانییەکاندا کەسێکی وا نەمابوو کە لەسەر تەختی دابنێن تەنیا پیرەمێردێک نەبێت بە ناوی سەنا تورک کە هێشتان لە ژیاندا بوو و لـە کاتی کوژرانی ئوروودی یەکەم لە مێوانسـەرای سـەڵتـەنەتەکەدا ژیانی گۆشەگیریی دەبردە سەر و تەمەنی ٨٠ ساڵ بوو.

هۆزەکانی ساکارکائو ئەویان بە میراتگری سـەڵتەنەتی ئەشکانی هەژمـارد. بەم شێوەیە، ئەم هۆزە کۆچەرانە هاوکاری و پشتگیرییان لێ کرد و بانگ هێشتنیـان کرد کە جڵەوی دەسەڵاتداری بگرێتـە دەست و بارودۆخی پاشـاگەردانی و ناڕێکی لە وڵات کۆتای پێ بهێنێت. ئەویش کە هاتە سـەر تەخت، هێمنی و ئاشتیی بۆ وڵات گەڕاندەوە و دوای شەش ساڵ فەرمانڕەوایی کردن کۆچی دوایی کرد.

**میر میران میر مهرداد براخۆیی:**

دوای کۆچی دوایی مـیر فـیرۆز، کوڕەکەی، میـر مـهرداد براخـۆیی هاتە سـەر تەختی مـیرنشینیی توران. مـیر مهرداد ئەو میرانەی تیرەکانی کورد کە لە شەڕی ساکایەکان چووبوون بۆ دۆڵی مساتنج و لە پێناو داکۆکیکردن لە خاکیان لە شەڕ کوژرابوون، کوڕەکانیانی بە ڕاوێژی ئەندامانی دیوانی بولک لەسەر پلەی سەرۆک

تیرایەتیی خۆیانیانی دانا و دەستاری لەسەر کردن. لەم شەڕەدا، میر سیامەک زەنگەنە و میر سام ماملی گیانیان لەدەست دابوو و کوڕەکانیان میر بیدار زەنگەنە و میر بلفان ماملی بەپێی بڕیاری ئەندامانی دیوانی بولک بە پەلە لەسەر پلەی سەرۆک تیرایەتی دانران بۆ ئەوەی لاوازی لە ڕێژیمی هۆزایەتییان پەیدا نەبێت.

لە سەردەمی فەرمانڕەواییی میر مهرداد، میری ساکایەکان "موسون" کە بە"مایوس" و "ماگا"شیان پێ دەگوت لە باختەر و ئەراسوشیا و زەرەنگیانا بناخەی وڵاتی خۆی دانا و پێوەندیی دۆستانەی لەگەڵ کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران بەهێز کرد.

میر مهرداد براخۆیی ١٤ ساڵ فەرمانڕەواییی کرد و ئەم میرانەی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان: میر بیدار زەنگەنە، میر فیروک ئەدرەگانی، میر بلفان ماملی و میر ئەجبان کرمانی هاوچەرخی بوون.

پاشابوونی فەرهادی سێیەم:

دوای کۆچی دواییی سەنا تورک، کوڕەکەی، فەرهادی سێیەم هاتە سەر تەختی ئەشکانییەکان و لە چاخی فەرمانڕەواییی ئەودا، هۆزەکانی ساکا لە ئەراخوسیا و زابلستان میرنشینیی خۆیان دامەزراند و لەگەڵ ئەوەشدا سەروەریی فەرمانڕەواییی ئەشکانییەکانیان قەبووڵ کرد. فەرهادی سێیەم ١١ ساڵ فەرمانڕەواییی کرد.

کوژرانی فەرهادی سێیەم:

فەرهادی سێیەم دوو کوڕی بە ناوی مهرداد و ئورود هەبوو. ئەم دوو کوڕە لەگەڵ یەک دەستیان لەناو دەستی یەک نا و باوکیان زەهر دەرخوارد دا و کوشتیان. بەم شێوەیە، لەناو بنەماڵەی ئەشکانی سەرەتای نەریتی باوککوژی و براکوژییان کردەوە.

هۆزەکانی ساکا:

یوچین تیرەیەکی هۆزی توخاری بووە و لە ناوچەی کان سیندا نیشتەجێ بوون و

لەگەڵ تیرەکانی تری توخاری دوژمنداریان هەبووە و هەردەم لە شەڕ و پێکداداندا بوونە. لە ئاکام تیرە بەرهەڵستکارەکان بەسەر تیرەی یوچیندا زاڵ بوون و بەرەو باشوور ڕاویان نان. تیرەی یوچین ناچار نشینگەی باپیرانیان بەجێ هێشت و لەگەڵ سەرۆکەکانیان کە نازناوی "ئەرسک"یان هەبوو: ئەرسک موخان، ئەرسک موساس و ئەرسک توغر هاتنە ناوچەی ڕووباری سیحون. ئەم ناوچەیە نشینگەی باپیرانی ساکایەکان بوو. لەبەر ئەوە لەم ناوچەیە تووشی شەڕ و پێکدادان بوون لەگەڵ هۆزی سیتەکان واتە ساکایەکان.

تیرەی یوچین بە هۆی ژمارەوە بەسەر ساکایەکان زاڵ بوون و ناوچەکانیان هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و تیرەکانی ساکایەکانیان بەرەو ڕۆژئاوا ناوچەی باختەر واتە ڕۆهەڵاتی خۆراسان ڕاو نا.

ساکایەکان ئێلێکی مەزن بوون و لە دوو تیرە: ساکارا و ماساکارا پێکهاتبوون. ئەمانە ناچار هێرشیان بردە سەر باختەر و لە "توریوا" لە ناوچەی ماوەرالنەهر مهردادی یەکەم پاشای ئەشکانییەکان ڕووبەڕووی ئەم هێرشهێنەرە ساکایانە بووەوە و شکستی دان و هاتنە پێشیانی وەستاند.

دوای کۆچی دوایی مهردادی یەکەم، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی فەرهادی دووەمی کوڕی، پەلاماردەرە ساکایەکان جارێکی تر هێرشیان هێنایە سەر سنوورەکانی ڕۆهەڵاتی پارس. ئەم هۆزە گەورە هێرشهێنەرانەی ساکایەکان پاشماوەی میرنشینیی باختەریان بە تەواوی لەناو برد. بەڵام پاشای ئەشکانییەکان بە هەموو هێزی شەڕییەوە بەرهەڵستکاری و بەرگریی کرد. سەختی و دژواریی ئەم شەڕانە بە چەشنێک بوو کە دوو کەس لە شاکانی ئەشکانی فەرهادی دووەم و کوڕەکەی، ئەردەوانی دووەم لە شەڕی ساکایەکان کوژران و خوێنیان بە فیڕۆ چوو.

دامەزراندنی میرنشینەکانی ساکایەکان:

ساکایەکان بەر لە کۆچی گشتیی خۆیان، زانیارییان لەمەڕ سەرزەوییەکانی ڕۆهەڵاتی وڵاتی ماد و پارس هەبووە. ئەمەش بەم پێیەی کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی یۆنانییەکان ئەوان لە باختەر هاتوچۆیان هەبووە. جگە لەمە یۆنانییەکان لە قشوونی خۆیان بە سەرباز وەریان گرتوون و هەندێ لە

سەردارەکانیشیان لەسەر پلەی مەزنی سەربازیی ئەواندا دامەزراون.

بۆیە کاتێک ساکایەکان کۆچی گشتیی خۆیان دەست پێ کرد، لە باختەرەوە سەراوژێر بوون و لە ناوچەکانی زەرەنگ و کەندارا پەرت و بڵاو بوونەوە و لەو سەرزەوییانە نیشتەجێ بوون. لەگەڵ ڕەوتی سەردەمیشدا بناخەی هۆزایەتیی خۆیان پتەو کرد و کەوتنە دامەزراندنی میرنشینیی خۆیان و بوون بە خاوەنی وڵاتێکی بەهێز و بەرین.

کەوشەنی وڵاتەکەیان لە ڕۆژهەڵاتەوە لکابوو بە ناوچەکانی سندان و تەنگەی بۆلان. ئەوان تەنگەی بۆلانیان بە "بی لان" ناساندووە و ناوی ولایەتی زەرەنگیش بە هۆی نیشتەجێبوونی ئەوان بە "سەکستان" ناسرا و ئێستاش هەر بەم ناوە بەناوبانگە.

مایسەس میری ساکایەکان:

مایسەس کە هەندێ مێژوونووس بە "مایوس"یش ناویان بردووە سەرداری هۆزەکانی ساکایەکان بووە و لە ساڵی ٧٥ ی پێش زاین ولایەتی "ئەراسوشیا"ی داگیر کرد و لەوێ میرنشینیی خۆی پێک هێنا و سەروەریی فەرمانڕەوایی ئەشکانیی ماد و پارسی قەبووڵ کرد و وڵاتەکەی خۆی سەربەخۆ کرد.

پاشاکانی ئەشکانی مرۆڤانێک بوون کە لە بەکارهێنانی بارودۆخ تێ گەیشتوون و سوود و قازانجی زۆریان لە ڕۆژگاری ئاشتی وەرگرتووە. سروشتێکیان هەبووە کە بە جۆرێک پەیماننامەیان لەگەڵ بەرامبەر بەستووە کە لە بەرژەوەندیی خۆیان سوودیان لێ وەرگرتووە. هەروەها، بەپێی نەریتی پارسەکان هەموو کات پەیماننامەکانیان ڕێگەی بە ئیمزاکاران داوە کە سەربەست بن لەناو وڵاتەکەیان. پاشاکانی ئەشکانی لەگەڵ میرەکانی ساکایەکانیش هەمان نەریتیان پەیڕۆ کرد.

مایسەس دوای هاتنە سەر تەختی میرنشینی، توانی میرنشینییەکەی پتەو بکات و کەوشەنەکەی بەرین بکاتەوە. لەم ڕووەوە، لە ڕۆژهەڵات ناوچەگەلێکی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە کە سنوورەکانی تا تکسولان و ڕووباری سندان هەڵدەکشان.

مایسەس ٢٥ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد. ئەو بە "موسون"یش دەناسرا و هاوچەرخی سەنا تورکی پاشای ئەشکانی بووە.

یەکگرتنی کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران لەگەڵ ساکایەکانی زابلستان:

لە سەردەمی پاشایەتیی سەنا تورکی ئەشکانیدا هۆزەکانی ساکایەکان لە ئەراسوشیا، کەندارا، زابلستان و باختەر میرنشینەکانی خۆیان دادەمەزراند و سەروەریی فەرمانڕەواکانی ئەشکانیشیان قەبووڵ کرد. ساکایەکان لەگەڵ خەڵکە خۆماڵییەکانی ئەم هەرێمانە تێکەڵاو بوون بۆ ئەوەی فەرق و جیاوازی لە نێوانیاندا نەمێنێ.

لەسەر بنەمای ئەم دەستوورە، پێوەندیی خۆ بەبرازانینیان لەگەڵ کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران چەسپاند و ئەم یەکگرتنەی نێوانیان بووە هۆی پتەوی و بەهێزیی هەردوولا. میر مایسەس ساکا لە دەستبەکاربوونی دەسەڵاتدارییەکەیەوە هۆشی دایە یەکگرتووکردنی کوردە بەلوچەکان و ساکایەکان.

میر ئیزسەس ساکا:

میر مایسەس ساکا یەکەم پاشای میرنشینیی ساکایەکان بوو و بۆ ماوەی ٢٥ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد. کاتێک کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی لە پاش بەجێ ما بە ناوی ئیزسەس و ئازونسەس. ئیزسەسیان هاتە سەر تەختی باوکی و ناوچەی پەنج ئابەی داگیر کرد و بە وڵاتەکەی خۆیەوە لکاند و ئازونسەسی براشی کرد بە حاکمی ئەم ولایەتە.

ئیزسەس نزیکەی ٢٨ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد. لە چاخی فەرمانڕەوایی ئەودا، میر فەرهاد کوردی زەنگەنە لەگەڵ هۆزەکەی نشینگەی گواستەوە توران و دوو تیرەی ساکایەکان "سەلگور" و "ساگدی"شی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوون.

پاشابوون و کوژرانی مهردادی سێیەم:

مهردادی سێیەم دوای کوشتنی باوکی، هاتە سەر تەختی پاشایەتی و پاش ماوەیەک هەڵمەتی بردە سەر ئەرمەنستان. لە کاتی لەوێ نەبوونی ئەو، ئورودی برای تەختی دەسەڵاتداریی داگیر کرد. مهرداد کاتێک ئەم هەواڵەی پێ گەیشت خێرا هاتە پایەتەخت و لە شەڕ شکستی دا و خەڵکێکی زۆریشی لە پشتیوانانی ئەو کوشت.

مهرداد ستەم و زۆرداریی کردە شێوازی خۆی و ئەندامانی دەوڵەت بەمە دڵگران بوون و لەسەر تەخت دەریان کرد و ئورودی برایان هێنایە سەر تەخت. مهردادیش چووە داڵدەی عەرەبەکان و بە یارمەتیی ئەوان دووبارە هێرشی هێنایەوە سەر سەڵتەنەتی پارس بەڵام سوورن سوپاسالاری ئورود شکستی دا و کوشتی.

**میر میران میر بەهمەن براخۆیی:**

دوای ئەوەی میر مهرداد کۆچی دوایی کرد، میر بەهمەنی کوڕی هاتە سەر تەختی توران. لە سەردەمی دەسەڵاتداریی میر بەهمەن، میر فەرهاد زەنگەنە بە خۆی و هۆزەکەیەوە لەگەڵ دوو تیرەی ساکایەکان بە ناوی سەلگور و ساگدی لە ناوچەی زابلستانەوە نشینگەیان گواستەوە توران. میر بەهمەن براخۆیی میر میرانی توران، میر فەرهاد و هۆزەکەی لە دۆڵی گۆراندا نیشتەجێ کرد و دوو تیرەکەی ساکایەکانیشی ناردە ناوچەی غوزدار و میر ساکین سەرداری تیرەی ساگدیی لەگەڵ تیرەکەیدا لە دۆڵی گریشکان نیشتەجێ کرد و میر کودر سەرۆکی تیرەی سەلگوریشی لە تەک تیرەکەیدا لە دۆڵی پیلار نیشتەجێ کرد.

میر بەهمەن ئەم سەرۆک تیرانەی کوردە بەلوچەکان: میر فەرهاد زەنگەنە، میر بویک ئەدرەگانی، میر میوان ماملی و میر سنهان کرمانی هاوچەرخی بوونە. میر بەهمەن بۆ ماوەی ۲۹ ساڵ لە ولایەتی توران پاشایەتیی کرد.

ئیزسەسی دووەم میر ساکایەکان:

کاتێک ئیزسەسی یەکەم کۆچی دوایی کرد، ئیسالی سەسی کوڕی بە نازناوی ئیزسەسی دووەم هاتە سەر تەختی میرنشینیی زابلستان. ون سان برای بچووکی بوو. ئیزسەسی دووەم بەردەوام بوو لە داگیرکردنەکانی لە پەنج ئابە و برای خۆی ون سانیشی بۆ ولایەتە داگیرکراوەکانی وڵاتی هیند نارد بۆ ئەوەی دەسەڵاتداریی دەوڵەتی بگرێتە دەست و فەرمانڕەوایی بکات. ئەو یەکەم میری ساکایەکان بوو کە سەرەتای فەرمانڕەوای خۆی لە وڵاتی هیند دەست پێ بکات. ئیزسەسی دووەم لە زابلستان ۲۲ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و کۆچی دوایی کرد.

میر میران میر بسسام براخۆیی:

پاش کۆچی دوایی میر بەهمەن، میر بسسامی کوڕی هاتە سەر میرنشینیی توران. لە سەردەمی میرنشینیی بسسام "دیوانی ملوکی توران و مەکران" دامەزرا. مەبەست لە دامەزراندنی ئەم دامەزراوەیە ئەوە بوو کە بەڕێوەبەرایەتیی ولایەتی توران و مەکران بە کاری هاوبەشی دیوانی ملوک ئەنجام بدەن.

دوای دامەزراندنی دیوانی ملوک کاروباری سەربازیی توران و مەکران لەژێر چاودێریی ئەم دیوانە ئەنجام دەدرا. ئەم سەرۆکانەی کوردە بەلوچەکان میر بسسام براخۆیی میر میرانی توران، میر مهرداد ئەدرەگانی میر میرانی مەکران، میر سیاوش زەنگەنە، میر سەمبان ماملی میر میهار کرمانی ئەندامی دیوانی ملوک بوون.

پاشابوون و گۆشەنشینیی ئورودی دووەم:

دوای مهردادی سێیەم، ئورودی دووەمی برای هاتە سەر تەختی ئەشکانی و شەڕێکی نەفەگیر لەگەڵ ڕۆمەکان ڕووی دا. ئەمەش لەبەرئەوەی سەڵتەنەتی ئەشکانی لەگەڵ ڕۆمەکان لە شەڕدا بوو.

دوای ئەوەی شەڕ لە نێوان ئەم دوو وڵاتە ڕووی دا، ئەشکانییەکان لە شەڕی حوران ڕۆمەکانیان شکست دا و ئورود هەڵسا بە ناردنی فیروزی کوڕی بە لەشکرێکی گەورەوە بۆ داگیرکردنی سووریا. لە سووریا ئەشکانییەکان پاشەکشەیان کرد و فیروزیش لە شەڕدا کوژرا. ئورود بەم زیانە خەفەتبار بوو و ژیانی گۆشەنشینیی هەڵبژارد و دەسەڵاتی تەختی ئەشکانیی دایە دەست فەرهادی کوڕی دووەمی.

گوندوس فاسان میری ساکا:

کاتێک ئیزسەسی دووەم کۆچی دوایی کرد، کوڕەکەی ، گوندوس فاسان هاتە سەر تەختی میرنشینیی زابلستان و براکەی، "گودا"ی لە ئاستی وەزارەت دامەزراند. پاش ئەوە، گوندوس خۆی دەسەڵاتداریی هەرێمەکانی هندی گرتە دەست و میرنشینیی زابلستان و ئەراسوشیایشی دا بە گودای برای.

گوندوس فاسان لە هیند زۆر ناوبانگی دەرکرد و لەوێ بەناوبانگترین شای

بنەماڵەی ساکایەکان بوو. چوارچێوەی دەسەڵاتداریی وڵاتی ساکایەکانی لە هیند بەرفراوان کرد و بە دادپەروەری فەرمانڕەوایی کرد.

پاشابوونی فەرهادی چوارەم:

فەرهادی چوارەم دوای گۆشەنشینیی باوکی هاتە سەر تەختی ئەشکانی کە مرۆڤێکی ستەمکار و زۆردار بوو. ئەو چەوساندنەوە و ستەمی کردبووە شێوەی خۆی و هەندێک لە ئەندامانی دەوڵەت نیشتمانیان جێ هێشت.

فەرهادی چوارەم شەڕ و پێکدادانی لەگەڵ سەڵتەنەتی ڕۆم دەست پێ کرد. لە ئەنجامدا، کەسێکی بنەماڵەی ئەشکانی بە ناوی تیرداد ئاڵای شۆڕش و یاخیگەری بەرز کردەوە و توانی فەرهادی چوارەم لەسەر تەخت لابدات. فەرهاد پاشان چووە داڵدەی ساکایەکان.

پاشابوونی تیردادی دووەم:

تیردادی دووەم هاتە سەر تەخت و چەند ماوەیەک فەرمانڕەوایی کرد. لە دواییدا، فەرهاد بە یارمەتیی ساکایەکان هێرشی هێنایە سەر پارس. تیرداد توانای بەرگریکردنی لە خۆی ڕانەبینی و هەڵات. لەگەڵ خۆی دا کوڕە بچووکەکەی کە ناوی فەرهاد بوو برد و چووە داڵدەی قەیسەری ڕۆم.

کوژرانی فەرهادی چوارەم:

فەرهادی چوارەم بۆ جارێکی تر هاتەوە سەر تەخت و چەند ماوەیەک فەرمانڕەوایی کرد. لە ئەنجام، فەرهادک کوڕی فەرهاد بە هاندانی دایکی زەهری دەرخواردی باوکی دا. بەم شێوەیە باوکی کوشت و خۆی هاتە سەر تەخت.

میر گودا میری ساکایەکان:

کاتێک گوندوس فاسان دەسەڵاتی پاشایەتیی هندی گرتە دەست، پاشایەتیی میرنشینەکانی کندارا و زابلستانی دایە دەست "گودا"ی برای. گوداش کوڕی خۆی "ئەبدین گاسەس"ی لەسەر دەسەڵاتداری میرنشینیی زابلستان دانا و خۆیشی هەندێک ولایەتی کرمانی لە پاشای ئەشکانییەکان سەند و هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی و میرنشینییەکەی بەرین کردەوە.

لەدایکبوونی پەیامبەر عیسا سلاوی لێ بێ:

لە نێوان سالانی چوار و شەشی پێش زاینی مەسیح، حەزرەتی عیسا سلاوی لێ بێ لە یەکێک لە گوندەکانی بەیتولموقەدەس بە ناوی بەیت لەحم لەدایک بوو. لەو سەردەمەدا دوو سەڵتەنەتی بەهێز و پڕ شکۆ لە دنیا بوونی هەبوو: سەڵتەنەتی پارس و سەڵتەنەتی ڕۆم.

ئەگستاس پاشای ڕۆم و تیردادیش پاشای پارس بوو. پاشای پارس بۆ پشتڕاستکردنی پێشبینیی ئەستێرەناسەکان کە مەسیح لەدایک بووە کۆمەڵێکی لە هاوەڵەکانی خۆی نارده بەیتولموقەدەس بۆ ئەوەی کە ئەگەر مژدەکە ڕاست بوو بچن بۆ شوێنی لەدایکبوونی حەزرەتی مەسیح و بەخێرهاتنی بکەن. ئەم دەستەیە پاش پشتڕاستکردنی لەدایکبوونی مەسیح گەڕانەوە پارس و هەواڵەکەیان بە تیردادی پاشای ئەشکانی گەیاند و گشت بارودۆخەکەیان بۆ باس کرد.

میر فیروز میری ساکایەکان و ڕووخانی میرنشینەکەیان:

دوای ئەوەی گوندوس فاسان لە هیند کۆچی دوایی کرد، کوڕەکەی، فیرۆز هاتە سەر تەختی ولاتی هیند و میرنشینیی ئەراسوشیا و سناربار کوڕی گوداش کە کوڕە مامی بوو کردە دەسەلاتداری میرنشینیی زابلستان.

لە سەردەمی فەرمانڕەواییی میر فیروز هێز و دەسەلاتی ساکایەکان لە زابلستان و باختەر و هیند وردە وردە بەرەو ڕووخان دەچوو. جێنشینەکانی میرەکانی ساکایەکان بێهێز بوون و هۆزە کۆشانییەکان بەسەریاندا زاڵ بوون و بالادەستییان پەیدا کرد.

میر میران میر خەفی براخۆیی:

وێڕای کۆچی دواییی میر بسسام، کوڕەکەی، میر خەفی هاتە سەر تەختی پاشایەتیی توران و لە سەردەمی میرنشینیی ئەودا فەرهادی پێنجەم پاشای سەڵتەنەتی ئەشکانی بوو. هەر لەم سەردەمەدا، دەسەلات و بالادەستیی میرانی ساکایەکان لە باختەر و زابلستان و ئەراسوشیا ڕووی لە لاوازی کرد. لە دەوروبەری سەد ساڵ دوای هێمنی و ئاسایشی دوای هێرشی ساکایەکان، لە هەرێمی باختەر یەکێک لە سەرۆکەکانی هۆزەکانی کۆشانی کە ئەویش لە نەتەوەی

تیرەکانی بوچینە بەسەر ساکایەکان زاڵ بوو و باڵادەستیی پەیدا کرد و بناخەی دەوڵەتی دامەزراند کە بە ناوی کۆشانی ناوبانگی دەرکرد.

میر خەفی ٣٤ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و ئەم سەرۆکانەی پێنج تیرەی کوردی بەلوچ: میر وندان زەنگەنە، میر کیکان ئەدرەگانی، میر بۆتان ماملی و میر مەنگوڕ کرمانی هاوچەرخی بوونە.

به خۆییکردنی تیرەکانی سەلگور و ساگدی:

میر خەفی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا دابی بەخۆییکردنی تیرەکانی سەلگور و ساگدی بەڕێوە برد کە لەگەڵ میر فەرهاد زەنگەنە لە زابلستانەوە هاتبوونە توران و لەوێ نیشتەجێ بووبوون. ئەم دابە بۆیە ئەنجام درا چونکە ئەم دوو تیرەیە لە نەژادی کوردە بەلوچەکان نەبوون و پێویست بوو بەخۆیی بکرێن بۆ ئەوەی هیچ جیاوازییەک لە نێوان ئەوان و کوردە بەلوچەکان نەمێنێ و دوای بە ئەنجام گەیاندنی نەریتەکە بە تیرەکانی کورد بژمێردرێن.

کوردەکان نەریتێکیان هەبووە کە لە ڕێگەیەوە تیرە دەرەکییەکانیان بە کۆمەڵگەی خۆیانەوە پێوەست دەکرد و بەم نەریتەیان دەگوت "هێسک شکاندن". ئەم نەریتە بەم شێوە بەڕێوە چووە کە میر میرانی تیرەکان کە سەرۆکی دیوانی ملوک بووە، سەرۆکی تیرەکانی تری بانگ دەکرد و لە کۆڕی دیوانی ملوکدا باسی بەخۆییکردنی ئەو تیرە دەرەکییەی دەکردەوە و وتووێژی لەسەر دەکرا. دوای ئەوە، سەرۆکی دیوانی ملوک مێزەر یان دەستاری بە براژماردنی لەسەر میری ئەو تیرەیە دەبەست و سەرۆکی تیرەکەش دوای دەستاربەندی پەیمانی وەفاداریی لە تەک ئەو نەتەوەیە دەبەست کە تێیدا تێکەڵاو بووبوون. دوای ئەوە لە خوانی سەرۆکی دیوانی ملوکدا نانیان دەخوارد و پیرۆزباییان لە سەرۆکەکە دەکرد و ئەوێیان بەجێ دەهێشت. بەم شێوەیە، دوای بەجێگەیاندنی ئەم نەریتە تیرە دەرەکییەکە بە یەکێک لە تیرەکانی کوردە بەلوچەکان دەژمێردرا.

پاشابوون و کوژرانی فەرهادی پێنجەم:

فەرهادی پێنجەم ژاری دەرخواردی باوکی دا و کوشتی. بە هۆی ئەم کردەوەیە ئەندامان و دەسەڵاتدارانی سەڵتەنەت لێی بێزار و تووڕە بوون. قەیسەری ڕۆمیش

ئەوی بە داگیرکەر دەزانی و بایەخی بە خواست و داواکانی نەدەدا . لەگەڵ ئەوەشدا، فەرهاد پیاوێکی زۆر ترسنۆک بوو و فەرمانڕەواییی لێ نەدەوەشایەوە. لە ئەنجامدا، گەورە و دەسەڵاتدارانی سەڵتەنەت لەسەر تەخت لایان دا و کوشتیان.

هۆزە کۆشانییەکان:

کۆشانییەکان هۆزێک بوون کە لەگەڵ ساکایەکان لە یەک ڕیشە و نەژاد بوونە و خەڵکی چین بە یوچین ناساندوویانن. ئەوانە لە دەوروبەری ١٦٠ ساڵ پێش زاین نشینگەی کۆنی خۆیان کە لە ڕۆهەڵاتی چین بووە بەجێ هێشتووە هاتوونەتە دۆڵی سەر دەریای باکوری ئامو. ساکایەکان لێرەدا نیشتەجێ بوویوون لەبەرئەوەی توانای بەرەنگار بوونەوەی هێرشەکانی ئەوانیان نەبوو ڕایان کرد و ڕوویان لە خۆرهەڵات لە باختەر و لە باشوور لە زنجیرە چیای هندوکوش کرد.

لەو کاتەدا، ئیمپراتۆری چین بە هۆی ئازاردانەکانی هۆزەکانی هوانگ نوان تەنگی پێ هەڵچنرابوو و باڵوێزی نارده لای یوچینەکان و بۆ سەرکوتکردنی هوانگ نوان داوای هاوکاری و هاوەلێی لێ کردن. بەڵام یوچینەکان بە پیریەوە نەچوون و بەمە ئیمپراتووری چین تووڕە بوو و هێرشی بردە سەریان. یوچینەکان پاشەکشەیان کرد و لە سەرووی دەریای ئامۆوە سەرەوخوار بوونەوە و هاتنە خوارووی ولایەتی باختەر کە نشینگەی تخارییەکان بوو و بە یارمەتیی ئەوان میرنشینی باختەریان هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.

هۆزی کوشی یەکێک لە پێنج هۆزەکانی کوشانگ بووە. بەپێی نووسینی مێژوونووسەکانی چین میری ئەمانە کوجولە کەدفیزس چوار تیرەی تری کوشانگی لەگەڵ خۆی یەکگرتوو کرد و میرنشینیی خۆی لە باختەر دامەزراند و خۆی بە شای کوشانگ ناساند. لەبەر ئەم هۆیە، لە باسە مێژوویییەکاندا وشەی کۆشانی جێگەی یوچینی گرت.

دوای ئەوە، کوجولە کەدفیزس پارس و کەندارا و زابلستانی داگیر کرد و سەڵتەنەتەکەی بەرین کردەوە و کوردەکانی توران و مەکرانیشی گوێڕایەڵیی خۆی کرد.

پاشابوون و کوژرانی ئورودی سێیەم:

دوای کوژرانی فەرهادی پێنجەم، ئەندامانی دەوڵەتی پارس کەسێکیان لە بنەماڵەی ئەشکانی کە ناوی ئورود بوو و لە ترسی فەرهاد لە گۆشەیەک لە بزریدا ژیانی بەسەر دەبرد هێنایە سەر تەختی فەرمانڕەوایی. بەڵام ئەویش ستەم و توندوتیژیی کردە شێوەی خۆی. دوای سێ ساڵ فەرمانڕەوایی، دەسەڵاتدار و گەورانی دەوڵەت بە فێڵ لە تەخت دەریان کرد و کوشتیان و خۆیان لە ستەمکاریی ئەو ڕزگار کرد.

پاشابوونی ئەنوشی یەکەم و دەرکرانی لە تەخت:

دوای کوژرانی ئورودی سێیەم، لەنێو بنەماڵەی ئەشکانیدا کەسێکی وا نەمابوو کە شایستەی پلە و پایەی پاشایەتی بێت. لەبەر ئەوە، دەسەڵاتدارانی دەوڵەت باڵوێزیان نارده لای پاشای ڕۆم و داوایان لێ کرد کە ئەنوش کوڕی فەرهادی چوارەم کە لە داڵدەی ئەودا بوو بنێرێتەوە پارس بۆ ئەوەی لەسەر تەختی ئەشکانیی دابنێن.

ئەنوش لە ڕۆم هاتەوە و هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی. پاش ماوەیەک، دەسەڵاتدارانی سەڵتەنەت لەویش دڵگران و ناشاد بوون. لەبەرئەوەی، ئەو بەپێی داوونەریتی ڕۆمی هەڵسوکەوتی دەکرد و ڕقی لە نەریتی پارس بوو. هەر ئەم هۆکارەش وای کرد شازادەیەکی بنەماڵەی ئەشکانی بە ناوی ئەردەوان لێی یاخی بێت. دەسەڵاتدارانی سەڵتەنەت پشتگیرییان لێ کرد و توانی ئەنوش شکست بدات و لە وڵاتی پارس دەری بکات و دەسەڵاتداریی وڵاتی گرتە دەست.

پاشابوون و کۆچی دوایی ئەردەوانی سێیەم:

ئەردەوانی سێیەم کە هاتە سەر تەخت جارێکی تر سوپای ئامادە کرد و هێرشی بردە سەر ئەنوش و شکستی دا. ئەنوش جگە لە هەڵاتن هیچ چارەیەکی تری بۆ نەما و چووە شاری سلوسیە. ئەردەوان بە شوێنی کەوت و زۆر لایەنگری ئەوی لەناو برد. پاشان ئەنوش سلوسیەشی جێ هێشت و ڕای کردە ئەرمەنستان و بوو بە پاشای ئەوێ. بەڵام بە هۆی زۆر بۆ هێنانی ئەردەوان پاشای ئەشکانی ناچار دەستی لە فەرمانڕەواییی ئەوێش هەڵگرت و خۆی دایە دەست فەرمانڕەوای ڕۆمیی

شام. له شامیش ویستی هەڵبێت بەڵام ڕۆمەکان دەستگیریان کرد و کوشتیان.

ئەردەوان پاشای ئەشکانی خۆی سەرقاڵی پتەوکردنی پێگەی دەسەڵاتی خۆی کرد و لەگەڵ ڕۆمەکان ئاشت بووەوە و دوای ٢٦ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد.

کوجولە کلە کەدفیزس میری کۆشانی:

کوجولە کلە کەدفیزس میری هۆزی کۆشانی بوو و پیاوێکی زانا و ورەبەرز و بە جەرگ بوو. توانی چوار تیرەی کۆشانگ لەگەڵ خۆی یەک بخات و میرنشینی لە باختەر دابمەزرێنێ. لە ماوەیەکی درێژدا بە هەوڵ و تێکۆشان سەڵتەنەتی خۆی بەرفراوان کرد و ولایەتەکانی دەوروبەری سەڵتەنەتی پارسی بە دەسەڵاتداریی خۆیەوە لکاند و پێگەی خۆی لە تەواوی ئەو شوێنانە بەهێز کرد کە برێتی بوون لە ولایەتەکانی کەندارا و کابلستان و زابلستان و خوراسانی ڕۆهەڵات.

کوجولە دوای ٣٨ ساڵ دەسەڵاتداری کۆچی دوایی کرد. ناوی خۆی کوجولە بوو کە لە دواییدا نازناوی کلە کەدفیزسی پێ چەسپاوە کە بە مانای دیندار و کوڕە شای ئاسمان دێت.

میر میران میر شاوش براخۆیی:

دوای کۆچی دوایی میر خەفی، کوڕەکەی، میر شاوش هاتە سەر تەختی میرنشینی توران. لە سەردەمی دەسەڵاتداریی ئەودا، میری مەزنی کۆشانییەکان کوجولە کلە کەدفیزس پاش دامەزراندنی دەسەڵاتدارییی خۆی لە باختەر، ولایەتەکانی پارس کە برێتی بوون لە کەندارا، زابلستان، کابلستان و خۆراسانی ڕۆهەڵاتی داگیر کرد و بناخەی سەڵتەنەتی کۆشانیی دامەزراند.

میرەکانی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران خۆیان بە دەستەوە نەدا و ملکەچی میری کۆشانی نەبوون. جگە لەمە، هاوئاهەنگیی تیرەکانی کوردی بەلوچ ئەوەندە بەهێز و پتەو بوو کە میری کۆشانی نەیدەخواست دوژمنایەتییان لەگەڵ دروست بکات. هەروەکو گوتوویانە: "ڕزگاری لە ئاشتی و هێمنیدایە". لەبەر ئەوە، میری کۆشانی ڕێگەی ئاشتیی لەگەڵ کوردە بەلوچەکان گرتە بەر.

میری کۆشانی پیاوێکی هۆشمەند بوو و دەیزانی لەگەڵ کات و سەردەم ڕەفتار بکات و سوود و قازانجی لە سەردەمی ئاشتی بەدەست دەهێنا و هەموو کات پەیماننامەی وای دەبەست کە لە ڕێگەیەوە ئیمزاکارانیان لە چوارچێوەی دەسەڵاتداریی خۆیاندا سەربەست دەکرد. کوجولە کلە کەدفیزس لەسەر بنەمای ئەم نەریتە پەیماننامەی لەگەڵ کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران بەست و دانی بە فەرمانڕەواییەکەیانی لە توران و مەکران نا. بەم شێوەیە، بەڵێن و پەیمانی لەگەڵ بەستن و کردیانی بە هاوپەیمانی وڵاتەکەی.

میر شاوش پاش ٢٥ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد و ئەم سەرۆکانەی کوردە بەلوچەکان میر کمبیج میر میرانی مەکران، میر شینو ماملی، میر خەفی کرمانی و میر نوزەر زەنگەنە هاوچەرخی بوون.

پاشابوونی گودرزی دووەم و دەرکرانی لە تەخت:

دوای ئەردەوانی سێیەم، کەسێک لە بنەماڵەی ئەشکانییەکان بە ناوی گودرز هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی سەڵتەنەتی ئەشکانی. گودرز دوو برای بە ناوی ئەردەوان و واردان هەبوو و لێیان بە گومان بوو و باوەڕی لەسەر نەبوون. هەر بۆیە یەکەمیانی بە ژن و منداڵەوە کوشت و دووەمیشیان ڕای کرد.

هێشتان ماوەیەک بەسەر دەسەڵاتداریی گودرز تێ نەپەڕیبوو کە گەوران و کاربەدەستانی وڵات وردانیان بانگهێشتن کرد بۆ ئەوەی بۆ بەدەستهێنانی پاشایەتی شۆڕش بکات. واردان دوای بڕینی دوو ڕۆژەڕێ خۆی گەیاندە پارس کە بتوانێ لە نەکاو بەسەر گودرزدا دابدات. گودرز ناچار لە پارس هەڵات و چووە لای هۆزەکانی داها و سەرقاڵی نەخشەکێشان و هاندانی بزووتنەوە دژی واردانی برای بوو. گودرز بۆ ئەم مەبەستە یارمەتیی لە هۆزەکانی داها وەرگرت و بۆ بەدەستهێنانەوەی تەخت و تاج کەوتە ڕێ.

واردان بە خۆی و هێزەوە ڕووی لە دەشتی باکتریا کرد. لە ناکاو گودرز هەواڵی پێ گەیشت کە گەوران و دەسەڵاتداران هاودەست بوونە و ڕێک کەوتوون کە تەخت و تاج لە هەردوو برا بسێنن. ئەم مەترسییە هاوبەشە هەردوو براکەی بە ناچاری لێک نزیک کردەوە لەگەڵ یەک ڕێک کەوتن کە تاجی سەڵتەنەتی پارس لای واردان بێت و گودرزیش بە دەسەڵاتداریی هەرکانیە ڕەزامەند بێت.

### پاشابوون و کوژرانی واردانی یەکەم:

کاتێک واردانی یەکەم هاتە سەر تەخت، شاری سلوسیە هێشتان لەباری شۆڕش و یاخیگەریدا بوون. واردان بە یارمەتی و ڕێنوێنیی چینی گەورە پیاوانی ئەو شارە کە لایەنگری خۆی بوون هێرشی بردە سەر شارەکە و ئەوانیش ناچار خۆیان دایە دەستەوە و ئەو شۆڕشەی کە لە حەوت ساڵەوە بەردەوام بوو کۆتاییی پێ هات.

پاش ئەم سەرکەوتنە، واردان سەرکەوتنی تریشی بەدەست هێنا و سەڵتەنەتەکەی زۆر بەرین کردەوە. پاش ماوەیەکی درێژ، دووبارە لە نێوان ئەو دوو برایە واردان و گودرز شەڕ و پێکدادان دەستی پێ کردە و تا دوو ساڵ درێژەی کێشا و لە ئەنجام بە مەرگی واردان کۆتاییی پێ هات. ئەمەش بەو چەشنە کە گەوران و دەسەڵاتداران هاودەست بوون و لە ناکاو واردانیان بە کوشت دا.

### پاشابوونی دووەم جاری گودرز و کۆچی دوایی:

دوای کوژرانی واردانی یەکەم، لە نێوان گەورانی پارس لەسەر میراتگری تەخت و تاجی پاشاییی ئەشکانی ناکۆکی و گیروگرفت ڕووی دا. زۆریان لایەنگری گودرز بوون و کۆمەڵێکیش مەهرداد کوڕی ئەنوش و کوڕەزای نەوەی فەرهادی چوارەمیان بۆ پاشایەتی دیاری کرد. ئەم شازادەیە لە ڕۆم گەورە بووبوو و خەڵکی پارسیش بە گشتی ڕق و نەفرەتیان لەو شازادانە بوو کە لە ڕۆم گەورە بووبوون. ڕەنگە لەبەر ئەم هۆیەش و بە تایبەت کە گودرزیش لەنێو وڵات ئامادە بوو لە ئەنجام هەموو لەسەر سەڵتەنەتی گودرز ڕێک کەوتن و گودرزیان هێنایە سەر تەختی پاشایی.

ماوەیەک بەسەر پاشایەتیی گودرز تێ نەپەڕیبوو کە لە بەرەنجامی بێبەزەیی و دڵڕەقی و کردەوەی ناشایستەی ئەو لە هەموو لایەکەوە هاواری سکاڵا بەرز بووەوە و لە ئەنجام بەرهەڵستکاران سکاڵاکەیان بردە لای قەیسەری ڕۆم و داوایان لێ کرد شازادە مەهرداد بنێرێتەوە پارس. قەیسەری ڕۆم فەرمانی دا ئەو شازادەیەی کە داواکاری تەخت و تاجە تا لێواری فورات بەڕێ بکەن.

مەهرداد هاتە پارس و لە شەڕ دژی گودرز ئاکامێکی یەکلاکەرەوەی بەدەست

نەهێنا. کاتێک تەماشای کرد سوپاکەی بە تەواوی شپرزە و لێک هەڵوەشاوەتەوە، چووە داڵدەی سەردارێکی پلە خوار کە باوکی دای مەزراندبوو و ناوی پاران سەس بوو. بەڵام ئەو نامەردە گرتی و بە زنجیرکراوی ناردیە لای گودرز. گودرزیش ئەگەرچی لە گیانی خۆش بوو بەڵام فەرمانی دا هەردوو گوێی ببڕن بۆ ئەوەی جارێکی تر بیر لە بەدەستهێنانی سەڵتەنەت نەکاتەوە. پاش ماوەیەک گودرز کۆچی دوایی کرد.

پاشابوون و کۆچی دوایی ئەنوشی دووەم:

دوای کۆچی دوایی گودرزی دووەم، ئەنوشی دووەم کە پاشای ماد بوو هاتە سەر تەختی سەڵتەنەتی ئەشکانی و پاش نۆ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا هیچ ڕووداێکی گرینگ ڕووی نەدا.

پاشابوون و کۆچی دوایی بلاشی یەکەم:

پاش ئەوەی ئەنوشی دووەم کۆچی دوایی کرد، بلاشی یەکەم هاتە سەر تەخت. بلاش دوو برای هەبوو: فیروز و تیرداد. بە تەمەن لە هەردووکیان گەورەتر بوو و لەگەڵ ئەوەشدا ئەوانیش سەریان بۆ پاشایەتیی ئەو دانەواند. بلاش سەڵتەنەتی مادی دایە شازادە فیرۆزی برای. بۆیە پێویست بوو بۆ تیردادی برایشی شوێنێکی شیاو دابین بکات.

پارتەکان بەردەوام خۆیان بە خاوەنی ئەرمەنستان دەزانی و لەو کاتەش داگیرکردنی ئەو وڵاتە بۆ بلاش سەخت نەبوو. بۆیە بلاش دەرفەتەکەی بە لەبار زانی بۆ بەهێزکردنی دەسەڵاتدارییەتەکەی و بەدەستهێنانی دەسەڵاتدارییەتێک بۆ برا بچووکەکەی ئەو وڵاتە بهێنێتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ئەو لەو کەین و بەینەدا کە هۆزە دەشتەکییەکانی باکوری بە ناوی ئالانی هێرشیان هێنایە سەر خاکی وڵاتی پارس و بەرەو مادیا سەراوژێر بوونەوە. فیروز فەرمانڕەوای ماد لە بەرامبەر هێرشەکانی ئەوان توانای بەرگریی نەبوو و ڕووەو دواوە پاشەکشەی کرد و لە شوێنێکی دووردا دامەزرا.

پاشان ئەم هۆزانە بەرەو ڕۆئاوا هێرشیان برد و ڕووبەڕووی لەشکری تیردادی پاشای ئەرمەنستان بوونەوە و لە ئەنجام ئەویشیان بە سەختی شکست دا و بە

دەسکەوتێکی زۆر گرانبەهاوە بەرەو ڕۆژهەڵات گەڕانەوە.

بلاشی یەکەم دوای ٢٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد و لە سەردەمی ئەو دیاردەی ڕووخان لە سەڵتەنەتی ئەشکانییەکاندا خۆی دەنواند.

**میر میران میر مرادان براخۆیی:**

دوای کۆچی دوایی میر شاوش، کوڕەکەی، میر مرادان هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە سەردەمی ئەودا، فەرمانڕەوای مەزنی کۆشانییەکان کوجولە کلە کەدفیزس کۆچی دوایی کرد کوڕەکەی، ویما کلە کەدفیزس بوو بە جێنشینی. کاتێک ویما کلە کەدفیزس هێرشی بردە سەر ئیمپراتۆری چین، میری سندان ئەو هەلەی قۆستەوە و هێرشی بردە سەر توران.

**هێرشی میری سندان بۆ سەر توران:**

میر مانیا میری مەزنی سندان بوو و لەگەڵ دوو سەرلەشکری خۆی میر گنگو و میر بندان و سەربازانی سندان لە زنجیرە چیای "کاتیر"ەوە هێرشیان هێنایە سەر خاکی توران. کاتێک ئەم هەواڵە بە سەرۆکەکانی کوردەکان گەیشت، بۆ بەرگری کردن لە هاتنە پێشیان بە خێرایی لە گەردنەکانی زنجیرە چیای کاتیرەوە سەرەوخوار بوونەوە و شارەکانی سندانیان تالان کرد. میری سندان کاتێک ئەم بارودۆخەی بەدی کرد تێ گەیشت کە لە دوو قۆڵەوە شەڕکردن بۆ سەربازەکانی نەشیاوە. ئەمەش بەو مانایەی لەلایەکەوە هێرشەکەی بۆ سەر توران بەردەوام بکات و لەلاکیشەوە بەرگری لە چوونە پێشی کوردەکان بۆ ناو دەشت و شارەکانی سنادان بکات. بۆیە سەرلەشکرانی سندان ناچار بوون لە خاکی توران پاشەکشە بکەن و لە وڵاتی خۆیان بەرگری بکەن. واتە کوردە بەلوچەکان کە هەڵڕژابوونە ناو دەشت و شارەکانی سندان دەریان بکەن. کوردە بەلوچەکان سەرکەوتووانە بە دەسکەوت و سامانێکی زۆرەوە لە خاکی سندان دەرچوون و گەڕانەوە توران.

میر مرادان پاش ١٧ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد و ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان: میر نوزەر زەنگەنە، میر شیران ئەدرەگانی میر میرانی مەکران، میر پندک ماملی و میر شولان کرمانی هاوچەرخی بوون.

**ویمان کله کەدفیزس میری کۆشانی:**

دوای کۆچی دوایی میر کوجوله کله کەدفیزس میری مەزنی کۆشانی، ویمان کله کەدفیزس هاتە سەر تەختی باوکی و نزیکەی نیو سەدە واتە پەنجا ساڵێک فەرمانڕەوایی کرد و لە ماوەی دەسەڵاتداریەتیدا کەوشەنی وڵاتەکەی ئەوەندە بەرین کردووەتەوە کە سنووری ڕۆهەڵاتی وڵاتەکەی دەگەیشتە نزیکەی ڕووباری کنگ.

ویمان لە ڕێگەی باڵوێزەوە داوای لە پاشای چین کرد کە بیکات بە زاوای خۆی و کچەکەی بە شوو بداتێ. بەڵام ئیمپراتۆری چین داواکارییەکەی پەسند نەکرد. ویمان کله کەدفیزس توورە بوو و لەشکرێکی گەورەی کە لە ٧٠ هەزار سوار پێک هاتبوو بە سەرۆکایەتیی سوپاسالار "سیئان" بۆ داگیرکردنی ڕۆهەڵاتی چین نارد. سیئان لە ڕێگەی پامیرەوە هێرشی بردە سەر ڕۆهەڵاتی چین و ڕووبەڕووی لەشکری چینی بووەوە. لە ئەنجام، سوپاسالاری لەشکری چین "پانچی" شکستی دان و سیئان سەرلەشکری ویمان کله کەدفیزس داوای ئاشتیی کرد لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە میری کۆشانی لە داهاتوو باج بداتە ئیمپراتۆری چین.

ویمان کله کەدفیزس بۆ پتەوکردنی وڵاتەکەی دۆستایەتیی لەگەڵ پاشاکانی ئەشکانی بەهێز کرد و لە تەمەنی ١٠٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

**میر میران میر شاهبورز براخۆیی:**

دوای کۆچی دوایی میر مرادان، میر شاهبورزی کوڕی هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە چاخی دەسەڵاتداریی ئەودا، ویمان کله کەدفیزس هێرشی بردە سەر سەڵتەنەتی چین و بە سەختی شکستی خوارد و پاشەکشەی کرد. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی وڵاتی کۆشانی لە ئاستی بەهێزی دەربچێت و دووچاری لاوازی بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ویمان کله کەدفیزس پاشایەکی بە تەگبیر بوو و بە بینینی ئەم بارودۆخە فەرمانی دا بۆ پتەوکردنی قشونی نەتەوەیی و میرنشینییە هاوپەیمانەکانی شێوازی سەربازی سەرلەنوێ ڕێک بخرێتەوە. لەم ڕووەوە کوردە بەلوچەکانیش گۆڕانکارییان بەسەر شێوەی ڕێکخستنی سەربازی خۆیاندا هێنا و سەرلەنوێ لەشکرێکی بەرجەستەیان بۆ پارێزگاریکردنی ولایەتەکانی توران و

مەكران ڕێک خست.

ئەم سوپایە برێتی بوو لە دوو جۆر سەرباز: سەربازانی چەكی سووک هەڵگر و سەربازانی چەكی گران هەڵگر. سەربازانی چەكی سووک هەڵگر تەنیا زرێ و خەفتانیان پۆشیوە و قەڵغان و كەمانێكیان پێ بووە و تیردانیان پڕ بووە لە تیر. سەربازانی چەكی گران هەڵگریش زرێ و خەفتانی ئاسنینیان لەبەر كردووە و ئەندامەكانی سوار و ئەسپەكەیان سەرتاپا بە پۆشاكی ئاسنین داپۆشیوە. چەكی شەڕیان نێزەیەكی درێژ بووە كە بۆ هێرشبردنە سەر ڕیزەكانی دوژمن بەكاریان هێناوە.

میر شاهبورز پاش ۳۰ ساڵ فەرمانڕەوایی، دنیای فانیی بەجێ هێشت. ئەم سەرۆكانەی تیرەكانی پێنجینەی كوردە بەلوچەكان: میر بیسوت زەنگەنە، میر شادان ئەدرەگانی میر میرانی مەكران، میر زونگان ماملی و میر جوگ كرمانی هاوچەرخی بوون.

پاشابوون و كۆچی دوایی فیروزی دووەم:

وێڕای كۆچی دوایی بلاشی یەكەم، فیروزی كوڕی هاتە سەر تەختی پاشایەتی و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەودا تیرەكانی ئالانی جارێكی تر شاڵاویان بۆ سەر پارس دەست پێ كرد. فیروز هەموو هۆشی خۆی بۆ بەرگری كردن لەوان تەرخان كرد و بۆ ماوەیەكی درێژ دژی تیرەكانی ئالانی لە سنوورەكانی ڕۆهەڵات سەرقاڵی شەڕ و پێكدادان بوو.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی فیروزی دووەم، شڵەژاوی و سستی لە سەڵتەنەتی ئەشكانیدا پەیدا بوو. شازادەكانی ئەشكانی تاكڕەوانە كاریان دەكرد و لە هەر ولایەتێک بوونایە سەربەستانە فەرمانڕەواییان دەكرد. فیروز ۲۹ ساڵ فەرمانڕەوایی كرد و كۆچی دوایی كرد.

پاشابوونی ئەردەوانی چوارەم و دەركرانی لە تەخت:

دوای فیروز، ئەردەوانی چوارەم هاتە سەر تەختی ئەشكانی. هێشتان ساڵێک لە فەرمانڕەواییەكەی تێ نەپەڕیبوو كە دەسەلاتدارانی دەوڵەت لە تەخت دەریان كرد و لە شوێنی ئەو خەسرۆیان دانا.

## پاشابوون و کۆچی دوایی خەسرۆ:

دوای ئەردەوانی چوارەم، خەسرۆ هاتە سەر تەختی ئەشکانی. خەسرۆ زاوای فیروز بوو و هەرکە بوو بە پاشا، کەسێک بە ناوی بلاش لەسەر سەڵتەنەت کەوتە دژایەتی کردنی خەسرۆ و لەمە بەدوا شەڕ و پێکدادان دەستی پێ کرد. لە کۆتایی، خەسرۆ ئاگری شۆڕشەکەی بلاشی دامرکاند. دوای ئەو، لە نێوان سەڵتەنەتی پارس و ڕۆمەکان لەسەر دەسەڵاتداریەتی ولایەتەکانی سەرسنوور شەڕ بەرپا بوو. ڕۆمەکان بەینەلنەهرەین و بابلیان داگیر کرد. پاشان قەیسەری ڕۆم هاتە شاری تسیفۆن و خەسرۆ لەوێ هەڵات، بەڵام کچەکەی بە تەختی زێرینی شاهانە وەکو دەسکەوت کەوتە چنگی قەیسەر. جگە لەمە، قەیسەر باجێکی زۆری لە ناوچە داگیرکراوەکان بەدەست هێنا. خەسرۆش بەبێدەنگی و پشوودرێژی پێشکەوتنەکانی ڕۆمەکانی تەماشا دەکرد.

کاتێک فەرمانڕەوا ڕۆمییەکان بەرەو نیشتمانی خۆیان گەڕانەوە، خەسرۆ دەستی بە کاری دژایەتی و بەرهەڵستکاری کرد و دانیشتوانی هەرێمە داگیرکراوەکانی بۆ بەرپاکردنی شۆڕش هان دا. بەم شێوەیە، خەڵک لە هەموو شوێنێک شۆڕشیان بەرپا کرد و کاربەدەستە ڕۆمییەکانیان لە ولایەتەکانی خۆیان دەرکرد. قەیسەری ڕۆم کە چاوی بەم بارودۆخە کەوت، پەیمانی ئاشتیی لەگەڵ پاشای ئەشکانی بەست. خەسرۆ پاش ٢٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد.

## میر میران میر سەرگیژ براخۆیی:

پاش کۆچی دوایی میر شاهبورز، میر سەرگیژ کوڕی هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە سەردەمی سەرگیژدا، سورنسان میری سوپای خەسرۆ پاشای ئەشکانی دەیخواست ولایەتەکانی مەکران و توران بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی ولاتی ئەشکانی. بۆ ئەم مەبەستە، بە لەشکرێکی گەورەوە هێرشی بردە سەر "قناز بوران" پایەتەختی مەکران. کوردە بەلوچەکان بە سەرۆکایەتیی میرەکانیان میر سەرگیژ میر میرانی توران، میر مهران زەنگەنە، میر شاوش ئەدرەکانی میر میرانی مەکران، میر بالگت ماملی و میر بیفار کرمانی بۆ جڵەو گرتن لە دوژمن هاتنە سەر ڕێگەیان و لە دۆڵی پریامان لەگەڵیان کەوتنە شەڕێکی سەختەوە. دوای

شـەڕ و پێکدادان، سـورنسـان سـەرلەشکری سـوپای ئەشکانی زامـدار بوو و پاشەکشەی کرد و گەڕایەوە نیشتمانەکەی و نەیتوانی ئەم دوو ولایەتە داگیر بکات.

لەم شەڕەدا، میر مهران میری تیرەی زەنگەنە و میر بیفار میری تیرەی کرمانی کوژران. میر سەرگیژ پاش ۲۰ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان: میر مهران زەنگەنە، میر شاوش ئەدرەگانی میر میرانی مەکران، میر بالگت ماملی و میر بیفار کرمانی هاوچەرخی بوون.

کەنشکین میری کۆشانی:

ویمان کلە کەدفیزس بە وجاخ کوێری کۆچی دوایی کرد، لەبەر ئەوە کەنشکین کە لە بنەماڵەی ئەشکانی و خزمی ویمان کلە کەدفیزس بوو، تەختی بە میرات وەرگرت. ڕاوییەکان دەگێڕنەوە کە ئەو نەوەی مامی میری مەزن کوجولە کلە کەدفیزس بووە.

کەنشکین بەناوبانگترین پاشای زنجیرەی پاشاکانی بنەماڵەی کۆشانییەکان بوو و سەڵتەنەتی کۆشانی زۆر بەرین کردەوە. لە ڕۆژهەلات سنووری سەڵتەنەتەکەی لکاوە بە شاری "بونارس"ی هیند و لە ڕۆژئاواش لکاوە بە سەڵتەنەتی پارس.

کەنشکین لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا ولایەتی سوغدستانی داگیر کردووە و تۆڵەی شکستی کوڕە مامەکەی، ویمان کلە کەدفیزسی لە ئیمپراتۆری چین سەندووەتەوە و بەپێی پەیمانی ئاشتی باجی لێ وەرگرتووە.

کەنشکین ئاینی "باوادایی"ی قەبووڵ کرد و بۆ بڵاوکردنەوە و پڕوپاگەندەی دینەکە دەستبەکار بوو. بە هۆی پڕوپاگەندەکردنی ئەم دینە، دانیشتوانی وڵاتەکانی دەوروبەر دینی باواداییان قەبووڵ کرد و ئەم ڕێبازەیان پەیڕەو کرد.

میر میران میر شاهمیر براخۆیی:

پاش میر سەرگیژ، شاهمیری کوڕی هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی میر شاهمیردا، میری کۆشانییەکان کەنشکین کە میرێکی وردەکار و ناودار بوو دنیای فانیی بەجێ هێشت. پاشان کوڕەکەی، میر

هوشان وشکا هاته سەر تەختی کۆشانییەکان.

میر شاهمیر پاش هاتنی بۆ سەر تەختی میرنشینیی توران، خۆی سەرقاڵی ڕاژەکاریی کوردە بەلوچەکان کرد. کارێکی گرینگ کە ئەنجامی داوە پەیماننامەی نێوان میری توران و میری سندان بوو لەبارەی مافی لەوەڕاندنی ئاژەڵ و مەڕوماڵاتی شوان و مێگەلدارەکانی کوردە بەلوچەکانەوە کە زستانان لە ناوچەکانی سندان قشلاخیان کردووە.

مێگەلدار و ڕەوەدارانی کوردە بەلوچەکان بۆ قشلاخ کردن زستانان سەرەوخوار دەبوونەوە و ئاژەڵ و مەڕوماڵاتەکانیان دەبردە دەشتەکانی سندان. بەڵام دەسەڵاتدارانی ئەو شوێنانە بە هەڵسوکەوتی ستەمکارانە لەگەڵیان دەجووڵانەوە. لە ئەنجامدا، لە نێوان کوردەکان و نەتەوەکانی سندان گیروگرفت و شەڕ و پێکدادان ڕووی دەدا. میر شاهمیر ئەم ناخۆشییەی کۆتا پێ هێنا. ئەویش بەم شێوەیە کە کەسێک لە کوردە براخۆییەکان بە ناوی میر جگاسوران لەگەڵ کۆمەڵێک لە خەڵکی تیرەکەیدا لە سەردەمی سەڵتەنەتی مادا لە ناوچەی "دوادان"ی وڵاتی سندان کە کەتووەتە داوێنی زنجیرە چیای پامیر و لە زستان کوردەکان دەیانکردە جێگە و داڵدەیان بۆ هەموو کات نیشتەجێ بووبوون. میر شاهمیر ئەم میرەی بانگ کردە دەرباری خۆی و وەکو باڵوێز ناردی بۆ لای کونیال کماچە میری وڵاتی سندان و داوای لێ کرد لەبارەی ئەو خەڵکە کوردانەی کە لە میرنشینیی سندانەوە قشلاخ دەکەن گفتوگۆ بکەن. میری سندان ئەم داواکارییەی پەسند کرد.

میری توران و میری سندان لەگەڵ سەردارانی خۆیان لە ناوچەی "جلارین کرخا"ی سنووری خاکی توران لە دانیشتنێکی میریدا لەسەر قشلاخکردنی کوردەکان پەیمانێکیان بەست و تێیدا مەرجەکانی لەوەڕاندیان دیاری کرد. دوای دانیشتنەکە، میری وڵاتی سندان بەرەو نیشتمانی خۆی گەڕایەوە.

میر شاهمیر پاش ٣٢ ساڵ فەرمانڕەوایی، کۆچی دوایی کرد و ئەم میرانەی کوردە بەلوچەکان: میر بدیس زەنگەنە، میر شاجیل ئەدرەگانی میر میرانی توران، میر بەهمەن ماملی و میر خوفو کرمانی هاوچەرخی بوون.

پاشابوون و کۆچی دوایی بلاشی دووەم:

پاش کۆچی دوایی خەسرۆ، بلاشی دووەم هاتە سەر تەختی ئەشکانی. ئەو خۆی بە میراتگری تەخت و خاوەن مافی پاشایەتی دەزانی. لەبەر ئەوە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خەسرۆدا، لەسەر فەرمانڕەوایی و سەرۆکایەتیی وڵات لەگەڵ خەسرۆ دەستی بە شەڕ کرد. لە ئاکام، لەم شەڕ و پێکدادانەی نێوان ئەم دوو شایە یان بە وشەیەکی تر ئەم دوو داواکارەی سەڵتەنەت، بلاش بەسەر بەرامبەرەکەیدا زاڵ بوو و دوای مردنیشی دەسەڵاتی تەختی گرتە دەست.

کاتێک بلاشی دووەم هاتە سەر تەخت، هۆزەکانی ئالانی بە هاندان و پاڵنانی فەرمانڕەواکانی دەوروبەر، لە باکوری ڕۆژهەڵاتەوە جووڵانەوە و هێرشیان هێنایە سەر هەرێمەکانی پارس و ولایەتەکانی سەڵتەنەتی ئەشکانییان تالان کرد. بلاش هێزی شەڕکردنی لە خۆیدا نەبینی و بە زەبری هەدیە و ڕەشوەی دارایی ڕێگەی لە پێشکەوتنەکانیان گرت و وڵاتەکەی خۆی کڕییەوە.

بلاشی دووەم لە تەمەنی ٧٠ ساڵی هاتبووە سەر تەخت و تەمەن وەفای لەگەڵ نەکرد و دوای ٣٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد.

پاشابوون و کۆچی دوایی مهردادی چوارەم:

دوای مردنی بلاشی دووەم، لە بنەماڵەی ئەشکانی کەسێک بە ناوی مهردادی چوارەم کە خزمایەتیی نزیکی لەگەڵ خەسرۆ دەسەڵاتی تەختی گرتە دەست و بوو بە پاشا. لە سەردەمی ئەم فەرمانڕەوایەی ئەشکانیدا، قەیسەری ڕۆم هادرون کۆچی دوایی کرد و لە جێگەی ئەو ئەنتاس پایوس بووە قەیسەری ڕۆم. پێوەندیی ئەو لەگەڵ پاشاکانی ئەشکانی دۆستانە بووە. لەبەر ئەوە، لە سەردەمی مهردادی چوارەم، لە نێوان ئەم دوو وڵاتە هیچ جۆرە ناکۆکی و دژایەتییەک ڕووی نەداوە و لەسەر سنوورەکانیان هیچ ڕووداوێک نەهاتووەتە پێش.

پاشابوون و کۆچی دوایی بلاشی سێیەم:

پاش کۆچی دوایی مهردادی چوارەم، بلاشی سێیەم کوڕی بلاشی دووەم بێ هیچ سەختی و کێشەیەک هاتە سەر تەخت. بلاشی سێیەم لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا لەگەڵ سەڵتەنەتی ڕۆم لەسەر دوو هۆ شەڕی بەرپا کرد.

یەکەم، پاشای ئەرمەنستان لە نەژادی ئەشکانی نەبوو و دووەمیش قەیسەری ڕۆم لە سەردەمی قەیسەر تروجان تەختی زێڕینی خەسرۆی بە دەسکەوتی شەڕ بردبوو و لە ناردنەوەی نکوولێی کرد.

شەڕ لە نێوان دەوڵەتی ئەشکانی و ڕۆمییەکان دەستی پێ کرد و ڕۆمەکان لە هەموو قوڵێکەوە ئەشکانییەکانیان شکست دا و پەرستگەکانی هەموو ولایەتەکانیان بە تالان برد. لەو کاتە نەخۆشییەکی درمیی وەرزی کە بە ڕواڵەت ئاوەڵە بووە لەناو هەردوو لەشکر بڵاو بوومتەوە و کوشتارێکی زۆری لێ بە ئاکام هات. بارودۆخی قشونی ڕۆم بە چەشنێ خراپ بوو کە ناچار بوون بەشێکی سەرەکیی دەسکەوتە زۆرەکانیان بەجێ بهێڵن و پاشەکشە بکەن. لە ماوەی ڕێگە سەربازێکی زۆر بە هۆی ئەم نەخۆشی و قاتوقڕییە مردن و ئەوانەیشی بە زیندوویی گەیشتنەوە نیشتمانەکەیان ئەم زیان و تووڕەیی خواییەیان لە سەرانسەری خاکی ولاتی ڕۆمدا بڵاو کردەوە و نەخۆشییەکە بە زوویی ناوچەکانی ڕۆئاوای گرتەوە.

بەم شێوەیە، شکستی ئەشکانییەکان بە سەرکەوتن کۆتایی پێ هات و بلاشی سێیەم پاش ٤٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد.

پاشابوون و کۆچی دوایی بلاشی چوارەم:

پاش کۆچی دوایی بلاشی سێیەم، بلاشی چوارەم هاتە سەر تەختی پارس. لە سەردەمی ئەودا سێ کەس خواستیاری پاشایەتی و داواکاری تەخت و تاجی قەیسەرەکانی ڕۆم بوون. لە کاتێکدا ڕۆمەکان سەرقاڵی لێکدان و شەڕی ناوەخۆ بوون کە لە ئەنجامیشدا بووە هۆی ئەوەی خەڵکی خۆماڵیی بەینەلنەهرەین ئاڵای یاخیگەری و شۆڕش بەرز بکەنەوە و هەموو سوپای ڕۆمەکانیان لەناو ببەن.

شەڕ و پێکدادانی چەندین ساڵەی قەیسەری ڕۆم لەگەڵ پارسەکان چ لە گۆشەنیگای ولاتەوە و چ لە ڕووی تاکەکەسییەوە بۆ ئەو بەرەنجامێکی باشی ئەوتۆی نەبوو. پارسەکانیش لەم شەڕانەدا زیان و خوسارێکی بەرفراوانیان لێ کەوت و شارە گەورە و تەختگەکانی ڕۆئاوایان جارێکی تر بوو بە شوێنی هێرش و شالاوی سوپای ڕۆم. ئەم وێرانکاری و کوشتارانە زیاتر یارمەتیدەر بوو لە ڕووخان و هەڵوەشاندنەوەی هێزەکانی پارس و زەوینەی ڕووخان و هەڵتەکانی بناخەی

سەڵتەنەتەکە کە خەریک بوو بە ئەنجام دەگەیشت زووتر ساز کرد.

بلاشی چوارەم پاش ١٦ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن کۆچی دوایی کرد.

هوشان وشکا میری کۆشانی:

پاش کۆچی دوایی کەنشکین، هوشان وشکا هاتە سەر تەختی میرنشینیی کۆشانی. بارودۆخی وڵات لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو زۆر ڕاحەت و پڕ ئاسایش بووە و خەڵکی ژیانێکی ئاسوودەیان هەبووە. هوشان وشکا هەموو کات سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی دینی باوادایی بوو و نزیکەی ٢٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و پاشان کۆچی دوایی کرد.

میر میران میر بیغ براخۆیی:

دوای کۆچی دوایی میر شاهمیر، کوڕەکەی، میر بیغ هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە سەردەمی میر بیغدا، میری مەزنی کۆشانییەکان هوشان وشکا کۆچی دوایی کرد و لە جێگەی ئەو کوڕەکەی، واسان وشکا کە "واسا دیوان"یشیان پێ دەگوت هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی کۆشانی.

لە سەردەمی میر بیغدا چەند پروپاگەندەکەرێکی دینی باوادایی بۆ پروپاگەندە کردن و ئامۆژگاری دان لەمەڕ دینەکەیانەوە هاتنە توران و مەکران و هەندێک خەڵک لە دانیشتوانی ئەرمابیل ناوچەی خوارووی توران و ناوچەی باکوری ڕۆهەلاتی توران کە بە بدهان دەناسرا ئەم دینەیان قەبووڵ کرد. بەڵام کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران لەسەر دینی خۆیان واتە زەردەشتی مانەوە و پروپاگەندەکەرانی دینی باوادایی هیچ کارتێکەرییەکی لەسەر دانەنان. ئەو دانیشتوانەی ئەرمابیل و بدهانیش کە ئاینی باوادایییان قەبووڵ کرد، لە نەژادی کوردی بەلوچ نەبوون بگرە هاونەژادی جدگالەکانی سندان بوون.

میر بیغ ٢٢ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و پاشان کۆچی دوایی کرد. ئەم سەرۆکانەی کوردە بەلوچەکان: میر مەردان زەنگەنە، میر کلوش ئەدرەگانی میر میرانی مەکران، میر شمین ماملی و میر بەهکەر کرمانی هاوچەرخی بوون.

**پاشابوونی ئەردەوانی پێنجەم لە پارس و بلاشی پێنجەم لە بابل:**

کاتێک میر بلاشی چوارەم کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی لە پاش بەجێ ما: بلاش و ئەردەوان. بلاشی پێنجەم بوو بە جێنشینی باوکی. بەڵام ئەردەوان پاشایەتیی ئەوی نەسەلماند و دەستی بە دژایەتیکردنی کرد و خۆی بە داواکاری تەخت نیشان دا.

لە ئاکام لە نێوان ئەم دوو برایەدا کار بە شەڕ گەیشت و ئەندامانی دەوڵەتی پارس ئاشتییان لە نێواندا کردن بەو چەشنەی کە وڵاتی بابلیان دایە بلاش و سەڵتەنەتی پارسیشیان دایە ئەردەوان. لەم ڕووەوە، هەردووکیان لە وڵاتی خۆیان بناخەی فەرمانڕەواییی خۆیان دامەزراند.

**میر میران میر شاهزور براخۆیی:**

وێڕای کۆچی دواییی میر بیغ، کوڕەکەی، میر شاهزور هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە سەردەمی شاهزوردا لە هەموو گۆشە و پەنایەکی سەڵتەنەتی ئەشکانیدا شۆڕش و یاخیگەری بەرپا بوو و باری پاشاگەردانی و ئاژاوە و شڵەژاوی بە خێرایی گەشەی سەند و بڵاو بووەوە.

میرەکانی کوردە بەلوچەکان پاش وردبوونەوە لە بارودۆخەکە، بۆ ڕاوێژکاری لە دەوری یەک کۆ بوونەوە و بە بیروڕای گشتی لەسەر ئەو بیر و بۆچوون و بەرژەوەندییە ڕێک کەوتن کە خۆیان لە یاخیگەری و ئاژاوەی ئەو سەردەمە دوور بگرن و بەشداریی شەڕ و پێکدادانی فەرمانڕەوایە خۆماڵییەکان نەکەن. ئەمەش بۆ ئەوەی لە زیان و خوسار دوور بن. هەڵبەتە لە سەرەتادا سەرۆکەکانی کوردە بەلوچەکان لە دژی ئەردەشێری ساسانی یارمەتی و هاوکاریی میر واسان وشکا پاشای کۆشانییان کرد بەو مەبەستەی وڵاتەکەی لە زیان و خوساری گشتگیر و داماوی هەمیشەیی بپارێزن. بەڵام ئەم هەڵوێست و کردارەی کوردەکان بە ئامانج نەگەیشت، لەبەرئەوەی کاروباری دەوڵەتیی کۆشانییەکان بە ڕادەیەک شێواو و شپرزە بوو کە دەرفەتی چاکبوونەوە و وەچەرخانێکی تازە نەمابوو. کوردە بەلوچەکانیش ناچار دەستیان لە هاوکاری و پشتیوانیکردنیان کێشایەوە.

لێرەدا ئەوە جێگەی سەرنج بوو کە ڕۆحییەی نەرێنیی ڕێبازی دینی باوادایی

لەگەڵ ڕەوشی سەربازیی کۆشانییەکان نەدەگونجا و ئەو هێزەی کە بۆ بەهێزیی لەشکر و سەرکەوتن پێویست بوو بەدی نەدەکرا. هەر ئەمانەش بوونە هۆکاری شکستی کۆشانییەکان لە بەرامبەر هێزەکانی ساسانی.

میر شاهزور ٣٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان: میر روان شێر زەنگەنە، میر ئونکان ئەدرەگانی، میر نوتار ماملی و میر بەهەند کرمانی هاوچەرخی بوون.

کوژرانی ئەردەوانی پێنجەم، دوا پاشای ئەشکانی:

لە دوا سەردەمی ئەردەوانی پێنجەم پاشای بنەماڵەی ئەشکانییەکان، زنجیرەیەک شۆڕش و یاخیگەری لە وڵاتی ماد و پارس دەستی پێ کرد و کۆتاییی بە ئیمپراتۆری ئەشکانییەکاندا هێنا. ئەم شۆڕشە سەرەتا لە شێوەی شەڕ و لێکدانی بچووکی خۆماڵیی نێوان میران و فەرمانڕەواکانی ویلایەتەکان لە سنووری هەرێمی پارس کە لە لەومانەدا لە ڕاستیدا سەربەخۆییان هەبوو گەڵاڵە بوو. ئەردەشێر کوڕی پاپک کوڕی ساسان قەڵەمڕەوی وڵاتەکەی خۆی بەرین کردبووەوە و ناوچەکانی دەوروبەری یەک بە یەک داگیر کردبوو. هەروەها باوکی خۆی هان دەدا کە دژی فەرمانڕەوای پێشووتر شۆڕش و یاخیگەری دەست پێ بکات. پاپک داوای لە پاشای ئەشکانی کرد کە کوڕی ئەو شاهپور لە جێگەی فەرمانڕەوای پێشووتر کە کوژرابوو لەسەر سەڵتەنەت دابنێ. ئەم داواکارییە لەلایەن شاوە پەسند نەکرا. پاپک لەو کاتەدا کۆچی دوایی کرد و شاهپوری کوڕی بوو بە جێنشینی و ئەویش ئەوەندەی نەخایاند دیوارێک بەسەریدا ڕووخا و مرد. دوای ئەم ڕووداوە، ئەردەشێری برای خێرا خۆی گەیاندە شاری ئەستەخر و لە جێگەی ئەو هاتە سەر تەختی پاشاییی ولایەتی پارس. فەرمانڕەواکانی ماد و کوردستان و کەرکووک لەگەڵ ئەردەشێر یەکیان گرت و شەڕیان دژی بنەماڵەی ئەشکانی دەست پێ کرد.

لە درێژاییی ساڵێکدا پاشاکانی ئەم ولایەتانە هێرشیان بردە سەر چەندین شاری گەورە و داگیریان کرد. لە ئەنجامدا، ئەردەوانی پێنجەم لە ئەهواز شکستێکی سەختی خوارد و کوژرا. بەم شێوەیە، سەرتاسەری وڵاتەکەی هاتە ژێر دەسەڵاتی ئەردەشێری پاپکان و سەردەمی پاشایەتیی ئەشکانیی پارس بەسەر چوو.

## بەشی نۆیەم

## کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی ساسانییەکاندا

ساسانییەکان:

دەگێڕنەوە کە کاتێک بەهمەن هەخامەنشی پاشای ماد و فارس بوو، بەپێی ئاینی زەردەشتی خوشکی خۆی "هوما"ی بە ژن خواست و کوڕێکی لێی بە دنیا هاتووە و ناویان ناوە "دارا". لەدایکبوونی دارا بوومتە هۆی ئەوەی ساسان برای بەهمەن لە میراتی تەخت و تاج بێبەش بێت. ساسان لەباری پەرێشانی چووە شاخەکانی کوردستان و ژیانی گۆشەنشینیی هەڵبژارد و خۆی بە مێگەلدارییەوە خەریک کرد.

پاشای ئەشکانی پاپک کوڕی ساسانی بە پلەی فەرمانڕەوای پارس هەڵبژارد و لەم ڕووەوە ئەو یەکێک لە فەرمانڕەوایە ناوچەییەکانی پاشای ئەشکانی بووە. پاش ئەوەی پاپک کۆچی دوایی کرد، شاهپوری کوڕی لە جێگەی هاتە سەر تەختی فارس. بەڵام فەرمانڕەواییی ئەو زۆری نەخایاند و دیوارێکی بەسەردا ڕما و گیانی لەدەست دا. ئەردەشێر لەو کاتەدا بە خێرایی هاتووەتە ئەستەخر کە پایەتەختی فارس بوو و لە جێگەی براکەی هاتووەتە سەر تەختی پاشاییی ولایەتی پارس.

پاشابوونی ئەردەشێر:

پاش کۆچی دوایی شاهپور، ئەردەشێر کە برای ئەو و کوڕەزای ساسان بوو هاتە سەر تەختی ولایەتی فارس و بناخەی سەڵتەنەتێکی بەهێز و پتەوی لە فارس دامەزراند. کاتێک هاتە سەر ولایەتی فارس، سەڵتەنەتی ماد و پارس بەسەر ١٤٠ ولایەتدا دابەش کرابوو و هەر یەکێک لەو ولایەتانەش فەرمانڕەوایەکی تایبەتی خۆی هەبوو کە لەژێر دەسەڵاتداریی پاشای ئەشکانیی ئەردەوانی پێنجەمدا بووە. کاتێک ئەردەشێر پاشایەتیی لە ئەردەوانی پێنجەم سەند و سەڵتەنەتی ئەشکانی

کۆتاییی پێ هات، هەندێک لە فەرمانڕەواکانی ولایەتەکانی ماد و پارس پاشایەتیی ئەردەشێریان نەسەلماند. لەبەر ئەوە بڕیاری دا بیانهێنێتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە. لەم ڕووەوە، فەرمانڕەواکانی ولایەتەکانی باکوری ڕۆهەلات دژی هەلگەڕابوونەوە و ئەردەشێر بەرەو ناوچەکانی خۆراسان و مەرۆ و بەلخ و خیوا کەوتە ڕێ. ئەردەشێر سەرقالی داگیرکردنی ولایەتەکانی ئەم ناوچانە بوو کە بالوێزانی فەرمانڕەواکانی کۆشان و توران و مەکران هاتنە دەرباری پاشایەتیی ئەو و پەیامی گوێڕایەلیکردنی فەرمانڕەواکانیان پێ ڕاگەیاند. ئەردەشێریش دوای قەبوولکردنی گوێڕایەلییان نوێنەرەکانی بە دیاری و خەلاتەوە بەڕێ کرد و ئەوانیش بەرەو ولایەتەکانی خۆیان گەڕانەوە.

**میر میران میر بوراک براخۆیی:**

پاش کۆچی دواییی میر شاهزور، میر بوراکی کوڕی هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران و لە سەردەمی ئەودا، ئەردەشێری پاپکان دەسەلاتداریی بەسەر گشت سەلتەنەتی ئەشکانیدا پەیدا کرد. ئەردەشێری پاپکان لە دوا شەڕ ئەردەوانی پێنجەمی لە دەشتی هورموز لە ڕۆهەلاتی ئەهواز بە سەختی شکست دا. ئەردەوانی پێنجەم لە مەیدانی شەڕ کوژرا و ئەردەشێریش جاڕی پاشایەتیی خۆی لێ دا و هاتە سەر تەختی ماد و پارس.

"بە بینینی ئەم گۆڕانکارییە لە بارودۆخی ولات، کوردە بەلوچەکان و سەرۆکەکانیان بە مەبەستی ڕاوێژکارییی لە دەوری یەک کۆ بوونەوە و بڕیاریان دا گوێڕایەلی ئەردەشێری پاپکان بکەن. لە ئەنجامی ئەم بڕیار دانە، میر بوراک براخۆیی میر میرانی توران، میر سارگان ئەدرەگانی میر میرانی مەکران، میر ئیزبوک زەنگەنە و میر سلخان ماملییان وەکو نوێنەر و پەیامنێرانی هۆز و تیرەکانی کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران ناردە دەرباری ئەردەشێر بۆ ئەوەی گوێڕایەلی ئەو میرانەی پێ ڕابگەیەنن. ئەم میرانە پاش گەیاندنی پەیامی گوێڕایەلی بەرەو توران گەڕانەوە.

میر بوراک ٣٥ سال فەرمانڕەواییی کرد و پاشان کۆچی دواییی کرد. ئەم میرانەی کوردە بەلوچەکان: میر ئیزبوک زەنگەنە، میر سارگان ئەدرەگانی میر میرانی مەکران، میر سلخان ماملی و میر لاسکان کرمانی هاوچەرخی بوون.

هێرشی ئەردەشێر بۆ سەر خاکی هیند:

ئەردەشێر پاش مل پێ کەچکردنی فەرمانڕەوا یاخییەکانی خوراسان و مەڕۆ و بەلخ و خیوا دەستی بەتاڵ بوو و بیری داگیرکردنی هیندی کەوتە مێشک و ولایەتی کابلستان و کندارای تێ پەڕاند و شاری "پوشان پوران"ی داگیر کرد. ئەردەشێر لە شەڕ بەسەر قشونی هیند سەرکەوت. پاشای هیند "جونان" زێڕ و زیو و گەنجینە و سەروەتێکی مەزنی دایە ئەردەشێر. ئەردەشێریش دوای وەرگرتنی ئەم باجە بێ وێنەیە، ڕووەو ماد و پارس گەڕایەوە.

ئەردەشێر ١٢ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و پاش کۆچی دوایی ئەو، شاهپوری کوڕی هاتە سەر تەخت.

پاشابوونی شاهپوری یەکەم:

پاش کۆچی دوایی ئەردەشێر، کوڕەکەی، شاهپوری یەکەم هاتە سەر تەختی سەڵتەنەتی ساسانی. شاهپور لە دایکەوە نەوەی کوڕەزای ئەردەوانی پێنجەمی پاشای ئەشکانی بوو.

فەرمانڕەواکانی ئەرمەنستان و هترا بە مردنی ئەردەشێر ئامادەی یاخیگەری بوون و بە تەماحی ئەوە کەوتن کە جارێکی تر دەست بەسەر ئەو هەرێمانەدا بگرن کە لەوەپێش لە دەستیان دابوون. شاهپور کە ئاگەداری ئەمە بووەوە، تەگبیرێکی زانایانەی هێنایە کار کە سەرەتا یاخیگەری فەرمانڕەوای ئەرمەنستانی بە ئاسانی بنبڕ کرد و پاشان پایەتەختی هترای گەمارۆ دا. کچی فەرمانڕەوای هترا پەیامی بۆ شاهپور نارد کە ئەگەر ئەو بە ژن بخوازێت ئەوا لەگەڵی یەک دەگرێت و یارمەتیی دەدات. پاشا پەیمانەکەی قەبووڵ کرد و هترای داگیر کرد.

شاهپوری یەکەم ٣١ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و پاشان کۆچی دوایی کرد.

مانی و دینەکەی:

کەسێک بە ناوی مانی دانیشتووی هەمەدان بوو. باوکی ناوی پاتکا و دایکی ناوی ئوتاخیم بوو. ئەوان لە هەمەدان شوێنیان گواستەوە و چوون لە بابل نیشتەجێ بوون. مانی لە بابل لەدایک بوو و لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا سروشی بۆ

هاتووەتە خوارێ. بەڵام ڕێبازی دینەکەی لە کاتی هاتنە سەر تەختی شاهپور ڕاگەیاند. شاهپور بە ڕاگەیاندنی دینەکەی باوەڕی هێنا و دینەکەی قەبووڵ کرد و بوو بە یەکێک لە پەرستیارانی. ئەم وەچەرخانەی شاهپور لە دینی باپیرانییەوە بووە هۆی تووڕەبوون و ڕەنجاندنی پەرسگەکان و ئەندامانی دەوڵەت. ئەوان ئەوەندە زۆریان بۆ هێنا کە ناچار بوو لەم بێ دینییە (ئەتیزم) تۆبە بکات و جارێکی تر بێتەوە ناو چوارچێوەی دینی زەردەشتی کە دینی باپیرانی بوو. هەروەها، بۆ ئەوەی دڵسۆزی و ڕاستبێژیی خۆی لە بەرامبەر دینی باپیرانی ئیسپات بکات مانیشی شاربەدەر کرد.

مانی لە کاتی شاربەدەریدا گەشتی هیند و چینی کرد و دوای کۆچی دوایی شاهپور گەڕایەوە پارس. پەیڕەوکارانی مانی لەگەڵ ئەو هەموو ستەم و توندوتیژی و چەوساندنەوەیەی کە لەلایەن ولاتەوە بەسەریان دەهات بە پشوودرێژی و ئەو هەموو تاکڕەویی و نادادپەروەرییان بەرداشت دەکرد و بە بێدەنگی و نهێنی دینی خۆیان بڵاو دەکردەوە.

دینی مانی لە بەرامبەر دینی زەردەشتی زۆر سادە و ئاسان بووە. هەر بۆیە بە خێرایی ناوبانگی دەرکرد. هەروەها جێی ئاماژەیە کە نەریتی پەیڕەوکاری بە هیچ چەشنێک وەکو نەریتی پەیڕەوکاریی دینی زەردەشتی پڕ ئازار و سەخت نەبووە.

**میر میران میر مهران براخۆیی:**

میر بوراک لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شاهپوری یەکەمدا کۆچی دوایی کرد و دوای ئەو میر مهرانی کوڕی هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە سەردەمی میر مهراندا، هەموو سەرنج و هۆشی ولاتی ساسانی و فەرمانڕەوایە هاوپەیمانەکانیان بۆ داگیرکردنی ئەو ناوچانەی ماد و پارس تەرخان کرابوو کە لە دوا سەردەمی ئەشکانییەکان ولاتی ڕۆم دەستی بەسەردا گرتبوون. هۆکاری ئەمەش ئەوە بوو کە ڕۆمەکان دەستیان بەسەر بەشێکی سەرەکیی ولاتەکانی ڕۆئاوای سەڵتەنەتی ماد و پارسدا داگرتبوو.

کوردە بەلوچەکانی تیرەکانی پێنجینەش بە چاودێری و پارێزگاریکردنی سنوورەکانی ڕۆهەلاتیان کە بە ولاتی سندانەوە لکابوو سەرقاڵ بوون. میر مهران پاش ٢٥ ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد. ئەم میرانەی کوردە بەلوچەکان:

میر بەهرام زەنگەنە، میر ئونیز ئەدرەگانی میر میرانی مەکران، میر میردار ماملی و میر شاهار کرمانی هاوچەرخی بوون.

پاشابوونی هورموزی یەکەم:

دوای کۆچی دوایی شاهپوری یەکەم، کورەکەی هورموزی یەکەم هاتە سەر تەخت. شاهپور دوو کوڕی لە پاش بەجێ ما: هورموز و بەهرام. هورموز کوڕی گەورەی بوو، لەبەر ئەوە ئەندامانی دەوڵەت بەپێی دەستوور و نەریتی ساسانییەکان ئەویان لەسەر تەختی باوکی دانا.

هورموز پێش هاتنە سەر تەخت، دادگەری ولایەتی خوراسان بوو. هورموز وەکو باوک و باپیری دادپەروەرانە فەرمانڕەوایی کرد و لە سەردەمی دەسەڵاتداریی خۆی مانیی بانگهێشتن کرد کە دیسان بێتەوە ماد و پارس و لە کۆشکی خۆی بە مێوانی ڕای گرت. تەمەن لەگەڵ هورموز نەیار بوو و دوای یەک ساڵ کۆچی دوایی کرد.

هاتنی ئامۆژیارانی مانی بۆ سکستان و توران و مەکران:

مانی کاتێک لەلایەن هورموزی یەکەم بۆ پارس بانگهێشن کرا، هاتەوە و لە کۆشکی پاشا نیشتەجێ بوو و پەیرەوکارانی جارێکی تر بە ئاشکرایی دەستیان بە بڵاوکردنەوەی دینی خۆیان کرد. کەسێک بە ناوی کسون کە ڕاستبێژ و باوەڕپێکراوی دینی مانی بوو هاتە سکستان و لەوێوەش چووە توران و مەکران و خەڵکانی ئەم ولایەتانەی هێنایە ناو ڕێبازی خۆیەوە.

کسون لە زانا هەڵکەوتەکانی مانی بوو و بە چەشنێک زمانخۆش و قسەخۆش بوو کە بچوایەتە هەر شوێنێک دوای بیستنی ئامۆژیارییە ئەفسووناوییەکانی، خەڵکان دەستە دەستە هاتوونەتە ناو دینی مانییەوە. کوردە بەلوچەکانیش لەگەڵ سەرۆکەکانیان دینی مانییان قەبووڵ کرد.

ڕێبازی دینی مانی زۆر سادە بوو و دینەکەی لەسەر ئەم سێ بنەمایەی ژیان: بیری باش، کرداری باش و گوفتاری باش تەلقینی داوە و ڕێنوێنیی خۆ دوورگرتنی لە نەریتی بێ جێ و پڕ لە ئازار داوە.

**میر میران میر شادان براخۆیی:**

میـر مـهران دوای ئەوەی مـاڵـئـاوایی کـرد، مـیـر شـادانی کـوڕی هاتە سـەر دەسـەڵاتداریی مـیـرنشـینیی توران. لە سـەردەمی مـیـر شـادان، هورموزی یەکـەم کۆچی دوایـیّ کرد و بەهرامی برای لە شـوێنی ئەو هاتە سـەر تەخـتی سـاسـانی. بەهرام لەگەڵ هاوپەیمانەکانی پێوەندیی زۆر دۆستانە و دڵسۆزانە بووە.

ئەم میرانەی تیـرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان میر شێربورز زەنگەنە، میر بازیچ ئەدرەگانی میر مـیرانی مـەکران، میر مـهرداد مـاملی و مـیر نوکەف کرمانی هاوچەرخی میر شادان براخۆیی بوونە.

**پاشابوونی بەهرامی یەکەم:**

هورمـوزی یەکەم لە گەنجی دوای یەک سـاڵ فـەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کـرد و ئەندامانـی دەوڵەت بەهرامی برایان هێنایە سـەر تەخـت. بەهـرام پیـاوێکی تەوەزەل و لە کـارکردنـدا خـاو بووە. لەبـەر ئـەم هـۆیانە لە وڵاتەکەیدا شـڵـەژاوی و نائاسـوودەیی سەری هەڵدا.

**کوژرانی مانی:**

لە سـەردەمی فـەرمانڕەوایی بـەهرامی یەکەم مـانی یان کوشت. هـورمـوزی برای بەهرام هـاودەنگ و پشـتیوانی مانی بوو لە سـەردەمی فەرمانڕەوایی خـۆیدا مانیی ئیـزن دابوو دینەکـەی خـۆی پڕوپاگـەندە بکات. لـەبەر ئەم هـۆیە بەهرام زۆر ڕک و کینەی لە مـانی بوو. هـەر بۆیە کـە هاتە سـەر تەخت لە پـرستگە زەردەشـتیـیـەکان یەکی گرت و ئەو چەشنە ئیزنەی هێنایە ئاکام کە مانی لەناو ببەن.

بەهرام بـۆ ئەم مـەبەسـتـە مـانیی بۆ وتـووێژ بانگـهـێـشتن کـرد و لـەم وتووێژەدا پێشەوایە زەردەشتییەکان مانییان بە بێ دین و خوانەناس لە قەڵەم دا و کوشتیان. لەگـەڵ ئەوەشـدا، سـتـەم و زۆرداری و تاکـڕەوییـان لـە ئاست پـەیڕەوکـاران و لاساییکەرەوانی مانی بە ڕەوا زانی.

کوردە بەلوچـەکانی سکسـتـان و توران و مـەکرانیش پەیڕەوکارانی دیـنی مـانی بوون. لەبەر ئەم هۆیە، ئەوانیش بەر گلەیی و تووڕەیی و توندوتیژیی بەهرام کەوتن.

ئەم ڕێباز گۆڕینە تەنانەت بووە هۆکاری ڕووخانی میرنشینەکانی کوردە بەلوچەکان لە توران و مەکران. بەم شێوەیە، کوردە بەلوچەکان جارێکی تر بە ژیانی هۆزایەتیی خۆیان سەرقاڵ بوون.

بەهرامی یەکەم پاش سێ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن کۆچی دوایی کرد.

پاشابوونی بەهرامی دووەم:

دوای کۆچی دوایی بەهرامی یەکەم، کوڕەکەی، بەهرامی دووەم هاتە سەر تەختی باوکی. بەهرامی دووەم خەفەتباری ئەو دۆخە شڵەژاو و داماوییە بوو کە لە سەردەمی دەسەڵاتداریی باوکیدا لەناو وڵات پەرەی سەندبوو و دەیویست بە خێرایی ئەم زیانکارییانە چارەسەر بکات. ئەو وای بۆ دەچوو کە بە زەبروزەنگ دەتوانێت خراپەکارییەکانی کاروباری وڵات دوور بکاتەوە. لە بەکارهێنانی ئەم شێوازە تاکڕەوییانە، هەڵسوکەوتی ئەوەندە سەرسەخت بوو کە گەوران و ئەندامانی سەڵتەنەت و خەڵکی وڵاتەکە لێی بێزار بوون و چیی تر نەیاندەتوانی بەرداشتی بکەن. گەورانی سەڵتەنەت بۆ کوشتنی بە نهێنی پەیمانیان بەست. بەڵام یەکێک لە پێشەوایە زەردەشتییەکان کە دڵسۆزی بەهرام بوو بەم پیلانەی زانی و لە نێوان بەهرام و ئەندام و دەسەڵاتدارانی وڵات ئاشتیی بە ئەنجام گەیاند.

بەهرام لەم ڕووداوەدا پەندی وەرگرت و دەستی لە زۆرداری و ستەم کێشایەوە و سەرەتای فەرمانڕەوایی دادپەروەرانە و بەزەییانەی کردەوە. بەم شێوەیە، خەڵک بە هەڵسوکەوتی شاد بوون و بەهرام جارێکی تر بووەوە خۆشەویستی خەڵکی وڵاتەکەی.

بەهرامی دووەم دوای حەوت ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد.

گوێڕایەڵکردنی هۆزە ساکایەکان و کوردە بەلوچەکان:

هۆزە ساکایەکانی زابلستان و کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران دینی مانییان قەبووڵ کردبوو و لە پەیڕەوکاری ئەو بوون. دوای مردنی هورمەزی یەکەم، برایەکەی، بەهرامی دووەم هاتە سەر تەخت کە زۆر ڕک و کینەی لە مانی بوو و ئەوی بە خوانەناس و بێ دین دەزانی. دوای کوژرانی مانی، بەهرام دەستدرێژیی کردە سەر پەیڕەوکاران و لاساییکەرەوانی مانی. لەبەرئەوەی کوردە بەلوچەکان و

ساکایەنیش هاوباوەڕی مانی بوون، دووچاری تووڕەیی و توندوتیژیی بەهرام بوون و لە ستەم و زۆرداری ڕزگاریان نەبوو. لە ئەنجامدا، میرەکان یەکیان گرت و شۆڕش و یاخیگەریان بەرپا کرد و هێرشیان بەرەو کرمان برد و ئەو ولاتەیان تالان کرد.

بەهرامی دووەم بە هەموو هێزی شەڕەوە لە بەرامبەر ساکایەکانی زابلستان و کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران بەرگریی کرد و هێرشی بردە سەر زابلستان. دوای شەڕێکی سەخت، یاخیگەرەکانی شکست دا.

لەم شەڕ و پێکدادانە، میری ساکایەکان میر ئەشکن سارو و میری کوردە بەلوچەکان میر شێربورز زەنگەنە و میر مهرداد ماملی کوژران. لە ئەنجامی ئەم شەڕە، بەهرامی دووەم میرانی سکستان و توران و مەکرانی دەرکرد و لە جێگەیان لەم ولایەتانە دادگەریی خۆی دامەزراند.

هاتنی زاوک بۆ دادگەریی توران و مەکران:

بەهرامی دووەم کە ئاگری شۆڕش و یاخیگەریی سەکستان و توران و مەکرانی دامرکاند و ڕەشەکوژیی پەیڕەوکارانی مانی کرد و بەسەریاندا زاڵ بوو، متمانەی بە میرەکانی ئەم ولایەتانە نەبوو. هەر بۆیە لەسەر پلەکانیانی لابردن و لە شوێن ئەوان میر زاوکی لەسەر پلەی دادگەری توران و مەکران جێگیر کرد.

پاشابوونی بەهرامی سێیەم:

بەهرامی سێیەم دوای کۆچی دوایی باوکی هاتە سەر تەخت. ئەو تەنیا چوار مانگ فەرمانڕەوایی کرد و پاشان کۆچی دوایی کرد.

پاشابوونی نارسەس:

دوای کۆچی دوایی بەهرامی سێیەم، لە بنەماڵەی ساسانی دوو کوڕی شاهپور: هورموز و نارسەس لە ژیاندا بوون. هورموز خۆی بە خاوەن مافی پاشایەتی دەزانی و کاتێ نارسەس هاتە سەر تەختی سەڵتەنەتی ساسانی دەستی بە شۆڕش و ئاژاوەنانەوە کرد. بەڵام سەرنەکەوت و شکستی خوارد و شۆڕشەکەی هەرەسی هێنا.

شەڕ لەگەڵ ڕۆمەکان:

کاتێ نارسەس هاتە سەر تەخت، ولایەتی ئەرمەنستان لەژێر دەسەڵاتی ڕۆمەکاندا بوو. نارسەس ئەم دەست بەسەرداگرتنەی بە ڕەوا نەدەزانی و هێرشی بردە سەر ئەرمەنستان و میری ئەرمەنستان تیردادی بە سەختی شکست دا.

تیرداد چووە داڵدەی قەیسەری ڕۆم و قەیسەر یارمەتیی دا و فەرمانی دایە سەرلەشکرەکەی کە هێرش بەرێتە سەر سەڵتەنەتی پارس. ڕۆمەکان شاری عەکاسان کە نارسەسی تێدا بوو گەمارۆ دا و شەڕێکی سەخت لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا ڕووی دا. لە ئەنجامدا، نارسەس شکستی خوارد و ڕۆمەکان هەموو سامانی شەڕ و مەنجەنیقە قەڵاشکێنەکان و کەلوپەل و ئامرازەکانی ساسانییەکانیان بە تەواوی لەناوبرد.

نارسەس لە شەڕ بریندار بوو و هەڵات. پاش ئەوە، لە داخ و خەفەتی شکست خواردنەکەی وازی لە تەخت هێنا و ژیانی گۆشەگیریی هەڵبژارد.

بەهرامی سێیەم ۱۹ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد.

پاشابوونی هورموزی دووەم:

دوای گۆشەگیری نارسەس، بە وەسێتیی ئەو، هورموزیان هێنایە سەر تەخت. هورموز لە سەردەمی منداڵی لە دەرباری ڕۆمپەروەرە کرابوو و داوونەریتی ڕۆمی زۆر لا پەسند بوو. لەبەر ئەم هۆیە، ئەندامانی دەوڵەتی پارس پەسندیان نەدەکرد.

دوای هەشت ساڵ تێپەڕبوون بەسەر فەرمانڕەواییکردنی، گەوران و کاربەدەستانی سەڵتەنەت لە تەخت دەریان کرد و لە شوێنی ئەو شاپوری کوڕیان کە هێشتان منداڵ بوو هێنایە سەر تەخت. بەمەبەستی پەروەردەکردنیشی کۆڕێکی ئەندامانیان دامەزراند.

هاتنی ئەرشم بۆ دادگەریی توران و مەکران:

هورموزی دووەم کە بوو بە پاشا، زاوکی دادگەریی توران و مەکرانی لە کارەکەی دەرکرد و لە شوێنی ئەو میر ئەرشمی بۆ دادگەریی ئەم دوو ولایەتە نارد.

ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی پێنجینەی کوردە بەلوچەکان: میر ڕۆستەم براخۆیی،

میر بوراک زەنگەنە، میر گبیل ئەدرەگانی، میر ئیفداد ماملی و میر جادی کرمانی هاوچەرخی هورموزی دووەم بوون و لە توران و مەکران ژیانیان بەسەر بردووە.

ڕیشەی بنەچەی ساکایەکانی سکستان:

میر مایسەس کە بە "موسون"ش ناویان بردووە، یەکەم میری ساکایەکان بوو کە لەگەڵ تیرەکانی هاتنە زابلستان و لەوێ نیشتەجێ بوون. بە هۆی نیشتەجێبوونیان، ولایەتی زابلستان بە ناوی سکستان ناوبانگی دەرکرد. ڕیشەی ئەو بەم شێوەی خوارەوەیە:

مایسەس، کوڕەکەی، ئیزسەس، کوڕەکەی، ئیسالیسەس، کوڕەکەی، گودا و کوڕەکەی ئەبدین گاسەس یەک لە دوای یەک لەسەر میرنشینیی زابلستان فەرمانڕەواییان کردووە.

دوای ئەوەی کە میرنشینیی ساکایەکان دووچاری بێهێزی و لاوازی بوو، ساکایەکان وەکو هۆزێکی گەورە لە زابلستان ژیانیان بەسەر بردووە. ڕیشەی سەرۆک هۆزەکانی ساکایەکان کە لە نەوەی ئەبدین گاسەس بوونە بەم شێوەیە:

ئەبدین گاسەس، کوڕەکەی، کیدارسەس، کوڕەکەی، پیروسان، کوڕەکەی، تاغرتو، کوڕەکەی موغان تو، کوڕەکەی، کیدگ، کوڕەکەی، موسناسەس، کوڕەکەی، تکان تو، کوڕەکەی، تماندوس، کوڕەکەی، ئەشکن سار و دوای ئەشکن ساریش کە لە شەڕی بەهرامی دووەم کوژراوە کوڕەکەی، ئوستوان و دوای ئەویش کوڕی ئەو ئەغرتو سەرۆکی هۆزی ساکایەکان بوونە.

پاشابوونی شاهپوری دووەم:

دەسەڵاتداران و گەورانی سەڵتەنەتی پارس شاهپوریان لە تەمەنی منداڵی هێنایە سەر تەختی پاشایی باوکی. تا تەمەنی بلۆقی، دایکی فەرمانڕەوایی بە ڕاوێژکاریی ئەندامانی دەوڵەتەوە بەڕێوە دەبرد. بەڵام کە گەیشتە تەمەنی بلۆقی، خۆی بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری وڵاتی گرتە دەست و تا ماوەیەکی درێژ کە لە ۷۰ ساڵ پێک هاتبوو فەرمانڕەوایی کرد.

سەردەمی فەرمانڕەوایی شاهپور بەسەر سێ خولدا دابەش دەبێت. خولی یەکەم لە ۲۸ ساڵ پێک دێت. لەم سەردەمەدا شاهپور کاروباری ناوخۆی وڵاتی

ڕێک خستووه و وڵاتەکەی بەهێز کردووه. خولی دووەم لەگەڵ شەڕ و کێشەکانی ڕۆمەکان دەست پێ دەکات و تا ١٥ ساڵ بەردەوام بووه. لەم سەردەمەدا لە هەموو شوێنێک سەڵتەنەتی ڕۆمی شکست داوه و ترس و سامی سوپاکەی خستووەتە ناو دڵیان بە چەشنێک کە لە مەترسیی شاهپور بەردەوام لە ترس و لەرزدا بن.

دوای زاڵبوون بەسەر وڵاتی ڕۆم، خولی سێیەمی شاهپور دەست پێ دەکات. شاهپور لەم سەردەمەدا هۆشی داوەتە کاروباری ولایەتەکانی ڕۆهەڵات و ئاگری شۆڕش و یاخیگەریی ئەوێی کوژاندووەتەوه و چەندین شاری گەورەی داگیر کردووه. لە یادی سەرکەوتنەکانی خۆی سکەی لێ داوه و دوای ٧٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن کۆچی دوایی کردووه.

شاهپور لە خولی یەکەمیدا ئەم سەرۆکانەی کوردە بەلوچەکان: میر سەلەم براخۆیی، میر مهرداد زەنگەنە، میر مهراب ئەدرەگانی، میر برمبان ماملی و میر ڕۆستەم کرمانی هاوچەرخی بوون.

لەبەرئەوەی سەردەمی فەرمانڕەوایی شاهپوری دووەم دوور و درێژ بووه، لە دوا سەردەمی دەسەڵاتدارییەکەی ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر تیرداد براخۆیی، میر ڕۆستەم زەنگەنە، میر بیغ ئەدرەگانی، میر پشکین ماملی و میر بوورزمهر کرمانی هاوچەرخی بوون.

هاتنی مەنوچهر بۆ دادگەریی توران و مەکران:

کاتێک شاهپور دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی گرتە دەست، میر مەنوچهری بە دادگەریی توران و مەکران دامەزراند کە تا ماوەیەکی درێژ لەسەر پلەی دادگەری مایەوه. بەڵام پاشان شاهپور دەری کرد و لە جێگەی ئەو میر "کاویان"ی نارد.

پاشابوونی ئەردەشێری دووەم:

پاش کۆچی دوایی شاهپوری دووەم، کوڕی ئەو ئەردەشێر هاتە سەر تەخت. تەمەن وەفای لەگەڵ نەکرد و تووشی نەخۆشی هات و دوای چوار ساڵ کۆچی دوایی کرد.

هاتنی ئەربەد بۆ دادگەریی توران و مەکران:

ئەردەشێری دووەم لە سەردەمی فەرمانڕەواییی خۆیدا میر ئەربەدی بۆ دادگەریی توران و مەکران نارد.

پاشابوونی شاهپوری [سێیەم]:

ئەردەشێری دووەم بە گەنجی کۆچی دوایی کرد و هیچ منداڵی نەبوو. لەبەر ئەم هۆیە، ئەندامانی دەوڵەت کوڕی براکەی، ئەردەشێری سێیەمیان هێنایە سەر تەخت. ئەم فەرمانڕەوایەش بۆ ماوەیەکی درێژ فەرمانڕەوایی نەکرد و دوای هاتنە سەر تەخت پێنج ساڵ لە ژیاندا بوو و پاشان کۆچی دوایی کرد.

پاشابوونی بەهرامی چوارەم:

دوای کۆچی دوایی شاهپوری سێیەم، ئەندامان و کاربەدەستانی سەڵتەنەت فەرمانڕەوایی پارسیان دا بە بەهرام کە پێش هاتنە سەر تەخت فەرمانڕەوای کرمان بوو. بەهرام ١١ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و لە سەردەمی پاشایەتیکردنیدا سەربازەکانی دەستیان بە شۆڕش و یاخیگەری کرد. بەهرام بۆ سەرکوتکردنیان هەڵسا و لە کاتی هەوڵدانی کوژاندنەوەی شۆڕشەکەیان کوژرا.

ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر سیامەک براخۆیی، میر تیرداد زەنگەنە، میر شاسر ئەدرەگانی، میر مهرداد ماملی و میر گوڵبەهار کرمانی هاوچەرخی بوونە.

پاشابوونی یەزد گوردی یەکەم:

پاش کوژرانی بەهرامی چوارەم، یەزد گوردی یەکەم هاتە سەر تەختی ساسانی. ئەم پاشایە کەلێک ئاشتیخواز بووە و لەگەڵ سەڵتەنەتی دژبەر واتە سەڵتەنەتی ڕۆم پێوەندیی دۆستانەی بەهێز کردووە. هەروەها بە چاوێکی بەزەییانە تەماشای گاورەکانی کردووە و چاکەی لەگەڵدا کردوون. دوای ٢١ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن بارگەی لە دنیا پێچاوەتەوە.

هاتنی میر کیسون بۆ دادگەریی توران و مەکران:

کاتێک یەزد گوردی یەکەم دەسەڵاتی فەرمانڕەواییی گرتە دەست، ئەربەد دادگەریی توران و مەکران کۆچی دوایی کرد. لەبەر ئەوە یەزد گورد میر کیسونی لەسەر پلەی دادگەریی توران و مەکران دانا.

ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر منگیب براخۆیی، میر گودرز زەنگەنە، میر بەهار ئەدرەگانی، میر کودان ماملی و میر زەنگ کرمانی هاوچەرخی یەزد گوردی یەکەم بوون.

پاشابوونی بەهرامی پێنجەم:

یەزد گوردی یەکەم کە کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی لە دوا بەجێ ما: بەهرام و شاهپور. دەسەڵاتداران و ئەندامانی سەڵتەنەتی پارس هەردووکیانیان بە شایستەی فەرمانڕەوایی نەدەزانی. لەبەرئەوەی بەهرام لە سەردەمی منداڵی لەنێو عەرەبەکاندا گەورە بووبوو. شاهپوریش کاتێک هەواڵی مردنی [یەزد گوردی یەکەمی] پێ گەیشت، پایەتەختی ئەرمەنستانی بەجێ هێشت و بۆ بەدەستهێنانی تەخت خێرا خۆی گەیاندە پارس. لە ئاکامی ئەم پەلەکردنە، فەرمانڕەوای ڕۆم دەستی بەسەر ئەرمەنستاندا گرت. لەبەر ئەم هۆکارانە، کاربەدەستان و ئەندامانی دەوڵەت پیاوێکیان بە ناوی خەسرۆ لە بنەماڵەی ساسانی هێنایە سەر تەخت.

کاتێک بەهرامی پێنجەم کە "بەهرام گور"یشیان پێ گوتووە ئەم بارودۆخەی بینی، بە یارمەتیی عەرەبەکان هێرشی هێنایە سەر سەڵتەنەتی پارس و خەسرۆی شکست دا و خۆی هاتە سەر تەختی فەرمانڕەوایی. بەهرام دوای جێنشینبوونی، ڕەوشتی ناشایستەی لەگەڵ گاورەکان کە دانیشتوانی وڵاتەکەی بوون بەکار هێنا. ئەوانیش لەبەر ستەم و زۆرداریی ئەو ڕایان کرد و چوونە داڵدەی قەیسەری ڕۆم. بەهرام داوای گەڕاندنەوەی دانیشتوانی وڵاتەکەی لە قەیسەری ڕۆم کرد و وڵاتی ڕۆمیش داواکارییەکەی بەجێ نەهێنا و لە ئاکام شەڕ لە نێوان هەردوو وڵاتەکە بەرپا بوو.

شەڕ لەگەڵ سەڵتەنەتی ڕۆم:

بەهرام هێرشی بردە سەر ولایەتەکانی ڕۆم و پاش چەند شەڕ و پێکدادانێکی

سەخت شکستی خوارد. بەهرام داوای ئاشتیی کرد و لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە بەهرام دادپەروەرانە هەڵسوکەوت لەگەڵ دانیشتوانە گاورەکان بکات.

هاتنی میر خیزون بۆ دادگەریی توران و مەکران:

بەهرام کە هاتە سەر تەخت، میرێکی باوەڕپێکراوی خۆی کە ناوی خیزون بوو لە پلەی دادگەریی توران و مەکران دامەزراند. کیسونیشی لەسەر ئەم پلەیە دەرکرد.

هاتنە خوارێی هۆزەکانی هیتال:

لە سەردەمی فەرمانڕەواییی بەهرامی پێنجەمدا هۆزە سپی ڕەنگەکان کە لە زمانی کوردی بە هیتال و هیتل و هفتال یاد کراون لە سەرزەوییەکانی ئاسیای ناوەڕاست و دەریای ئامۆوە بەرەو دۆڵەکانی باکوری تخار و باختەر ڕوویان هێنا و لەوێشەوە بەرەو خوارو سەراوژێر بوونەوە. کۆشانییەکان کە هەستیان بە مەترسیی هێرشی ئەوان کرد، داوای یارمەتییان لە فەرمانڕەوا ساسانییەکان کرد. بەڵام کار گەیشتە ئەو شوێنەی کە توانای بەرگریکردنیان نەما و پاشەکشەیان کرد.

هیتالەکان بەرەو خوارو و ڕۆهەڵات بەڕێ کەوتن و هاتنە پێش و دۆڵەکانی کابلستان و کەندارا و زابلستانیان داگیر کرد و میرنشینییەکانی خۆیان لەو شوێنانە دامەزراند. ئەم هۆزانە هەروەکو هۆزە کۆشانی و ساکایەکان لەگەڵ خەڵکی خۆماڵیی ئەم سەرزەوییانە تێکەڵاو بوون و ئاوێتەیان بوون.

شەڕی هیتال لەگەڵ بەهرامی پێنجەم:

تەوژمی هاتنە پێشی هۆزەکانی هیتال ئەوەندە زۆر بوو کە دەلوا سەڵتەنەتی بەهرام لەناو ببەن. میری هیتالەکان بە ۲۵۰۰۰۰ سەربازەوە ڕووی لە دۆڵی مرغاب و ڕووباری مەرۆ کرد و شەڕی لەگەڵ لەشکری بەهرام دەست پێ کرد. بەڵام چارەنووس هاوڕێیەتیی بەهرامی کرد و پاشای هیتالەکان شکستی خوارد و لە مەیدانی شەڕدا کوژرا. بەهرام حەرەمەکەی گرت و ماڵ و دەسکەوتێکی زۆری دەست کەوت. لەگەڵ ئەوەشدا، هاتنە پێشی هیتالییەکانی وەستاند.

کورده بەلوچەکان لە شەڕی هیتالەکان پشتیوانیی بەهرامی پێنجەمیان کرد و دژی هیتالەکان جەنگان. ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر جانداد براخۆیی، میر رەسان زەنگەنە، میر کێساک ئەدرەگانی، میر سیامەک ماملی و میر سارون کرمانی هاوچەرخی بەهرامی پێنجەم بوون. بەهرام ٢٠ ساڵ فەرمانڕەواییی کرد.

پاشابوونی یەزد گوردی دووەم:

دوای کۆچی دوایی بەهرامی پێنجەم ناسراو بە بەهرام گور، یەزد گوردی کوڕی بچووکی هاتە سەر تەخت و چەندین جار لەگەڵ هیتالەکان کە لە سەرزەویی چول، باکوری گورگان و تالقان، ژیانیان دەبردە سەر یەخەگیر بوو. بەڵام لە ئەنجام هیتالەکان یەزد گوردیان شکست دا و لەگەڵ ئەو هەموو داماوییەدا، یەزد گورد توانی سنوورەکانی وڵاتەکەی کە بە ناوچەی هیتالەکانەوە لکابوو بەهێز بکات و ئامادەکاریی هێرشەکانیانی کرد.

لە سەردەمی یەزد گورددا پروپاگەندەکارانی گاورەکان بە زۆر پروپاگەندە کردن و ئامۆژیاری دینەکەیان لە ئەرمەنستان دەست پێ کرد و ئەمەش بووە هۆی پەرێشانبوونی پێشەوایە زەردەشتییەکانی پارس. یەزد گوردیش لە وەڵام بە زۆر خەڵکی لە چوونە ناو ڕێبازی مەسیحایەتی دوور کردەوە.

ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر شابورز براخۆیی، میر کباد زەنگەنە، میر سەلەم ئەدرەگانی، میر رەسان ماملی و میر شادین کرمانی هاوچەرخی یەزد گوردی دووەم بوون. یەزد گورد ١٧ ساڵ پاشایەتیی کرد.

هاتنی میر کراهون بۆ دادگەریی توران و مەکران:

یەزد گوردی دووەم لە سەردەمی فەرمانڕەواییی خۆیدا دادگەریی توران و مەکران میر خیزونی لابرد و لە جێگەی ئەو میر کراهونی لەسەر پلەی دادگەری دامەزراند.

پاشابوونی فیروز:

دوای یەزد گوردی دووەم، فیروزی کوڕی بە پاشایەتی گەیشت. لەو کاتەدا

سەرۆکایەتیی هیتالەکانیش بە پاشایەتی گەیشتبوو و ناوی پاشایەکان ئەخشونەواز بوو. بەم شێوەیە، دەوڵەتی هیتالی و ساسانی لە باکوری خوراسان تێک بەربوون و لە ئەنجامی ئەم لێکدانە فیروز شکستی خوارد و سەرزەویی تالقانی بە تاوانی شەڕ پێ دان. هەروەها، لەگەڵ ئەخشونەواز پەیمانی بەست کە لە هێڵی سنووریی خوراسان دەوڵەتی پارس سنووربەزێنی نەکات و تا دوو ساڵ باجێکی مەزن بداتە هیتالەکان. بەڵام فیروز پەیمانەکەی شکاند و دوای ماوەیەک لەشکری کێشایە سەریان و هەمیسان سوپای پارس لە بیاوانی باکوری خوراسان تەفروتوونا بوو و فیروز خۆی کوژرا و سەڵتەنەتی پارس بوو بە باجدەری هیتالەکان.

کاتێک شاکانی هیتالەکان لە سوغدستان و کابلستان و سکستان نیشتەجێ بوون، هۆزەکانیان زابلستانیان کردە مەڵبەندی خۆیان. هەر لەبەر ئەمەش بە خۆیان گوتووە "جابولە" واتە "زابلی".

فیروز دوای ٢٦ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن لە شەڕی هیتالەکان کوژرا. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردە بەلوچەکان: میر کوشان براخۆیی، میر گرشاسپ زەنگەنە، میر جاف ئەدرەگانی، میر بیغ ماملی و میر تیرداد کرمانی هاوچەرخی بوون.

هاتنی کرکویی بۆ دادگەریی توران و مەکران:

کاتێک فیروز هاتە سەر تەخت، پلەی دادگەریی توران و مەکرانی دا بە میری سوپا کە ناوی کرکویی بوو.

پاشابوونی بلاش:

پاش کوژرانی فیروز لە شەڕی هیتالەکاندا، برای ئەو، بلاش کە بە "بلاس"یش ناسراوە هاتە سەر تەختی ساسانی. بلاش پیاوێکی ناشایستە و بێ کەڵک بوو و نەیتوانی شان و شکۆی سەڵتەنەتی ساسانی بەرز ڕاگرێ و وەزیرەکەی کە ناوی زرمهر بوو لە تەخت دەری کرد و چاوەکانی هێنایە دەرێ.

هاتنی میر کیارش بۆ دادگەریی توران و مەکران:

زرمهر لەبەرئەوەی فیروزی هێنایە سەر تەخت ، میرێکی باوەڕپێکراوی خۆی کە ناوی کیارش بوو لە پلەی دادگەریی توران و مەکران دامەزراند.

ئەم میرانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر رەسان براخۆیی، میر سەلەم زەنگەنە، میر ئەیلە ئەدرەگانی، میر ڕۆستەم ماملی و میر شاهداد کرمانی هاوچەرخی بلاش بوونە.

پاشابوونی کبادی یەکەم:

لە سەردەمی پاشایەتیی بلاشدا کبادی کوڕی فیروز هەوڵی دا تەختی پاشایەتی لە بلاش بسێنێ بەڵام بەسەر بلاشدا سەرنەکەوت و ناچار چووە داڵدەی سوڵتانی هیتال. کاتێک زرمهر، بلاشی لەسەر تەخت لابرد، کباد بە یارمەتیی هیتالەکان تەختی پارسی داگیر کرد و کچی سوڵتانی هیتالەکان کە لە کەمەری ئەخشونەواز و زگی کچی فیروز بوو بە ژن خواست و فەرمانڕەواییکردنی دەست پێ کرد.

سەرکوتکردنی هۆزەکانی خەزەر:

لە سەرەتای پاشایەتیی کبادا، هۆزەکانی خەزەر هەڵیان کوتایە سەر سەڵتەنەتی پارس و هێرشیان بردە سەر دۆڵی کور. کباد بەرهەڵستکاریی کردن و لە شەڕێکی سەخت شکستی دان و زۆربەیانی کوشت و دەسکەوتێکی بێ ئەندازەی هاتە دەست.

هاتنی ئیمام مەزدەک:

مەزدەک لە شاری ماوایا کە کەوتووەتە لێواری دیجلە لەدایک بوو. ناوی باوکی بامداد بوو کە لە چینی خەڵکانی مامناوەندیی پارس بووە. مەزدەک لە سەردەمی فەرمانڕەواییی کبادا پەیامبەرایەتیی خۆی ڕاگەیاند و دەیویست دینی مانی زیندوو بکاتەوە. دوای دوو سەدە ئەو ئاڵای ئەم ڕێبازە باشەی بەرز کردەوە و خەڵکی بانگهێشتن کرد کە لەژێر ئەم ئاڵایە کۆ ببنەوە.

مەزدەک پیاوێکی بەکردار و زمانخۆش و خۆگر و هێمن بوو. لەبەر ئەوە

بانگەکەی لە هەموو شوێنێک پێشوازیی لێ کرا. ئامۆژگارییەکانی تەنانەت کاری لە کباد پاشای ساسانیش کرد و دینەکەی قەبووڵ کرد. بەڵام گۆڕینی دینی کباد بووە هۆی ئەوەی ئەندامان و کاربەدەستانی دەوڵەت لێی برەنجێن. بەم شێوەیە، ئەندامان و کاربەدەستەکان لەگەڵ پێشەوایە زەردەشتییەکان یەکیان گرت و بەیداخی یاخیگەرییان بەرز کردەوە. لە ئەنجامدا، کبادیان لە تەخت دەرکرد و بەندیان کرد.

کباد پاش چەند ماوەیەک لە گرتیگە بە یارمەتیی پشتیوانانی خۆی ڕای کرد و چووە داڵدەی پاشای هیتالەکان. پاشان پەیامی بە نامە هەنارد بۆ کاربەدەستان و پێشەوایە زەردەشتییەکان کە ئەو لە دینی مەزدەک تۆبە دەکات بە مەرجێک جارێکی تر بیکەنەوە بە پاشا. بەم شێوەیە، لە نێوان ئەو و کاربەدەستان و پێشەوایە زەردەشتییەکان ئاشتی کرا و کباد هاتەوە پارس و بۆ جاری دووەم هاتە سەر تەخت و وازی لە دینی مەزدەک هێنا.

گفتوگۆی مەزدەک لەگەڵ پێشەوایە زەردەشتییەکان:

هەروەکو دەستووری شاکانی پێشوو، کباد کۆڕێکی گفتوگۆی بەست و تێیدا پێشەوایە زەردەشتییەکانی بانگهێشتن کرد کە لەگەڵ مەزدەک لەسەر کێشەی دینەکەی گفتوگۆ بکەن. کاتێک کۆڕەکە بەسترا، پێشەوایە زەردەشتییەکان دوای گفتوگۆ سووکایەتییان بە مەزدەک کرد و بە لە دین هەڵگەڕاویان لە قەڵەم دا و سووچی بڵاوکردنەوەی ئەم بێ دینییەیان لە ئەستۆی ئەو دانا و خستیانە زیندان.

پاش ماوەیەک مەزدەک لە ڕێگەی پەیڕەوکارەکانیەوە لەگەڵ دادوەرەکانی زیندان سازا و لە زیندان ئازاد بوو و هەڵات.

پاشابوونی تەهماسپ:

دوای دەرکردنی کباد لە تەخت، دەسەڵاتدارانی دەوڵەت تەهماسپی برایان کرد بە پاشا و ئەویش بۆ ماوەی سێ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد. لەو کاتەدا، کباد نامە و پەیامی بۆ ئەندامان و کاربەدەستان و پێشەوایە زەردەشتییەکان نارد و بەڵێنی دا کە لە دینی مەزدەک تۆبە دەکات و دینی باپیرانی کە ڕێبازی زەردەشتییە قەبووڵ دەکات.

دوای ئەم بەڵێن و پەیمان دانە، کاربەدەستان و ئەندامانی دەوڵەت کبادیان بانگ کردەوە و بۆ جارێکی تر لەسەر تەختیان دانایەوە.

پاشابوونی کباد - جاری دووەم:

کاتێک کباد بۆ جاری دووەم هاتەوە سەر تەخت، بەپێی ئەو بەڵێن و پەیمانەی دابووی، بە ڕاوێژکاری لەگەڵ کاربەدەستان و پێشەواکانی دینی زەردەشت، کۆڕی گفتوگۆی بەست و تێیدا ئیمام مەزدەک و پێشەوا زەردەشتییەکانی کۆ کردەوە، بۆ ئەوەی لە نێوان خۆیان گفتوگۆ بکەن و بزانن کام لایەن لەسەر ڕێگەی ڕاستە.

گفتوگۆ دەستی پێ کرد و پێشەوا زەردەشتییەکان مەزدەکیان بەبێ دین لە قەڵەم دا و خستیانە زیندانەوە. کباد جاری دووەم بۆ ماوەی سی ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و کۆچی دوایی کرد.

هاتنی میر گستم بۆ دادگەریی توران و مەکران:

لە سەردەمی یەکەمی پاشایەتیی کباد، میر کیارش دادگەریی توران و مەکران بوو. بەڵام لە سەردەمی دووەمیدا، کباد میر کیارشی لەسەر کاری دادگەریی توران و مەکران لادا و لە جێگەی ئەو میر گستمی لەسەر پلەی دادگەریی توران و مەکران دانا.

ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر کیاسر براخۆیی، میر سەران زەنگەنە، میر ئەرجان ئەدرەگانی، میر سیامەک ماملی و میر موڕا کرمانی هاوچەرخی کباد بوون.

پاشابوونی ئەنوشێروان:

دوای کۆچی دوایی کباد، کوڕە گەورەکەی، ئەنوشێروان هاتە سەر تەخت. زامیس برا بچووکی ئەنوشێروان دەستەیەکی لە میرانی سەڵتەنەتی لەگەڵ خۆی هاودەنگ کرد و پیلانی دارشت دەسەڵاتی تەخت لە ئەنوشێروان بسەنێت. بەڵام ئەنوشێروان بەم پیلانەی زانی و بە سەختی سەرکۆنەی کرد و بەمەش نەوەستا هەموو برایەکانی خۆی و کوڕەکانیانی کوشت. ئەمەش بۆ ئەوەی جارێکی تر هیچ کەس دژی ئەو شۆڕش بەرپا نەکات. لەگەڵ ئەوەشدا، کوڕی زامیش کە ناوی کباد بوو لەم کوشت و کوشتارە بە هۆی ڕاکردن ڕزگاری بوو.

ڕەشەکوژیی مەزدەکییەکان و مەزدەک:

ئەنوشێروان کاتێک هاتە سەر تەخت، جاڕی لێ دا کە هەر کەسێک مەزدەکی بێ دین بگرێت، خەڵاتی پێ دەدات. دوای ئەم جاڕ لێدانە، مەزدەک هاتە گرتن و کوشتیان و بە بێدرێغی کوشتاری باوەڕپێکراوەکانیان ئەنجام دا. نزیکەی سەد هەزار نەفەر لە پەیڕەوکارانی مەزدەکیان کوشت.

کوردە بەلوچەکانیش کە دینی مەزدەکیان قەبووڵ کردبوو، لەوانیش نزیکەی دووسەد هەزار نەفەر بەر شاڵاوی ئەم ڕەشەکوژییە کەوت. سەرۆکەکانی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر بەهرام براخۆیی، میر شاگان زەنگەنە، میر زەڕین ئەدرەگانی، میر رسوان ماملی و میر شەمبەد کرمانی پاشماوەی خەڵکی تیرەکانیان کە لەم کوشتار ڕزگاریان بووبوو لە گەردەنەکانی کێوەکانی توران خۆیان شاردەوە. هەندێکیشیان لە زنجیرە چیاکانی توران سەراوژێر بوون و لە دەشتەکانی وڵاتی سندان داڵدەیان گرت.

هاتنی میر یەزەن بۆ دادگەریی توران و مەکران:

کاتێک ئەنوشێروان هاتە سەر تەخت، میر گەستەمی دەرکرد و ناردی بۆ کرمان. لە جێگەی ئەوی میر یەزەنی لەسەر پلەی دادگەریی توران و مەکران دامەزراند.

لەدایکبوونی پڕ لە شادمانیی حەزرەتی محەمەد مستەفا سڵاوی لێ بێ لە سەردەمی ئەنوشێروان:

لە سەردەمی فەرمانڕەواییی ئەنوشێروان پاشای ساسانیدا، محەمەد مستەفا لە خێزانی عەبدوڵڵا کوڕی عەبدولموتەلیبی سەرداری قوڕەیش لەدایک بوو. عەبدوڵڵا چەند مانگ پێش لەدایکبوونی حەزرەتی محەمەد مستەفا کۆچی دوایی کرد. کاتێک حەزرەتی محەمەد لەدایک بوو و مژدەی لەدایکبوونیان بە عەبدولموتەلیبی باپیری گەیاند، ئەو شادمان و خۆشحاڵ بوو و چووە ماڵی عەبدوڵڵا و تازە لەدایکبووی هەڵگرت و بردییە ماڵی کەعبە و بۆی لە خواوەندی گەورە پاڕایەوە. ڕۆژی حەوتەم نەریتی "عەقیقە"ی حەزرەتی محەمەد مستەفایان هەبوو و ناوی "محەمەد"یان لێ نا. ناوی دایکی محەمەد مستەفا ئامینە کچی وەهەب بوو. بەپێی

دەستووری قورەیش بە مەبەستی پەروەردەکردن حەزرەتی محەمەدیان سپاردە حەلیمە کە لە هۆزی بەنی سەعد بوو. حەلیمەش ئەوی وەرگرت و بردی بۆ بەنی سەعد. دوای چوار ساڵ عەبدولموتەڵیب چوو بۆ لای و کە گەیشتە ئەویّ محەمەدی دیت. محەمەد هاتە پێش و گوتی تۆ کێی، ئەویش لە وەڵام گوتی من باپیری تۆم. پاشان عەبدولموتەڵیب هاتە خواریّ و کردیە باوەش و ماچی کرد. پاشان دانیشتەوە و ئەویشی لەسەر سەری زین دانا و هێنایەوە بۆ مەککە.

لە تەمەنی شەش ساڵی دایکی حەزرەتی محەمەد مستەفا کۆچی دوایی کرد و عەبدولموتەڵیبی باپیری و ئەبوتاڵیبی مامی پەروەردەیان کرد. لە تەمەنی ١٢ ساڵی محەمەد مستەفا سەفەری بەسرە و شامی کرد و لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا ژنێکی چاکەکاری بە ناوی خەدیجە کچی خوەیلدی بە ژن خواست.

یەزدانی مەزن ئەوی بە پاکی ڕاگرت و هەرگیز بتپەرستیی نەکرد و تەنیا پەرستنی خوای مەزنی دەکرد. کاتێک تەمەنی بە چل ساڵی گەیشت، لەلایەن خواوە فەرمانی بۆ هات خەڵک بەرەو تەنیایی خوا بانگهێشتن بکات و پێیان بڵێت کە بڵێن " لا اله الا الله محمد رسول الله". یەکەم کەس ئەبوبەکر بوو باوەڕی هێنا و لەبەر ئەوەش پێیان گوتووە "صدیق" [ڕاست]. یەزدانی مەزن دینەکەی سەرکەواند و سەرکەوتنەکان [داگیرکردنەکان] زۆر بوون. سەرەتا مەدینە و پاشان بەنی نەزیر، خەیبەر، فدک، دۆڵی قورا، تیما، مەککە، تایف، جەرش، دومتە الجندل، بەحران، یەمەن، عومان، بەحرەین و یەمامە هاتنە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامەوە. دوای ئەم سەرکەوتنانە، پەیامبەر چووە مەدینە و ڕۆژی دووشەم دوازدەی "ربیع الاولی" ساڵی یازدەی کۆچی دنیای بەجیّ هێشت.

ناوی خێزانە پاکیزەکانی بەم چەشنەیە: خەدیجە، سەودە، عائیشە، حەفسە، زەینەب، ئومولەساکین، ئوم سەلەمە، زەینەب، جورییە، ئوم حەبیبە، مەیمونە، سەفیە و ماریە قوبتی.

پاشابوونی هورموزی چوارەم:

پاش کۆچی دوایی ئەنوشێروان، کوڕەکەی، هورموز کە لە زگی کچی پاشای تورک بوو هاتە سەر تەختی پاشایی ساسانی. سەرەتا لە چەشنی باوکی فەرمانڕەوایی کرد بەڵام لە پاشان دادپەروەری و ویژدانی بەلا نا و ستەم و

زۆرداریی کردە شێوەی خۆی. خەڵک لێی دڵ بە ئازار و ڕەنجاو بوون. لەو کاتە، تورکەکان هێرشیان هێنایە سەر وڵاتەکەی و لە شەڕ کوشتیان. هورموز یازدە ساڵ فەرمانڕەوایی کرد.

هاتنی میر ئەرشب بۆ دادگەریی توران و مەکران:

دوای کۆچی دوایی دادگەر میر پەزمن، هورموز میر ئەرشبی بە دادگەریی توران و مەکران دامەزراند. لە سەردەمی دادگەریی ئەو، میری وڵاتی سندان لایەتەکانی توران و مەکرانی داگیر کرد و ئەرشبی لە دادگەری دەرکرد.

داگیرکردنەوەی ولایەتەکانی توران و مەکران لە والیی سندان:

رایی سهارس فەرمانڕەوای سندان کاتێک سەڵتەنەتی ساسانیی لە باری شڵەژاوی و پاشاگەردانیدا بینی، سوودی لەم هەلە وەرگرت و هێرشی بردە سەر ولایەتەکانی توران و مەکران. دادگەریی توران و مەکران ئەرشبی شکست دا و ئەم ولایەتانەی داگیر کرد و بە وڵاتەکەی خۆیەوە لکاند و ئەرشبیشی وڵات بە دەرکرد.

ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر بیدار براخۆیی، میر بەیکەر زەنگەنە، میر یوسو ئەدرەگانی، میر بابان ماملی و میر تاکول کرمانی هاوچەرخی هورموز پاشای ساسانی و رایی سهارسی والیی سندان بوون.

پاشابوونی خەسرۆ پەروێز:

دوای کوژرانی هورموزی چوارەم لە شەڕی تورکەکاندا، خەسرۆ پەروێزی کوڕی هاتە سەر تەخت. خەسرۆ داوای کرد بەهرام چوبین کە ئامۆزای بوو لەگەڵی ئاشتی بکات. بەڵام بەهرام بۆ ئاشتی ئامادە نەبوو و خۆی بۆ شەڕ ئامادە کرد و پاش شەڕێکی سەخت، خەسرۆ پەروێزی شکست دا. خەسرۆ پەروێز ڕای کرد و چووە داڵدەی قەیسەری ڕۆم. قەیسەری ڕۆم، پێشوازیی لێ کرد و پاشان یارمەتیی دا و لە ئاکامی ئەم هاوکارییە خەسرۆ پەروێز جارێکی تر هێرشی بردە سەر پارس و سەڵتەنەتەکەی خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

شەڕی خەسرۆ پەروێز لەگەڵ ڕۆمەکان:

کاتێک خەسرۆ پەروێز جارێکی تر هاتە سەر تەخت، مارسان قەیسەری ڕۆمی

ڕۆهەڵات کە هاوکاریکەری خەسرۆ بوو و لەسەر تەخت درمخشان بوو و بە دەستی بەرهەڵستکارەکانی کوژرا. خەسرۆ پەروێز بە بیستنی ئەم کارەساتە زۆر دڵڕەنجاو و خەفەتبار بوو و بە ئیرادەیەکی بەهێزەوە بڕیاری دا تۆڵەی خوێنی مارسان لە ناحەزەکانی بسێنێتەوە. بەم شێوەیە، هێرشی بردە سەر سەڵتەنەتی ڕۆم و شەڕی بەردەوام کرد. سەرلەشکرانی خەسرۆ پەروێز لایەنگری ئەم شەڕە نەبوون و بەندیان کرد و کوشتیان، بۆ ئەوەی لە چنگی ئەم شەڕ و پێکدادانە بێ سوودە و بێ کەڵکە ڕزگاریان بێت.

خەسرۆ پەروێز ٣٨ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد. ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر بسسام براخۆیی، میر تیرداد زەنگەنە، میر تاراب ئەدرەگانی، میر مانجان ماملی و میر ساکور کرمانی هاوچەرخی بوون.

نامەی حەزرەتی محەمەد مستەفا بۆ خەسرۆ پەروێز:

لە سەردەمی خەسرۆ پەروێز گرینگرین ڕووداو کە ڕووی دابێت ڕاگەیاندنی پەیامبەرایەتیی حەزرەتی محەمەد مستەفا بوو. لە ئەنجام حەزرەتی پەیامبەر نامەی بە ناوی خەسرۆ پەروێز نارد و بانگهێشتنی کرد کە ئیسلام قەبووڵ بکات.

پاشابوونی کبادی دووەم:

دوای کوژرانی خەسرۆ پەروێز، کوڕەکەی، کباد هاتە سەر تەخت. ئەو لەگەڵ قەیسەری ڕۆم ئاشتیی کرد و بەندییەکانی ئازاد کرد. هەروەها، چاکەکاریی لەگەڵ خەڵک کرد و باجی لەسەریان کەم کردەوە، بۆ ئەوەی خۆشحاڵ بن و ئاسایش لە وڵات بەردەوام بێت. هێشتان ساڵێک بەسەر فەرمانڕەواییەکەیدا تێپەڕی نەکردبوو کە تووشی نەخۆشیی تاعوون هات و گیانی لەدەست دا.

موسڵمانبوونی خەڵکی یەمەن:

لە سەردەمی کبادا، خەڵکی یەمەن و پاشای وڵاتەکە ملکەچی حەزرەتی محەمەد مستەفا بوون و ئیسلامیان قەبووڵ کرد. پاشای یەمەن هەمان پاشا بوو کە خەسرۆ پەروێز پاشای ساسانیی لە سەردەمی دەسەڵاتدارییەتیی خۆیدا نامەی بۆ ناردبوو کە هێرش بکاتە سەر مەدینە و محەمەد بگرێت و بینێرێت بۆ پارس بۆ لای ئەو.

سەرزەویی سندان:

هەندێک مێژوونووس هۆی پێناسەبوونی سەرزەویی سندان بەم شێوەیە باس دەکەن کە هیند و سند دوو کوڕی حام کوڕی پەیامبەر نوح بوون و کاتێک هاتوونەتە ئەم ناوچانە و لێی نیشتەجێ بوون ناوی خۆیان داوەتە ناوچەکان، واتە ناوچەکان بە ناوی ئەوانەوە ناوبانگیان دەرکرد.

نەوەکانی سند لە دۆڵی سندان نیشتەجێ بوون و لەگەڵ ڕەوتی سەردەم بە هۆی زیادبوونی نەژادیان بەسەر دەستە و تیرەدا دابەش بوونە و بە ناوی بنیان و تاکین و مومیدان ناسێندراون. نەوەی ئەمانە نۆبە بە نۆبە لەسەر سەرزەویی سندان فەرمانڕەواییان کردووە. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی بنەماڵەی ساسانییەکان لە پارس، بنەماڵەی راسلان لە سەرزەویی سندان فەرمانڕەواییان کردووە و ماوەی فەرمانڕەواییەکەیان تا دووسەد ساڵ بەردەوام بووە. دەڵێن یەکەم فەرمانڕەوای ئەم بنەماڵەیە راسل دیوانج بووە.

راسل دیوانج:

دەگێڕنەوە کە راسل دیوانج یەکەم فەرمانڕەوای بنەماڵەی راسلان بووە و لە شاری ئەلوردن پایەتەختی وڵاتی سندان دانیشتووە. ڕووبەری وڵاتەکەی زۆر بەرین بووە: سنووری ڕۆژهەڵاتی لکاوە بە کەوشەنی قنوجان، سنووری ڕۆژئاوای تا مەکران و دەریای عومان هەڵکشاوە، سنووری باکوری بە سنوورەکانی کەندارا و زەرەنگ و توران و شاخاویی کوردان لکاوە و سنووری باشووریشی بە سەرزەویی سورتین پێوەست بووە. راسل دیوانج ئەم وڵاتە پان و بەرینەی بەسەر چوار ولایەتدا دابەش کردووە: بورەهمەن ئابادان، سیوستان، ئێسکلەندون و مولتانە.

راسل دیوانج دوای پێکهێنانی وڵاتەکەی بۆ ماوەی پازدە ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و پاشان کۆچی دوایی کرد. ئەو هاوچەرخی ئەنوشێروان پاشای پارس بووە. لەو سەردەمەدا، ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر بەهرام براخۆیی، میر شاگان زەنگەنە، میر زەڕین ئەدرەگانی، میر رسوان ماملی و میر شەمبەد کرمانی سەرخێڵانی تیرەکانی کوردە بەلوچەکان بوونە و لە توران و مەکران ژیانیان بەسەر بردووە.

دالّدەدانی لاساییکەرانی مەزدەک:

لە سەردەمی فەرمانڕەواییی راسل دیوانچ میری سندان، ئەنوشیروان فەرمانڕەوای پارس فەرمانی ڕەشەکوژیی لاساییکەران و پەیڕەوکارانی مەزدکی دا. لەو ڕەشەکوژییەدا ئەوانەی ڕزگاریان بووبوو ڕوویان لە وڵاتی سندان کرد و پەنایان بۆ وڵاتی راسل برد. راسل دیوانچ دڵفراوانە بە پیریانەوە هات و هاودەردیی لەگەڵیان نیشان دا. زۆربەی دالّدەخوازان لە تیرەکانی کوردی بەلوچ بوون.

راسل سهارس:

پاش کۆچی دواییی راسل دیوانچ، کوڕەکەی، راسل سهارس هاتە سەر تەختی فەرمانڕەواییی سندان. راسل سهارس بۆ جاری یەکەم بناخەی نەریت و کاری کشتوکاڵی لە وڵاتی سندان دامەزراند و چاکەی لەگەڵ جووتیارەکان کرد و هەر پێداویستییەکیان لێی بخواستایە بۆیانی جێبەجێ دەکرد و دەیدایە پێیان.

داگیرکردنی ولایەتەکانی توران و مەکران:

کاتێک راسل سهارس هاتە سەر تەختی میرنشینیی سندان، هورموزی ساسانی فەرمانڕەوای وڵاتی پارس بوو و لە سەردەمی ئەو لە وڵاتەکەی شۆڕش و یاخیگەری لە هەموو لایەک بەرپا بوو و شڵەژاوی لە کاروباری وڵاتی پارس دیاربوو. راسل سهارس سوودی لەم لاوازی و داماوییە وەرگرت و هێرشی هێنایە سەر توران و مەکران و بەسەر لەشکری پارسییەکاندا سەرکەوت. لە ئاکامی ئەم سەرکەوتنە، ولایەتەکانی توران و مەکرانی بە وڵاتی سندانەوە لکاند. لەگەڵ ئەمەشدا دادگەری پارس کە ناوی میر ئەرشب بوو لە وڵات کردە دەرەوە و دەسەڵاتی بەڕێوەبەرایەتیی وڵاتی دایە دەست میری خۆی.

دامەزراندنی میر لە توران و مەکران:

کاتێک راسل سهارس ولایەتەکانی توران و مەکرانی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی، میری تیرەی جونای هۆزی بنیان کە ناوی سەمەرا و نازناوی "سیوا" بوو لەسەر فەرمانڕەواییی توران و مەکران دامەزراند.

راسل سـهـارس ٢٠ سـاڵ فـەرمـانڕەوایـیی کـرد و کـۆچی دوایـیی کـرد. ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر بیدار براخۆیی، میر بەیکەر زەنگەنە، میر یوسو ئەدرەگانی، میر بابان ماملی و میر تاکول کرمانی هاوچەرخی هورموز پاشای ساسانی و راسل سهارس بوونە.

سیوا سەمەرا میری توران و مەکران:

سـیـوا سـەمـەرا بە فـەرمـانـی راسل سـهـارسی فـەرمـانڕەوای سندان بۆ فـەرمـانڕەوایـیکردنی ولایەتەکـانی توران و مـەکـران هاتە توران و دەسـەڵاتی فەرمـانڕەوایی گـرتە دەست. ئەو یەکـەم سیـوای ئەم ولایـەتانە بوو و کاتێک هاتە شاری کیکانان پایەتەختی توران کوردەکان لێی ڕاپەڕین. سەمەرا لەگەڵ سوپاکەی ڕووبەڕوویان بووەوە و شـەڕێکی سەخـتیـان ئەنجام دا و لە هـەردوولا خـەڵکێکی زۆر کوژرا. سـیـوا سـەمـەرا جگە لە داوای ئاشـتـی هیچ چارەیەکی تری نەبینی. راسل سهارس فـەرمـانڕەوای سندان بە ئاگەداربوونەوە لەم هـەواڵە، تووشی قـەلەقی بوو. بەڵام چونکە ئەو کـەسێکی وردەکار و کـارزان بوو هەستی کرد لەگەڵ دوو دوژمن واتە کوردە بەلوچەکان و پاشـای سـاسـانی شـەڕکردن کـارێکی نـەشیـاوە. بۆیەکا پێویستە دانیشتوانی توران و مەکران کە کوردە بەلوچەکان بوون ئاشت کاتەوە و لە ئاست پاشـای سـاسـانی لە خـۆی نزیک بکاتەوە و بیـانکات بە پشـتـوانی خـۆی. لەبەر ئەم هۆیە، لەگەڵیان پەیمانی بەست کـە ئەو لە ولایەتەکانی توران و مەکران بە هاوبەشیی کوردەکان فەرمانڕەوایی بکات.

سیـوا سەمەرا ٢٥ ساڵ لە توران و مـەکران فەرمانڕەوایی کرد و کۆچی دوایی کـرد. ئەو لە سـەردەمـی خـۆیدا "تومـان"ی برای کـرد بە والیی مـەکـران. ئەم سـەرۆکانەی کوردە بـەلوچەکان: مـیر بیدار بـراخـۆیی، مـیر بـەیکەر زەنـگەنە، مـیر یوسو ئەدرەگانی، مـیر بابان ماملی و میر تاکول کرمانی هاچەرخی سـیوا سەمەرا بوون.

بەشدارکردنی کوردە بەلوچەکان لە هێزی سەربازی:

بە بەسـتـنی ئـەم پەیمانە راسل سـهـارس فـەرمـانڕەوای سندان بە مـەبەسـتی بەهێزکردن و بەردەوامکردنی دەسەڵاتداریی خۆی لە توران و مەکران بە پێویستی

زانی دانیشتوانی ئەم ولایەتانە کە لە هاوئاهەنگییەکی بەهێز و پێوەستداردا یەکانگیر بوون لەگەڵ خۆی هاودەنگ بکات بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەگەر و مەترسیی هێرش هێنانی وڵاتی ساسانی. بۆ ئەم مەبەستەش، قشونێکی پتەو و بە توانای لە کوردە بەلوچەکان پێک هێنا.

راسل سهاسی:

دوای کۆچی دوایی راسل سهارس، کوڕەکەی، راسل سهاسی هاتە سەر تەختی وڵاتی سندان و ئەو نەریتە کشتوکاڵییانەی کە باوکی دای هێنابوو لە درێژایی و پانایی وڵاتەکەیدا ڕەواج پێ دا. هەردەم دژی بەد ئەندێشان و خراپەکارانی شارستانی و دوژمنانی گوندنشینان کە کشتیار بوون جەنگاوە. راسل سهاسی دوای ٢١ ساڵ فەرمانڕەوایی کردن کۆچی دوایی کرد.

سیوا جونین میری توران و مەکران:

دوای سیوا سەمەرا، کوڕەکەی، سیوا جونین هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران و مەکران و نەریتگەلی کشتوکاڵی لە توران و مەکران ڕەواج پێ دا. لەگەڵ کوردە بەلوچەکان چاکەی کرد و لە ئازایەتی و دڵبەرینی بێ هاوتا بوو.

سیوا جونین بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ فەرمانڕەوایی کرد و کۆچی دوایی کرد. ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچ: میر بەسسام براخۆیی، میر شێرداد زەنگەنە، میر تاراب ئەدرەگانی، میر مانجان ماملی و میر ساکور کرمانی هاوچەرخی بوون.

راسل سهارسی دووەم:

پاش ماڵئاوایی راسل سهاسی، کوڕەکەی، راسل سهارسی دووەم هاتە سەر تەختی وڵاتی سندان. ئەوەندە کات تێ نەپەڕیبوو کە پاشای نیمروز هێرشی هێنایە سەر ولایەتی مەکران. سهارسی دووەم بە لەشکرێکی گەورەوە چووە مەکران و شەڕێکی سەخت لە نێوانیاندا هەڵگیرسا و خەڵکێکی زۆر لە هەردوولا کوژران. جدگالەکان نەیانتوانی لە شەڕ بەردەوام بن و لە هێز و توانایان ترسان و هەڵاتن. هەردووک سیوا جونین میری توران و مەکرن و راسل سهارسی دووەم فەرمانڕەوای سندان کوژران.

پاشـای نیـمـروز دەسکەوتێکی فراوانی دەسکەوت و سـەرکەتووانە بە کۆیلە و چەک و ئەسـپێکی زۆرەوە گەڕایەوە نیـمـروز. پاشـمـاوەی لەشکرەکەیشی کـوردە بەلوچەکـانیـان لە مـەکران ڕاو نا و وڵاتـەکـەیان لێ داگیـر کـردن. ئـەم سـەرۆکانەی کوردە بەلوچەکان: میر جاد براخۆیی، میر ئەورام زەنگەنە، میر مووسا ئەدرەگانی، مـیر سـینان مـاملی و مـیر شـبـان کرمـانی هـاوچـەرخی راسـل سـهارسی دووەم و سیوا جونێن و حەزرەتی محەمەد مستەفا بوون.

پاشابوونی پوران دوخت:

لە دوا سـەردەمی سـەڵتـەنەتی سـاسـانییـەکان هـاوچەشـنی دوا سـەردەمـەکـانی سـەڵتـەنەتی هـەخـامـەنشی و ئـەشکانییـەکان، زنجـیرەیەک شـۆڕش و یاخـیگەری لە وڵاتی پـارس سـەری هـەڵدابوو کـە لە ئـەنجـام بـووە هـۆی ڕووخـانی پاشـایەتیی ساسانییەکان.

دوای کبـادی دووەم، دەسەڵاتداران و کاربەدەسـتانی سـەڵتەنەت "پوران دوخت"ی کچی خـەسـرۆ پەروێزیان هێنایە سـەر تەخت و دوای دوو سـاڵ لەسـەر تـەختـیـان لابرد.

کۆچی حەزرەتی محەمەد مستەفا پەیامبەری ئیسلام و ماڵئاواییان:

لە سـەردەمی فەرمانڕەوایی راسـل سـهارسی دووەم، پەیامـبەری ئیسلام محەمەد مـسـتـەفـا "د.خ" لە ڕۆژی دووشـەمی یەکەمی ڕەبیـعولئـەوەل لـە مـەککەوە بۆ مـەدینە کۆچی کرد. هۆکاری کۆچکردنەکە ئەوە بوو کە ستەم و زۆرداریی کافرەکان لەسەر موسڵمانەکان لە مەککە زۆر سـەخت بووبوو و تەنگیان پێ هەڵچنی بوون. حەزرەتی پەیامبـەر سـڵاوی لێ بێ هـیـچ ڕێگەچارەیەکی تری نەبینـی جگە لە کـۆچ کـردن. بەم شـێوەیە، کۆچیان کرد و لـە مـەدینە نیشـتـەجێ بوون و تا ١٠ سـاڵ پڕوپاگەندەی ئیسـلامی بەردەوام کرد. لە ئاکامی ئەمـەش، دوورگەی عـەرەب بە تیشکی ئیسـلام ڕۆشن بووەوە و حـەزرەتی محـەمەد مـسـتـەفـا "د.خ" لە ١٢ەی مـانگی ڕەبیـعولئـەوەلی سـاڵی ١١ەی کۆچی ماڵئاوایی لە دنیای فانی کرد.

پاشابوونی ئارزمی دوخت:

دوای دەرکردنی پوران دوخت، ئەندامـان و کاربەدەسـتانی سەڵتەنەتی پارس خوشکەکەیان کە ناوی "ئارزمی دوخت" بوو هێنایە سەر تەخت. بە تەختنشینی ئارزمی دوخت، شـۆڕش و یاخـیگەری لە باقـیی وڵاتی پارس بنبـڕ نەبوو بگرە زیاتریش پەرەی سـەند. ئەندامـان و کـاربەدەسـتـانی بنەمـاڵەی سـاسـانی بۆ بەدەستـهێنانی تەخت و دەسەڵات هـەریەکەیان بۆ خۆی دەست بەکار بوو و لەناو یەکدا کەوتنە لێکدانی یەکتر.

لە سـەردەمی ئارزومی دوخت ڕۆژی ئیسـلام لە دوورگـەی عـەرەب هـەڵاتبـوو و خەڵکانی ئەوێ ئیسلامیان قەبووڵ کردبوو.

راسل سهاسی دووەم:

راسل سهاسی دووەم لە شەڕی پاشای نیمروز کوژرا. ئەو وجاخ کوێر بوو لەبەر ئەوە دەسـەڵاتداران و کـاربەسـتـانی وڵاتی سندان برایەکـەیان کـە نـاوی راسل سهاسی دووەم بوو هێنایە سەر تەخت.

راسل سهاسی دووەم خووڕەوشت باش بوو و چاکەی لەگەڵ خەڵک کرد و باجی لەسـەر کـەم کـردنـەوە. چاکسـازیی کـشـتـوکـاڵی ئەنجـام دا و دوای ١٠ سـاڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد.

سیوا ئەسیار میری توران و مەکران:

کـاتێک سـیوا جونین لـەگەڵ راسل سـهارسـی دووەم لە شـەڕی پاشـای نیـمروز گیانی لەدەست دا، کوڕەکەی، سیوا ئەسیار هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران و مـەکران. لە سـەردەمی سـیوا ئەسیـار، پاشـای سندان راسـل سـهاسـیی دووەم بە وجاخ کوێری کۆچی دوایی کرد و وەزیرەکەی چەچ کوڕی سیـلایچ کـە پیـاوێکی زیرەک و زانا و هۆشـمەند بوو و دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی گرتە دەست و ئەندامان و کاربەدەستانی دەوڵەتی هان دا کە گوێڕایەڵی دەسەڵاتداریی ئەو بکەن.

سـیـوا ئەسـیـار ١٥ سـاڵ فـەرمـانڕەوایی کـرد و کـۆچی دوایی کـرد. ئەم سەرۆکانەی تیرەکانی کوردی بەلوچ: میر جان بێگ براخۆیی، میر سوید زەنگەنە،

میر لادین ئەدرەگانی، میر کویان ماملی و میر وان کرمانی هاوچەرخی راسل سهاسی دووەم و سیوا ئەسیار بوون. ئەم سەرۆکانەی کورد هاوچەرخی میری موسڵمانانیش ئەبوبەکر خوا لێی رازی بێت بوون.

## بەشی دەیەم

## [کوردە بەلوچەکان لە سەردەمی ئیسلامدا]

خیلافەتی میری موسڵمانان ئەبوبەکر (خ):

کاتێک حەزرەتی محەمەد مستەفا ماڵئاوایی کرد، ڕۆژی سێشەم میری موسڵمانان ئەبوبەکر هاتە سەر سەقیفەی بەنی ساعدە.[15] بەر لە هەموو کەس عومەری کوڕی خەتاب گوێڕایەڵی خەلیفایەتیی بوو. ئینجا ئەنسارەکان بەر لە ناشتنی ڕەسووڵ گوێڕایەڵی خەلیفایەتیی بوون.

ئەبوبەکر لەسەر کردەوە و ڕەوشتی پەیامبەر محەمەد "د.خ" ڕۆیشت و فەرمانەکانی خیلافەتی لەسەر بنەمای قورئان و شەریعەت دەر دەکرد. دژی لە دین هەڵگەڕاوەکان جەنگا و دووبارە گەڕاندیانیەوە بۆ سەر دینی ئیسلام و دینی ئیسلامی لەسەر بنەمای بەهێزدا وەستاند.

کاتێک نزیکی دوا هەناسەکانی ژیان بووەوە، عومەری کوڕی خەتابی بە جێنشینی خۆی هەڵبژارد و ددانی بە خەلیفایەتیکردنی نا و نوسخەی ئەم فەرمانەی بۆ هەموو شوێنێک نارد. بەم شێوەیە، دوای دوو ساڵ و دوو مانگ لە تەمەنی ٦٢ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و عومەری کوڕی خەتاب، عوسمانی کوڕی عەفان، تەلحەی کوڕی عوبێدوڵڵا و عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی بەکر تەرمەکەیان لەلای گۆڕی مستەفا "د.خ" دا ناشت.

خیلافەتی میری موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب "خ":

دوای کۆچی دوایی میری موسڵمانان ئەبو بەکر "خ"، پەنابەرەکان و ئەنسارەکان گوێڕایەڵی دەسەڵاتداریی عومەر بوون. عومەر ئیسلامی لەسەر بنەمای شەریعەت و خووڕەوشت و ئاکاری پەیامبەر محەمەد "د.خ" پەیڕەو کرد و

---

١٥. میمبەری دیوانی بەنی ساعدە.

یەزدانی مەزن شاری زۆری بە دەستی ئەو داگیر کرد و ماڵ و دارایی فراوان لە بەیتولمالی موسڵمانان کۆ بووەوە. بە هەڵسانی ئەو بڵێسەی لە ڕێ دەرچوون کوژایەوە و دواکەوتوویی دوایی هات.

یەکەم جار "جەسەر"ی داگیر کرد و پاشان سوپای نارد شام داگیر بکەن. ئیسلام بەهێز بوو و سەرکەوت و کوفر لەناوچوو. عەتبەی کوڕی غەزوانی نارد ئوبلە و فورات داگیر بکات، سەعد کوڕی ئەبی وەقاسی ناردە قادسیە. ڕۆستەم سوپاسالاری یەزد گوردی شای عەجەم بە سوپایەکی گەورەوە بۆ ئەوێ هات. بەڵام شکستی خوارد و سەعد عەجەمی داگیر کرد.

دوای ئەوە، فەرمانی دا کوفە و بەسرە داگیر بکەن. دەسەڵاتدارەکانی قەنسرین، ڕەها، سمیسات، حمس، جەندی شاپور، سوس، رام هورموز، تەستەر، سوپاهان، قوم و قاشانیان چ بە نامە و ئاشتی و چ بە شەڕ داگیر کرد. ئینجا مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانی نارد قەیساریە و ڕەملێ داگیر بکات، نامەی بۆ عەمری کوڕی عاسی نارد ئەسکەندەرونە داگیر بکات و نوعمان کوڕی مەقرونی نارد نەهاوەند داگیر بکات. پاشان عەمری کوڕی عاسی ناردە بەرقە بۆ ئەوەی بەرقە و ئەترابلس داگیر بکات و موغەیرە شەعبەی نارد ئازەربادجان داگیر بکات.

دوای ئەوەی کار بەو شوێنە گەیشت، بەیانیی ڕۆژی چوارشەمی مانگی زیلحەجە لەسەر نوێژ ویستی تەکبیر بڵێ کە "لوئلوء" خزمەتکاری موغیرەی کوڕی شوعبە سێ جار خەنجەری لێ دا، عومەر ژانێکی سەخت دای گرت و عەبدوڕەحمان عەوفی بەدەست گرت تا نوێژەکەی تەواو کرد. ئینجا عوسمان و عەلی و تەڵحە و زوبێر و سەعد و عەبدوڕەحمانی بانگ کرد و پێیانی گوت لەنێو خۆتاندا چەند کەس پێشنیاز بکەن و ئەوەی ڕای هاوڕێیانی بەدەست هێنا بیکەن بە خەلیفە.

عومەر دوای ئەوە کۆچی دوایی کرد. تەمەنی ٦٥ ساڵ بوو و سەردەمی خیلافەتیشی لە دە ساڵ و شەش مانگ پێک هاتبوو. سوعەیب نوێژی لەسەر خوێند و عوسمانی کوڕی عەفان و عەبدوڵڵای کوڕی لە سەرای عائیشە لای گۆڕی ئەبوبەکر ناشتیان.

ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر مهرداد براخۆیی، میر

سەوید زەنگەنە، میر پاتاک ئەدرەگانی، میر بەرزنج مالی و میر جودک کرمانی هاوچەرخی میری موسڵمانان حەزرەتی عومەر بوون

پاشابوونی یەزد گوردی سێیەم:

دوای دەرکردنی ئارزومی دوخت، ئەندامان و کاربەدەستانی سەڵتەنەتی ساسانی یەزد گوردیان کرد بە پاشا. هێشتان چارەکە سەدەیەک بەسەر دەرکەوتنی ئیسلام تێ نەپەڕیبوو کە میری موسڵمانان خەلیفە ئەبوبەکر سدیق کۆچی دوایی کرد و میری موسڵمانان حەزرەتی عومەر هاتە سەر تەختی خیلافەت و لەشکری جیهانگر و دلێری عەرەب شاهەنشای دێرینەی ساسانییەکانی پارسیان لەناوبرد.

یەزد گوردی سێیەم دوا پاشای ساسانییەکان پاش شەڕەکانی قادسیە، مەداین، جەلەولا و نەهاوەند هاتە خوراسان و داوای یارمەتیی لە پاشای ماوەرالنەهر کرد، بەڵام هیچ هاوکارییەکی لێوە بەدی نەکرد. ئەحنەف کوڕی قەیس بە فەرمانی خەلیفە عومەر بە دوایدا چوو و توانی سەرزەویی خوراسان داگیر بکات. یەزد گورد ناچار لەبەر بەدواکەوتنی ئەحنەف چووە مەڕۆ و پەنای بۆ ماهوا سوری برد. ماهوا سوری دەسەڵاتداری خوراسان بوو و لە بەهێزبوونی پێوەندیی یەزد گورد لە تەک دەسەڵاتدارەکانی پشت ئامویە دەترسا. بۆیە بە دەست ئاشەوانێک لە مەڕۆ بە کوشتی دا و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتداریی خۆی تا بەلخ و هیرا و بوخارا فراوان کردەوە. بوخارا بە دەستی کریسون سوپاسالاری ماهوا سوری داگیر کرا.

لەملاوە ئەحنەف ماهوا سوریی لە خوراسان و مەڕۆوە تا ئەوبەری جیحون کشاندە دواوە. هەر لەو کاتە، لەلای باشوورەوە لەشکری عەرەب بە سەرۆکایەتیی عەبدوڵڵا کوڕی بەدەیل خەزاعی تا گەرمیان هاتبوونە پێش. دەستەیەکی تری لەشکری عەرەب بە سەرۆکایەتیی عەبدوڵڵا کوڕی عامر پاش داگیرکردنی کرمان، هێرشیان بردە سەر سەجستان. دادوەری سەجستان لە شاری زەرەنگ کە ناوەندی سەجستان بوو خۆی داڵدە دا. بەڵام لەبەرئەوەی لەشکری ئیسلام تا قەندەهار و هیند و سند و توران و مەکران هاتبوونە پێش، ناچار ئاشتیی کرد و زەرەنگ کەوتە دەست موسڵمانان.

عاسم کوڕی عەمر جێگری سالاری عەبدوڵڵا کوڕی عامر سەجستانی داگیر کرد. میرێکی تری سوپای عەرەب بە ناوی حەکەم کوڕی عەمر سەعلەبی هێرشی هێنایە سەر مەکران و لەگەڵ راسل فەرمانڕەوای سندان و توران و مەکران لە دۆڵی هلمەند ڕووبەڕوو بووەوە و توانی بیکوژێت و مەکران داگیر بکات.

راسل چەچ کوڕی سیلایج:

راسل سەهاسی دووەم بە وجاخ کوێری کۆچی دوایی کرد. لەبەر ئەوە، چەچ کوڕی سیلایج کە وەزیری راسل سەهاسی دووەم بوو خەڵکی هان دا کە ملکەچی دەسەڵاتداریی ئەو بن. کاتێک لەم هەوڵەدا سەرکەوت، ژنی سەهاسی دووەم "سوهندیان"ی خواست و جاڕی پاشایەتیی خۆی لێ دا و هاتە سەر تەخت.

شەڕ لەگەڵ رانون مهرتون:

وڵاتی چتور پوران هاوسێی وڵاتی سندان بوو. فەرمانڕەوای ئەم وڵاتە رانون مهرتون لەگەڵ راسل سەهاسی دووەم خزمایەتیی هەبوو و خۆی بە مافداری وڵاتی سندان دەزانی. لەبەر ئەم هۆیە چوو بۆ شەڕی سندان. چەچ کوڕی سیلایج خۆی بەشداری شەڕی کرد. پیاوێک بوو هیچ کەس نەیدەتوانی لە بەرامبەری ڕاوەستێ و زۆری کوشت و تەنانەت بە نێزە لە رانون مهرتونیشی دا. لێدانەکەی بە چەشنێک بەهێز بوو کە رانون لەسەر پشتی هەسپەکەی کەوتە خوارێ و لە بەردەم چەچ ڕای کرد. بەم شێوەیە شکستی خوارد و لە هەمان کات نوێنەری نارد و ئاشتیی کرد.

چەچ دوای چل ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد و لە دوای خۆی دوو کوڕی بە ناوی "داهرو" و "هەرسینە" بە جێ هێشت.

سیوا مایین میر توران و مەکران:

سیوا ئەسیار بە وجاخ کوێری کۆچی دوایی کرد و برایەکەی، سیوا مایین هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران و مەکران. لە سەردەمی مایین، سەهاسی دووەم کۆچی دوایی کرد و وەزیرەکەی، چەچ کوڕی سیلایج بوو بە پاشای سندان. چەچ سوهندیانی ژنی سەهاسی دووەمی بە ژن خواست و فەرمانڕەوایی سیوا مایینی لە توران و مەکران بەردەوام کرد.

سیوا مایین لە دۆڵی هلمەند لە شەڕی لەشکری ئیسلام کوژرا و لە جێگەی ئەو سیوا زوراک هاتە سەر تەخت.

هێرشی لەشکری ئیسلام بۆ سەر سەجستان و مەکران:

لە دوا سەردەمی میری موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب، دەستەیەک سەربازانی عەرەب بە سەرۆکایەتیی حەکەم کوڕی عەمر سەعلەبی دوای داگیرکردنی سەجستان هێرشیان هێنایە سەر مەکران. فەرمانڕەوای مەکران سیوا مایین لەگەڵ لەشکری خۆی و لەشکری راسل چەچ کوڕی سیلایج فەرمانڕەوای سندان لە دۆڵی هلمەند ڕووبەڕووی لەشکری ئیسلامی بوونەوە. لەم شەڕە خوێناوییەدا، سەرلەشکری راسل چەچ کوڕی سیلایج کە ناوی مونا بوو و والیی توران و مەکران سیوا مایین شکستیان خوارد و کوژران.

لەشکری ئیسلام لەشکرەکانیشیان لەناوبرد و وڵاتی مەکرانیان داگیر کرد و بناخەی ڕێژیمی ئیسلامییان دامەزراند. دوای ئەوە لەشکری ئیسلام سەرزەویی مەکرانیان گۆڕی بە مەڵبەندی سوپای ئیسلامی.

ئەم سەرۆکانەی کوردە بەلوچەکان: میر تیرداد براخۆیی، میر سەوید زەنگەنە، میر تاپاک ئەدرەگانی، میر بەرزنج ماملی و میر جودک کرمانی هاوچەرخی چەچ کوڕی سیلایج فەرمانڕەوای سندان و میرسیوا مایین والیی توران و مەکران و میری موسڵمانان خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب بوون.

گوێڕایەڵبوونی کوردە بەلوچەکان بۆ میری موسڵمانان حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب:

لە سەردەمی خیلافەتی میری موسڵمانان حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب، سەرلەشکری ئیسلامی حەکەم کوڕی عەمر سەعلەبی مەکرانی داگیر کرد و هەر لە مەکران بوو کە میرانی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر مهرداد براخۆیی، میر سەوید زەنگەنە، میر پاتاک ئەدرەگانی، میر بەرزنج ماملی و میر جودک کرمانی هەڵسان بە ناردنی میر سیاوش برای میر مهرداد براخۆیی وەکو نوێنەر بۆ لای حەکەم کوڕی سەعلەبی و ئەویش مەرجەکانی کوردی بەلوچی بۆ گوێڕایەڵکردن خستە بەرچاوی.

مەرجەکانی کوردە بەلوچەکان ئەمانە بوون: کە کوردە بەلوچەکان دینی ئیسلام قەبووڵ دەکەن و هاوکاریی عەرەبەکان دەکەن، لە وەڵامی ئەم هاوکاریکردنەش دەبێ عەرەبەکانیش ئەوان لەو دۆڵانەی کە لێی نیشتەجێن دەرنەکەن و بەرەو دەشتەکانی تر نەگوازنەوە. حەکەم کوڕی عەمر سەعلەبی ئەم مەرجانەی لە نامەیەکدا نووسی و بە یەکێک لە تەتەرەکانی نارد بۆ مەدینە بۆ لای خەلیفەی ئیسلام عومەری کوڕی خەتاب. میری موسڵمانان عومەری کوڕی خەتاب پەیماننامەکەی قەبووڵ کرد و کوردە بەلوچەکان لە دۆڵەکانی توران و مەکران و سەجستان کە نشینگەی باپیرانیان بوو مانەوە و دینی ئیسلامیان قەبووڵ کرد.

خیلافەتی میری موسڵمانان عوسمان کوڕی عەفان:

پاش ناشتنی عومەر، عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب و زوبێر کوڕی عەوام و تەڵحە کوڕی عەبدوڵڵا و عەبدورەحمان کوڕی عەوف و سەعد کوڕی ئەبی وەقاس و عوسمان کوڕی عەفان لەسەر خیلافەت ڕاوێژکارییان کرد. عوسمان بە عەبدورەحمانی گوت تۆ دەسەڵاتی خیلافەت بگرە دەست. بەڵام عەبدورەحمان گوتی من ناتوانم. پاشان عەبدورەحمان پێشنیازی کرد سێ ڕۆژ مۆڵەت دابنێن بۆ دەستنیشانکردنی کەسێکی چاک. پاش ئەوەی ڕاپرسی هاوکارانیان کرد و ماوەکە بەسەر چوو، لەسەر ئەوە ڕێک کەوتن کە عوسمان هەڵبژێرن.

عوسمان لە دین و دادپەروەری و دادڤانی و دابەشکاری دا بە شوێن پێی خەلیفەکانی پێش خۆی داچوو. یەکەم ناوچە کە لە سەردەمی خیلافەتی عوسمان دا داگیر کرا هەمەدان بوو. هەرچەند هەمەدان لەسەردەمی عومەر دا داگیر کرابوو بەڵام دیسان هەڵگەڕابوونەوە. بۆیە عوسمان هەرلە ڕۆژگاری مردنی عومەر دا، موغەیرە شەعبەی نارد کە ئەوێ داگیر بکات. پاشان موسا ئەشعەری نارد ڕەی داگیر بکات. عوسمان پاشان موسا ئەشعەری لە دەسەڵاتداری بەسرە و عوسمان کوڕی ئەبی ئەلعاسی لە دەسەڵاتداری فارس دەرکرد و دەسەڵاتداری بەسرە و فارسی دایە عەبدوڵڵا کوڕی عەمر کوڕی کریز.

عەبدوڵڵا تەمەنی ٢٥ ساڵ بوو و سەرەتا هاتە بەسرە و چەند ڕۆژێک لێرە مایەوە و چووە پارس. لە بەسرە زیاد کوڕی ئەبیەی بەجێ هێشت کە لەوە پێش جێگری بوو و عەبدوڵڵا کوڕی موعەمەر تەمیمی سوپاسالاری بوو.

پاش تێپەڕبوونی سێیەم ساڵ بەسەر کۆچەکەی محەمەد مستەفا "د.خ"، عەبدوڵلا کوڕی عەمر کوڕی کریز "مجاشع"ی بۆ سیستان نارد و شەڕیان کرد و موسڵمانێکی زۆریان کوشت و پاشان مجاشع گەڕایەوە.

حەزرەتی عوسمان کوڕی عەفان یازدە ساڵ لە تەختی خیلافەت مایەوە و پاشان بەرهەڵستکارەکانی شەهیدیان کرد. ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر مەروان براخۆیی، میر خەلەف زەنگەنە، میر ئالاک ئەدرەگانی، میر تاکول ماملی و میر ئاکول کرمانی هاوچەرخی بوون.

شۆڕشی خەڵکی کابلستان و زابلستان:

لە سەردەمی خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەفان خەڵکی زابلستان شۆڕش و یاخیگەرییان بەرپا کرد. میری زابلستان عەبدوڵلا کوڕی عومەیر شۆڕشەکەیانی لەناوبرد و شکستی دان و کابولی دیسان داگیر کردەوە.

مجاشع کوڕی مەسعوود دەسەڵاتداریی کرمان لەگەڵ هۆزەکانی کێوەکانی قەفەس کە کوردی بەلوچ بوون و بە تیرەی کوچ و بەلوچ بەناوبانگ بوون تێک هەڵچوو و دوای چەندین شەڕی سەخت گوێڕایەڵی کردن. کوردە بەلوچەکانی توران و مەکران لەگەڵ ئەوەیشی کە بووبوونە موسڵمان، لە شەڕی کێوەکانی قەفەس یارمەتیی کوردەکانی خۆیان دا، بەڵام سەرنەکەوتن.

هاتنی عەبدوڕەحمان کوڕی سەمەرە بۆ مەکران:

کاتێک میری موسڵمانان حەزرەتی عوسمان کوڕی عەفان هاتە سەر تەختی خیلافەت، عەبدوڕەحمان کوڕی سەمەرەی نارد بۆ مەکران. عەبدوڕەحمان لێرە چەند ماوەیەک مایەوە و چاکەی لەگەڵ خەڵک کرد. لەو کاتە، فەرمانڕەوای سندان چەچ کوڕی سیلایج قشونی خۆی هێنابووە سەر سنووری مەکران و هەڕەشەی هێرشی بۆ سەر مەکران کرد.

عەبدوڕەحمان کوڕی سەمەرە کاتێک ئاگەرداری ئەم هەواڵە بووەوە، هێرشی هێنایە سەر دوژمن و لە شەڕێکی سەخت شکستیانی دا و لە سنورەکانی مەکران دەریانی کرد. پاش ئەوە چووە کابل بۆ ئەوەی ئەو شۆڕشەی لەوێ بەرپا بووبوو لەناو ببات.

هاتنی عوبێدوڵڵا کوڕی موعەمەر بۆ مەکران:

دوای عەبدوڕەحمان کوڕی سەمەرە، میری موسڵمانان عوبێدوڵڵا کوڕی موعەمەری بۆ مەکران نارد. ئەو هاتە مەکران و فەرمانڕەواییی کرد. بە ئازایی و جوامێریی خۆی چەندین ناوچەی داگیر کرد و تا سنووری وڵاتی هیندەکان چووە پێش.

خیلافەتی میری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب:

دوای شەهیدبوونی حەزرەتی عوسمان کوڕی عەفان، عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب هاتە سەر تەختی خیلافەت. ئەو هەموو کاربەدەستانی عوسمانی کوڕی عەفانی لە سەڵتەنەتی ئیسلامی دەرکرد و لە جێگەی ئەوان کاربەدەستانی خۆی نارد.

عوبێدوڵڵا کوڕی موعەمەر کاتێک هەواڵی عوسمانی پێ گەیشت، لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی ڕاوێژی کرد و گوتی ناچارە بچێت بۆ لای عەبدوڵڵا کوڕی عامر. عوبێدوڵڵا پاشان "ئەمیر کوڕی ئەلئەحسەر ئەلتیکری"ی کرد بە دەسەڵاتداریی مەکران و خۆیشی چوو بۆ لای عەبدوڵڵا کوڕی عامر. کاتێ گەیشتە بەسرە، شەڕی "جەمل"یان دەکرد و عەلی سەرقاڵی ئەو شەڕە بوو. عوبێدوڵڵا کاتێ ئەمەی بینی خۆی شاردەوە تا ئەو کاتەی عەلی لەو شەڕە دەست بەتاڵ بوو. پاشان بەو ماڵ و دارایییەی کە پێی بوو چوو بۆ شام بۆ لای مەعاویە و دیارییەکی زۆری دایە مەعاویە و لەوێ مایەوە. کاتێک میری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب بیستی کە ئەو هاتووە و چووە بۆ لای مەعاویە، " ساغر کوڕی زەعر "ی بۆ مەکران نارد. پاش ئەوە، میری موسڵمانان عەلی بە دەستی عەبدوڕەحمانی کوڕی مەلجەم کوژرا. تەمەنی ٦٢ ساڵ بوو و ماوەی خیلافەتەکەی لە چوار ساڵ و نۆ مانگ پێک هاتبوو.

سیوا زوراک میری توران:

دوای کوژرانی سیوا ماین لە شەڕی دۆڵی هلمەند، کوڕەکەی، سیوا زوراک هاتە سەر تەختی میرنشینیی توران. لە سەردەمی فەرمانڕەواییی زوراک، کاربەدەستانی ئیسلامی ولایەتی مەکرانیان هێنابووە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. لەبەر ئەوە میر زوراک تەنیا میری توران بووە.

لە سەردەمی میر زوراک، ساغر کوڕی زەعەر هێرشی هێنایە سەر کیکانان. میر زوراک توانی شکستی بدات و بەرەو دواوە پاشەکشەی پێ بکات.

هاتنی ساغر کوڕی زەعەر بۆ مەکران:

میری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ساغر کوڕی زەعەری بۆ مەکران نارد. ساغر چەند ماوەیەک لێرە مایەوە و کاروباری ئێرەی چاک کردەوە و پاشان لە زنجیرە چیای کوردانەوە هێرشی هێنایە سەر خاکی توران و هاتە ناو شاری کیکانان. سیوا زوراک بە لەشکرێکی بیست هەزارییەوە هاتە پێش و شەڕێکی سەختی لەگەڵیاندا کرد. موسڵمانەکان زۆریان لێ کوژرا و بە دیل گیران و هەندێکیش رزگاریان بوو.

لەو کاتە، ساغر کوڕی زەعەر ئاگەدار کرایەوە کە میری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب بە دەستی عەبدورەحمان کوڕی مەلجەم لێی دراوە و برینداو بووە و پاشان مردووە. لەبەر ئەوە لە مەیدانی شەڕ پاشەکشەی کرد و چووە مەکران.

ئەم میرانەی کوردە بەلوچەکان: میر شیراک براخۆیی، میرا بەکر زەنگەنە، میر بازوک ئەدرەگانی، میر جورکان ماملی و میر حوسە کرمانی هاوچەرخی سیوا زوراک و میری موسڵمانان عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب بوونە.

بەنی ئومەیە:

بەنی هاشم و بەنی ئومەیە بەرەی دوو برا بوونە و باپیرە گەورەیان هاشم و عەبدولشەمس کوڕی عەبدولەناف بوونە. ئومەیە کوڕی عەبدولشەمس و عەبدولموتەڵیب کوڕی هاشم هاوتەمەن و هاوچەرخی یەک بوونە.

بەنی ئومەیە وەکو بەنی هاشم لە تیرە بەرجەستە و کاریگەرەکانی قورەیش بوونە. لەوە پێش ماوەیەکی درێژ لە نێوان ئەم دوو تیرەیە لەسەر سەرپەرشتیی ماڵی کەعبە و مەککە کێشە دروست بووبوو بەڵام بە هۆی ناوبژیوانیی سەرداران و ریشسپیانی تیرەکانی تری قورەیش لە نێوانیاندا ئاشتی کراوە. ئەمەش لە ئەنجامی رێک کەوتن لەسەر دابەشکردنی ئەرکەکانی بەڕێوەبردنی ماڵی کەعبە و مەککە بە چەشنێک کە سەرکردایەتیی سەربازی واتە پلەی سوپاسالاری قورەیشیان راسپاردە میری تیرەی بەنو ئومەیە و ئەرکی سەرپەرشتیکردنی ماڵی

کەعبەشیان داوە بە میری بەنی هاشم.

ئومەیە کوڕی عەبدولشەمس و عەبدولموتەڵیب کوڕی هاشم هاوچەرخی یەک بوونە و بە هەمان شێوە پەیامبەری ئیسلام حەزرەتی محەمەد مستەفا "د.خ" و ئەبوسوفیان نەوەی کوڕی ئومەیە هاوچەرخی یەکتری بوونە. لەو شەڕانەی لە نێوان موسڵمانەکان و قورەیشی مەککە رووی داوە لە سەردەمی سەرەتایی ئیسلامدا، ئەبوسوفیان میری رێژیمی لەشکری قورەیش بووە و قورەیش لەژێر رێبەرایەتیی ئەبوسوفیان دژی موسڵمانەکان جەنگاون. بەڵام پاش ئەوەی موسڵمانەکان مەککەیان داگیر کرد، ئەبوسوفیان بووە بە موسڵمان و محەمەد مستەفا "د.خ" مەعاویەی کوڕی ئەبوسوفیانی کردووە بە نووسیاری سروش.

لە سەردەمی خیلافەتی ڕاشیدە، میران و سەرداران و گەورانی بەنی ئومەیە بۆ سەرفرازی و سەرکەوتنی ئیسلام ڕاژەکاریی شایانی ستایشیان ئەنجام داوە. عومەری کوڕی خەتاب لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیانی بە نوێنەری دیمەشق داناوە و پاش کۆچی دوایی ئەو مەعاویە لەسەر ئەم پلەیە جێنشین بووە. دوای شەهیدبوونی عوسمان کوڕی عەفان، میر مەعاویە سەربەخۆ بووە و لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب بووە شەڕ و کێشەی و پاش شەهیدبوونی عەلی بنەمای فەرمانڕەوایی بنەماڵەی بەنی ئومەیەی دامەزراندووە.

دانیشتنی مەعاویە لەسەر تەختی خەلیفایەتی:

دوای شەهیدبوونی میری موسڵمانان عەلی، خەڵکی کوفە گوێڕایەڵی دەسەڵاتداریی حەسەن کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب دەبن. کاتێک هەواڵی کوژرانی عەلی گەیشتە شام، خەڵکی شام گوێڕایەڵی دەسەڵاتداریی مەعاویە بوون. مەعاویە لە "بایلیا"وە هاتە دیمەشق و لەوێشەوە هاتە کوفە. حەسەن کوڕی عەلی لە کوفە چووە دەرێ و لە ئەنبار لەگەڵ مەعاویە بە یەک گەیشتن و لەسەر چەند مەرجێک ئاشتییان کرد. حەسەن دەستی لە دەسەڵاتدارێتی هەڵگرت و مەعاویە پاشایەتیی بە تەنیا بۆ مایەوە و دوای ئەوە چوو بۆ مەدینە.

هاتنی عەبدوڵڵا سوار ئەلعەبدی بۆ مەکران:

کاتێک مەعاویە دەسەڵاتی گرتە دەست، عەبدوڵڵای کوڕی سوار ئەلعەبدی بە

چوار هەزار سوارەوە لە ولایەتی مەکران دامەزراند و پێی گوت لە ناوچەی توران شاخاوییەک بە ناوی کیکانان هەیە و لەوێ هەسپی بەرز و ڕێک ئەندام هەیە و لەو هەسپانە بنێرەوە ئێرە. هەروەها، ئاگەداری کردەوە کە خەڵکی ئەم ناوچانە بە هۆی سروشتی ناوچە شاخاوییەکەیان یاخیگەری و سەرسەختی دەکەن.

عەبدوڵڵای کوڕی سوار ئەلعەبدی بە چوار هەزار لەشکری سوارەوە هاتە مەکران و لێرە چەند ماوەیەک مایەوە. مەعاویە پاشان عومەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری بۆ داگیرکردنی ئەرمابیل نارد و ئەویش هاتە مەکران.

هێرش بۆ سەر توران:

عەبدوڵڵا کوڕی سوار ئەلعەبدی بە هاوەڵیی عومەری کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی عومەر ڕووی کردە توران و لە کاتی سەفەردا لەناو لەشکرەکەیدا هیچ کەس بۆی ئاگر بکاتەوە، لەبەرئەوەی توێشە و خواردنی دروستکراو و ئامادەکراویان پێ بوو. شەوێک لە شەوەکان بڵێسەی ئاگر لەناو لەشکردا پەیدا بوو. پشکنینیان ئەنجام دا و دەرکەوت کە ژنێکی دووگیان منداڵی بووە و پێویستی بە ئاگر بووە و عەبدوڵڵاش ئیزنی دا.

کاتێک گەیشتە ناوچەی کیکانان، سیوا زوراک بە لەشکرێکی سی هەزار نەفەرییەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەیان هاتە پێش. لەشکری ئیسلام بەسەریاندا زاڵ بوو و شکستیانی دا و دەسکەوتێکی زۆریان گرت. لەشکری زوراک کۆ بوونەوە و دەوی کێوەکانیان گرت و شەڕ تیر تر بووەوە و کیکانییەکان شەڕی چەپاولیان دەست پێ کرد.

عەبدوڵڵا کوڕی سوار ئەلعەبدی لەگەڵ کۆمەڵی سەربازە چەکدار و تایبەتەکان وەستا و هاواری کرد " ئەی کوڕانی ئیسلام! لە کافرەکان هەڵنەگەڕێنەوە، بۆ ئەوەی بڕواتان زیانی پێ نەگات و شەهید ببن". لەشکری ئیسلام لە دەور بەیداخ و ئالای عەبدوڵڵا کوڕی سوار کۆ بوونەوە و پیاوێک لە بەنی عەبدولقەیس لە سوپا هاتە دەر و داوای شەرکەرێکی لە دوژمن کرد. سەرۆکی دوژمن لە بەرامبەری وەستا. "یاسر کوڕی سوار"یش لەگەڵ بەنی عەبدولقەیس چوو و هێرشیان بردە سەر ئەو سەرۆکە و کەواندیان. لەشکری زوراک هەموو دەرکەوتن و لەشکری ئیسلام شکستی خوارد و هەموو کۆسارەکان لە مردووی سوپا پڕ بوو.

عەبدوڵڵای کوڕی سـوار ڕووبەڕووی گەنجێک بووەوە. هەرچەند ئەسـحابەکانی هێرشیـان کرد و زۆریـان لە دوژمنان کوشت، عـەبدوڵڵا دوای ژانێکی زۆر شـەهید بوو. دوای شەهیدبوونی ئەویش، موسڵمانەکان گەڕانەوە مەکران.

سـیـوا زوراک دوای سـەرکـەوتن بە تـەپڵ لێـدانەوە هـاتەوە قـەڵای کـیکان و دەسکەوتە فراوانەکەی لە نێوان سەربازانی لەشکرەکەیدا دابەش کرد.

هاتنی سەنان کوڕی سەلەمە بۆ مەکران:

دوای ئەوەی عـەبدوڵڵا کوڕی سوار ئەلعەبدی شـەهیـد بوو، مـەعاویە نـامـەی بۆ زیاد نارد و داوای لێ کرد پیاوێک هەڵبژێرێت کە شایستەی سنووری هیند بێت. زیاد لە وەڵامـدا بۆی نووسی کـە پەسندکراوی من و شـایستـەی ئەو سنوورە دوو پیاون، ئەحنەف کوڕی قەیس و سـەنان کوڕی سەلەمـە ئەلهـەزلی. مـەعاویە سـەنان کوڕی سەلەمە ئەلهەزلی پەسند کرد و ئـەویش کوڕی سەلەمە ئەلهەزلی دیاری کرد. سەنان چوو بۆ مەکران و ماوەی دوو ساڵ لەوێ مایەوە و پاشان دەرکرا.

هاتنی ڕاشد کوڕی عەمر بۆ مەکران:

دوای ئەوەی زیاد هـەڵسـا بە دەرکردنی [سـەنان] کوڕی سـەلەمە، مـەعاویە ڕاشـد کـوڕی عـەمـری نارد بۆ دەسـەڵاتداریکردنی ولایەتی مـەکـران و کـردی بە نـوێنەر. ڕاشد کردەوەی چاکی ئەنجام دا و زۆری بۆ خەڵک هێنا تا فێری زانستی قورئان و تەفـسـیـر بـوون. دادپەروەریی پـتـەو کـرد و بە هـۆی ڕەوشت باشـیی زۆرێک لە گەبرەکان[١٦] بوون بە موسڵمان.

کاتێک ڕاشد کوڕی عەمر هاتە مـەکران، مـاڵ و داراییی کێوی "کوردەکان"ی بە دەست هێنا. پاشـان چووە کیکان و سـیـوا زوراک شـەڕی لەگەڵ کرد و شکستی خـوارد و گـەڕاوە وڵاتی سندان. ڕاشـد لە کیکان مایەوە و مـاڵ و داراییی پێشـوو و تازەی بەدەست هێنا. دەسکەوت و "بـەردە"کـانی دوژمن کـە بـە تاڵانی بردبوون بە چنگ هێنا و دوای یەک سـاڵ لەوێ گـەڕایەوە. لە سیـسـتـان تـێ پەڕی تا گـەیشـتـە چیـای مەنزەر و بەهرج. خـەڵکانی ئەم ناوچەیە گەلەکۆمەیـان کرد و نزیکەی پەنجا هەزار پیـاو کۆ بوونەوە و ڕێگەیان لێ گرتن و لە بەیانی تـا نوێژی عـەسـر شـەڕیان

---

١٦. ئاگرپەرستەکان

کرد و له ئەنجام ڕاشد شەهید بوو.

هاتنی جارێکی تری سەنان کوڕی سەلەمە بۆ مەکران:

کاتێک ڕاشد کوڕی عەمر شەهید بوو، زیاد جارێکی تر سەنان کوڕی سەلەمەی کرد بە نوێنەر و ناردی بۆ مەکران. فەرمانی پێ دا کە کاتێک گەیشتە ئەوێ توران داگیر بکات و هەموو بتخانە و پەرستگەی ئاگری ئاگرپەرستەکان وێران بکات، لەبەرئەوەی پەیامبەری ئیمە "د.خ" هیچی لێ نەهێشتوونەتەوە و هەموو کوفر و دینێک جگە لە دینی ئیسلام ڕیشەکێش کردووە و ئەوەیشی ڕیشەکێشی نەکردبێ لەگەڵیان بە سەرانە ئاشتیی کردووە.

سەنان کوڕی سەلەمە ماوەیەک لە مەکران مایەوە و هەندێک لە ولایەتەکانی بەهێز کرد تا گەیشتە ولایەتی کیکانان و شەڕی لەگەڵ سیوا بەرپا کرد. سیوا زوراک بە لەشکرێکی فراوانەوە هاتە پێش و شەڕێکی سەختی لەگەڵ کرد و یەزدانی مەزن موسڵمانەکانی سەرکەواند. سیوا زوراک خۆی کوژرا و کوڕەکەیشی کە ناوی سیوا سەنگین بوو هەڵات و لە کێوەکانی نورگان و بلبلان خۆی شاردەوە. سەنان بە دوای کەوت و قەڵای نورگانی گەمارۆ دا. سوپای سەنگین هاتنە پێش و شەڕێکی سەختیان کرد. سەنان ئەو ڕۆژە خۆی بەو شێوەیە دمجەنگی کە ڕۆستەم لە ڕۆژگاری خۆی جەنگابوو تەنانەت سیوا سەنگینیشی کوشت.

سەنان بۆ هەر شوێنێک بچووبایە، نەریت و ڕەوشتی باشی بەجێ دەهێشت تا گەیشتە ناوچەی بودها و خەڵکی بودها غەدریان لێ کرد و شەهید بوو.

راسل چەندەر برای چەچ:

دوای کۆچی دوایی چەچ، راسل چەندەری برای هاتە سەر تەختی وڵاتی سندان لەبەرئەوەی کوڕی چەچ داهر بچووک بووە.

راسل چەندەر کەسێکی بە دین بووە و پەیڕەوکاری دینی باوادایی بووە. لە سەردەمی چەندەر، موسڵمانەکان توران و مەکرانیان داگیر کردبوو و ئەم ولایەتانە بە سەڵتەنەتی ئیسلامییەوە لکابوون. دواین فەرمانڕەوای توران و مەکران سیوا زوراک و کوڕی ئەو سیوا سەنگین بوونە کە لەگەڵ سەنان کوڕی سەلەمەی والیی

مەکران کەوتوونەتە شەڕی سەختەوە و کوژراون.

سەنان کوڕی سەلەمە ولایەتی تورانی داگیر کردو بە قەڵەمڕەوی ئیسلامییەوە لکاند. راسل چەندەر بە هۆی لەدەستدانی ولایەتەکانی توران و مەکران زۆر خەفەتبار بوو و دوای حەفت ساڵ فەرمانڕەوایی کۆچی دوایی کرد. ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر شیراک براخۆیی، میر بەکەر زەنگەنە، میر بازوک ئەدرەگانی، میر جورکان ماملی و میر حوسە کرمانی هاوچەرخی راسل چەندەر و میر مەعاویە خەلیفەی بەنی ئومەیە بوونە.

هاتنی مەنزەر کوڕی جارود کوڕی بشر بۆ مەکران:

دوای شەهیدبوونی سەنان کوڕی سەلەمە، مەعاویە ولایەتی مەکرانی بە مەنزەر کوڕی جارود کوڕی بشر ڕاسپارد. ئەویش هاتە مەکران و چەند ڕۆژێک لێرە مایەوە و دەسەڵاتی میرنشینییەکەی گرتە دەست و پاشان بۆ شەڕ بەڕێ کەوت. ئەمەش وەکو ئەوە وایە جلەکەی بە دارەوە ئاوێزان بکات و بیدڕێنێ واتە عوبێدوڵلای کوڕی زیاد خەفەتبار بوو و گوتی ئەم هەنگاوەی مەنزەر باش نییە و ماڵئاوایی لێ کرد و بە دەم گریانەوە گوتی مەنزەر لەم سەفەرە ناگەڕێتەوە و دەکوژرێ.

پاش ئەوە، مەنزەر لەوێ بەڕێ کەوت و گەیشتە ولایەتی دوژمنان و لە سنووری توران نەخۆش کەوت و گیانی لەدەست دا. لەو کاتە کوڕی ئەو، حەکەم کوڕی مەنزەر لە کرمان بوو و مەنزەر بە نامە لەبارەی نەخۆشییەکەی خۆیەوە ئاگەداری کردبووەوە. برای مەنزەریش کاتێک ئاگەداری مردنی مەنزەر بووەوە، داوای لە عەبدولعەزیز کرد کە دەسەڵاتداری ئەو ولایەتەی بداتێ. حوجاج گەیشتە بەردەرگە و دەنگی بانگی نوێژ بەرز بووەوە. حوجاج ڕووی کردە عەبدولعەزیز و گوتی ئەگەر ئاوازی بانگ بەرگوێم نەکەوتایە برایەکەیم سزا دەدا، لەبەرئەوەی یەکێک لە گەوران و پیاوماقووڵانی ئێمە گیانی خۆی لە ڕێگەی خوای مەزن بەخت کردووە و کوڕەکەی لە شوێنەتی و تۆش داوای ولایەت دەکەی.

هاتنی حەکەم کوڕی مەنزەر بۆ مەکران:

کاتێک حەکەم کوڕی مەنزەر گەیشت و عوبێدوڵلای کوڕی زیادیان ئاگەدار

کردەوە، عوبێدوڵڵا گریا و خەفەتبار بوو و ئەوی بە کوڕی خۆی هەژمارد و سێ سەد هەزار درهەمی پێی دا. ئەو پیاوێکی ئازا و دلێر بوو و دوای ئەم ڕێز لێگرتنە چووە مەکران و بۆ ماوەی شەش مانگ ولایەتی مەکرانی لەژێر دەسەڵاتدا بوو.

هاتنە سەر تەختی خەلیفایەتیی عەبدولمولک کوڕی مەروان:

دوای مەروان کوڕی حەکەم، نۆبەی خەلیفایەتی بە عەبدولمولک کوڕی مەروان گەیشت. ئەو "عێراق" و "سندان" و "هندان"ی دا بە حوجاج کوڕی یوسف و پاشان "حوجاج سەعید کوڕی ئەسلەم کلابی" بۆ مەکران نارد.

هاتنی سەعید کوڕی ئەسلەم کلابی بۆ مەکران:

سەعید کوڕی ئەسلەم کلابی گەیشتە مەکران و چەند ماوەیەک لە مەکران مایەوە. ڕۆژێک سەفهەوی کوڕی لام ئەلحەمامی کە لە هۆزی " ئەزەد " بوو هات بۆ لای سەعید. سەعید لێی پرسی کە دەچمە خوارێ بۆ ئەو شوێنە و یارم بە و لەگەڵم وەرە. لە وەڵامدا گوتی دەست و پێوەندم نییە. پێی گوت "لە دیوانی خیلافەت فەرمان دەگرم". لە وەڵام گوتی " بە خوا! ناتوانم لە ڕاژەی تۆدا بم و نەنگیم دێ". سەعید گرتی و کوشتی و لە پێستی دەرهێنا و سەریشی بۆ لای حوجاج نارد. پاشان لە مەکران بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و دارایی باوەڕپێکراوانی خۆی دامەزراند و بە بەکارهێنانی شێوازی نەرم و میهرەبان ماڵ و دارایی زیاتریی لە مەکران و توران بە دەست هێنا.

بەرەنگاربوونەوەی [سەعید] لەگەڵ عەلافییەکان:

ڕۆژێک کەلیب کوڕی خەلەف ئەلموغەنی و عەبدوڵڵا کوڕی عەبدوڕەحیم ئەلعەلافی و محەمەد کوڕی مەعاویە ئەلعەلافی لەگەڵ یەک ڕاوێژیان کرد و گوتیان کە سەفهەوی کوڕی لام لە ولایەتی ئێمە و دانیشتووی عومان بووە و ناوچەی ئێمە و ئەو تێکەڵاوە و سەعید کێیە خزمی ئێمە بکوژێت. لەم بەینە، سەعید بۆ وەرگرتنی باج دەهاتە مرج. بۆیە بەرەنگاری بوونەوە و دەستیان بە گفتوگۆ کرد و کار بە شەڕ گەیشت. عەلافییەکان زاڵ بوون و سەعیدیان کوشت و لە مەکران دانیشتن.

هاتنی مەجاعە کوڕی سەعەر کوڕی یەزید کوڕی حەزیفە بۆ مەکران:

داروودەستەی سەعید چوون بۆ لای حەجاج. حەجاج لێیان تووڕە بوو و پرسی "میرەکەتان لە کوێیە؟" لەبەرئەوەی کەس هیچی نەدرکاند، چەند کەسێکی لێیان سەر بڕی و ئینجا درکاندیان کە عەلافییەکان خیانەتیان لێ کردووە و کوشتوویانە.

حوجاج پاشان فەرمانی بە کەسێک لە بەنی کلاب دا و سولەیمان عەلافی بە کوشت دا و سەری نارده ماڵی خزمان و دەستوپێوەندی سەعید و دڵنەوایی دانەوە و نەوازشی خزمەکانی کرد.

حوجاج پاشان مەجاعە کوڕی سعەر کوڕی یەزیدی نارده مەکران. کاتێک مەجاعە هاتە مەکران، عەلافییەکان ڕایان کرد. مەجاعە خواستیانی و ئەوانیش چوونە لای داهر کوڕی چەچ پاشای سند. مەجاعە یەک ساڵ لە مەکران مایەوە و گیانی سپارد.

خەلیفەبوونی وەلید کوڕی عەبدولمەلیک کوڕی مەروان:

کاتێک وەلید کوڕی عەبدولمەلیک هاتە سەر تەختی خیلافەت، دەسەڵاتداریی ولایەتی مەکرانی دا بە محەمەد کوڕی هارون. هەروەها، دەسەڵاتداریی هەردوو "عیراقی"ی دایە دەست حوجاج و حوجاجیش دەسەڵاتداریی خوراسان و سیستانی دایە دەست قوتەیبە کوڕی موسلم.

هاتنی محەمەد کوڕی هارون بۆ مەکران:

حوجاج کوڕی یوسف هەڵسا محەمەد کوڕی هارونی وەکو والی لە مەکران دامەزراند و وەکو خۆی لە دەسەڵاتداریکردندا سەربەستی کرد و لە وەرگرتنی ماڵ و داراییدا پێی ڕاگەیاند کە عەلافییەکان داوا بکات و بە هەر لەونێک بێت بە دەستیان بهێنێت و لە تۆڵەی سەعید بیان کوژێت.

پاشان محەمەد کوڕی هارون کەسێکی لە عەلافییەکان پەیدا کرد و لەسەر فەرمانی خەلیفە کوشتی و سەری بۆ لای حوجاج نارد و نامەیەکیشی لەبارەی ئەوەوە لە خزمەت حوجاجدا نووسی کە یەکێک لە عەلافییەکانم سەر بڕیوە و ئەگەر تەمەن هاوڕێم بێت و بەخت لەگەڵمدا بێت ئەوا هی تریش دەگرم و دەینێرم.

محەمەد کوڕی هارون تیرەکانی کوردی بەلوچی لەناو لەشکری خۆی وەرگرتووە.

ئەم سەرۆکانەی کوردی بەلوچی تیرەکانی پێنجینە: میر ئەسەد براخۆیی، میر بەکەر زەنگەنە، میر بشر ئەدرەگانی، میر خیزان ماملی و میر مودان کرمانی هاوچەرخی محەمەد کوڕی هارون بوونە.



میر ئەحمەدی سێیەم - ناسراو بە ئەحمەدی مەزن کەمبەرانی
بەلوچ - میری بەلوچستان ١٦٦٦ز تا ١٦٩٥ز



میر مهرابی یەکەم – ئەحمەد زەیی بەلوچ – میری بەلوچستان
١٦٩٥ز تا ١٦٩٧ز



میر سەمەندەر ئەحمەد زەیی بەلوچ - نازناوی سەخی سەمەندەر - میری بەلوچستان - ١٦٩٧ز تا ١٧١٤ز



میر ئەحمەدی چوارەم ئەحمەد زەیی بەلوچ – نازناوی ئەحمەد
پارسا – میری بەلوچستان – ١٧١٤ز تا ١٧١٦ز



ئەعلا حەزرەت میر عەبدوڵڵا خان، نازناوی هەڵۆی شاخی،
میری بەلوچستان، ١٧١٦ز تا ١٧٣١ز



میر موحەبەت خان ئەحمەد زەیی بەلوچ
میری بەلوچستان - جاری یەکەم ۱۷۳۱ز تا ۱۷۳۳ز
جاری دووەمی ۱۷۳٦ز تا ۱۷٤۹ز



میر ئەلتاز خانی سێیەم - میری بەلوچستان
١٧٣٦ز تا ١٧٣٨ز



غازی میر نەسیرخان ئەحمەد زەیی بەلوچ - میری بەلوچستان
١٧٤٩ز تا ١٧٩٤ز



میر مەحموود خانی یەکەم - میری بەلوچستان
١٧٩٤ز تا ١٨١٧ز



میر مهراب خانی دووەم ئەحمەد زەیی بەلوچ (شەهید)
میری بەلوچستان ١٨١٧ز تا ١٨٣٩ز



شەڕ لە نێوان شەهید میر مهراب خانی دووەم و سەربازانی حکوومەتی بەریتانیا لە هیند ١٣ نۆڤەمبەری ١٨٣٩ز



میر شانەواز خان ئەحمەد زەیی بەلوچ - میری بەلوچستان
١٨٣٩ز تا ١٨٤١ز



ئەعلا حەزرەت میر نەسیرخانی دووەم ئەحمەد زەیی
بەلوچ – میری بەلوچستان – ١٨٤١ز تا ١٨٥٧ز



ئەعلا حەزرەت میر خودادادخان ئەحمەد زەیی بەلوچ - میری بەلوچستان
جاری یەکەم ١٨٥٧ز تا ١٨٦٣ز
جاری دووەم ١٨٦٤ز تا ١٨٩٣ز



پەیماننامە لە نێوان حکوومەتی بەریتانیا و میری بەلوچستان میر خودادادخان ئەحمەد زەیی بەلوچ – لە مەستونگ، ١٣ جولای ١٨٧٦



میر شێردل خان ئەحمەد زەیی بەلوچ – میری بەلوچستان –
١٨٦٣ز تا ١٨٦٤ز



میر مەحموود خانی دووەم ئەحمەد زەیی بەلوچ – میری ولایەتی بەلوچستان – ١٨٩٢ز تا ١٩٣١ز – کاتی تاج لە سەر نان



میر مەحموود خان لەگەڵ بەلوچەکانی هۆزی رەئیسانی



میر محەمەد ئەعزەم خان - کاتی تاج لە سەر نان لە کویتە - ١٩٣٢



ئەعلا حەزرەت میر محەمەد ئەعزەم خان - میری
ولایەتی بەلوچستان - کاتی تاج لە سەر نان لە کوێتە
ساڵی ١٩٣٢ ئەنجام درا



ئەعلا حەزرەت میر ئەحمەد یار خان - میری ولایەتی بەلوچستان. جاری یەکەم ١٩٣٣ز تا ١٩٥٨ز
جاری دووەم ١٩٦٢ز تا ١٩٧٧ز



میر داود خان ئەحمەد زەیی بەلوچ - میری ولایەتی بەلوچستان
جاری یەکەم ١٩٦٢ز تا ١٩٥٨ز
جاری دووەم ١٩٧٧ز تا ١٩٩٨ز



کاروانی حوشتری ڕەوەندەکانی بەلوچ



شوان و مێگەلە مەڕی بەلوچ



پیاوانی بەلوچ



منداڵانی بەلوچ یاری بە هێسک دەکەن



دوكانى جلى فۆلكلۆريى ژنانه



سرۆنز - سازى بەلوچ



گڵکۆی میر مستەفا خان لە بهاگ، کەچهی، بەلوچستان



قەڵای کۆنی خوزدار



تونێلی بۆلان ١٨٩٢ - ١٨٩٣ دروست کراوه



قەڵای میر چاکەرخان لە نزیک شاری سیبی بەلوچستان

کوردگال نامەک جگە لە تیشک خستنە سەر پەیدابوونی نەتەوەی کورد لە کوردستان و دروستبوونی دەوڵەتی میدیا، بە درێژی باسی بەلوچەکان دەکات کە بە ڕەسەن کوردن و بنەچەیان دەچێتەوە سەر کوردە مادەکان و پاشان چۆن چۆنی لە کوردە مادەکان دابران. هەروەها تیشکیش دەخاتە سەر ڕیشەی کوردە بەلوچەکان و لە نشینگە نوێیەکەیان باسی مێژووی سیاسی، کۆمەڵایەتی، زمان، ئاین، داوونەریت، ڕێکخستنی سەربازی، شێوازی هۆزایەتی و پیشەیان دەکات. باسی پێوەندی و هەڵوێستی کوردە بەلوچەکان لەگەڵ فەرمانڕەواکانی سەردەمە جیاجیاکانی مادەکان، هەخامەنشییەکان، یۆنانییەکان، ئەشکانییەکان، ساسانییەکان، هیندییەکان و ئیسلامییەکان دەکات.

نووسەر پەرتووکی کوردگال نامەکی لە ساڵی ١٦٥٩-١٦٦٠ی زاینیدا نووسیوە. لە سەرەتای پەرتووکەکەیدا لە باسی قوتابخانەی ئیسلامیدا ئاماژە بەوە دەکات کە، پەرتووکی کوردگال نامەکی بە یارمەتیی چەندین سەرچاوەی مێژوویی نووسیوە کە لە کتێبخانەی قوتابخانە ئیسلامییەکەی بنەماڵەکەیان لە "زەرەنج"ی پایەتەختی "زابلستان" (سیستان) پارێزرابوون.

هیوا محەمەد زەندی

## Kurdgal Namek

A valuable masterpiece and treasure of the ancient history of Kurd and Baloch 1659 AD

*Author*: Akhund Mohammad Saleh Zangana Baloch
*Translantor*: Hiwa Zandi Volume One





چاپخانەی



هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil

بایی ٥٠٠٠ دینارە